


**ناوی کتێب: قوتابخانە ئەدەبیەکان**

**بابەت: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی**

**نووسەر: رەزا سەید حسەینی**

**وەرگێڕ: حەمە کەریم عارف**

**چاپی یەکەم: ٢٠٠٦**

**زنجیرەی کتێب: ١٩٩**

**دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی**

# پێڕست



عارف
حەمە کەریم

# وتەیەك

ئەگەر سەرنجی کتێبخانەی نیشتمانی هەر میللەتو نەتەوەیەك بدەین، دەبینین بەرهەمی وەرگێردراو ڕێژەیەکی باڵای ئەو کتێبخانەیەی پێك هێناوە، ڕێژەیەکی ئەوتۆ ڕەنگە زۆربەی کات لە نیوە بەسەرەوە بێ. بۆیە گەر کتێبخانەیەك بەرهەمی وەرگێڕدراو دەوڵەمەندی نەکردبێ ئەوا لە زۆر رووەوە هەژارو کەم ڕەونەقو بێ نموود دەنوێنێ. ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ گەلەك هۆی رامیاریو ڕۆشنبیریو هۆشیاریو بەتەنگەوە هاتنو نەهاتنو خەمساردی ڕۆڵەکانی میللەتی خودان کتێبخانەی هەژار...

کتێبخانەی کوردی، یەکیکە لە کتێبخانە هەژارەکانو بەو حاڵەشەوە دەبینی ئاستی هۆشیاری خەڵکی کورد تاکو نهوژی هێندە نزمە کە کاری وەرگێران بە کارێکی کەمو سووك تەمەشا دەکەن.. ڕەنگە زۆر کەس –هەڵبەتە لە رووی نەفامییەوە– نامیلکەیەکی ناشیعری کاڵو کرچی پێ پەسندتربێ لە وەرگێڕانی شاکارێکی ئەدەبی جیهانی! دیارە بەرنامەداری بۆ وەرگێڕان، کارێکی گەلەك پێویستەو دەبێ لەو بەرهەمە فیکریو فەلسەفیو کارە ئەدەبیو هونەریو زانستیانەوە دەست پێبکرێ کە لەگەڵ ئەو بارە واقیعیو کۆمەڵایەتیو مێژوویەدا بگونجێت کەمیللەت پێیدا ڕەت دەبێو خێرایی بە ڕەوتی گەشەسەندنو بەرەو کامڵ چوونو پێگەیشتنی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیو مێژوویییە ببەخشێت.. لێ ئێمەی کورد چونکە خودان مێژوویەکی نیمچە وێستاوو پچڕپچڕین، بۆیە بیرو بیرکردنەوەشمان پچڕپچڕە، نەفەسمان کورتەو پشوو درێژی ئەو میللەتانەمان نییە کە ڕەوتو کاروانی مێژوویان لە پچڕانو دابڕان بەدوور بووەو بە شێوەیەکی سروشتیو ئاسایی قۆناغە کۆمەڵایەتیو مێژووییەکانیان بڕیوە... هەڵبەتە پچڕپچڕی بیرکردنەوەی ئێمەی کورد، کە زادەی واقیعی کۆمەڵایەتیو پچڕپچڕی میللەتەکەمانە، سێبەری بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانمانەوە دیارە. یەکێك لەو بوارانە مەیدانی وەرگێڕانە کە نەمان توانیوە بەپێی نیمچە بەرنامەیەکی تۆزێ ڕێكوپێك ئەزموونی ڕۆشنبیریو فیکریو ژیانی تۆمارکراوی میللەتان بۆ زمانەکەی خۆمان نەقڵ بکەین، تا لەلایەکەوە زمانەکەمان دەوڵەمەند بکەینو سەدان زاراوەو وشەی هاوچەرخ بڕژێتەناو زمانەکەمانەوە،و لەلایەکی دیکەوە بیروبیرکردنەوەی خۆمان بە ئەزموونی پێشکەوتووانەی میللەتانی دی موتوربە بکەین هەر ئەم نەفەس کورتییەو ئەم هزرینە خراوە وای لێکردوین بە زۆری پەلاماری شیعرۆکەیەك، یا کورتە چیرۆکێك یا وتارۆکەیەك یان نووسینێکی سەرڤەسەرڤەی نەرمە قووت بدەینو خێراو بەکاڵو کرچی تەرجەمەی بکەینو لەم بڵاڤۆكو لەو ڕۆژنامەو غەزەتەدا بیانکەین بە ئاردی نێو دڕکانو چ کاریگەرییەکی ڕۆشنبیریو ئەدەبیو هونەری بەجێ نەهێڵن. هەڵبەتە ئەم جۆرە بێ سەروبەرییە

خزمـەتێکی ئـەوتۆ بـە کتێبخانـەی کـوردی ناکـات، چـونکە چ کرانەوەیـەك بەسـەر ئـەدەبیاتو رۆشـنبیریی میللەتانـدا، بـۆ ئـەدەبی کـوردی دەسـتەبەر ناکـاتو چ هەناسـەیەکی تـازەی بەبـەردا ناکاتو نابێتە هۆی تەقاندنەوەی سەرچاوەکانی داهێنان.

مـەخابن ئێمـە لەبـەر تەمـەڵیو بـێ سـەلیقەیی خۆمـان تـا رۆژگـاری ئـەمڕۆ شـاکارە رۆشـنبیریو هونـەریو فیکـریو فەلسـەفییە جیهانییـەکانمان بـە جـەماوەری خوێنـەری کـورد نەناسـاندووەو نـەمانتوانیوە بـە ئەمانـەتو وەفادارییـەوە وەریـانبگێرینو بیانخەینـە بەردەسـت خوازیـارانی رۆشـنبیری.. جـا مـادامێکی وەرگێـڕان هۆیەکـە بـۆ نزیـك خسـتنەوەی گـەلان لـە یەکـدی و ئاشـنا بوونی گەلان بە باری سەرنجو بۆچوونی یەکدی لەمەڕ ژیانو ژیارو...

ئەمـە خـۆی لەخۆیـدا جـۆرە کـارلێکێکی رۆشـنبیریو شارسـتانی چێدەکاتو... بۆیـە پێویسـتە پرۆسەی وەرگێڕان کە بریتییە لە گوێزانەوەی شیلەی ئەزموونی گەلان بۆ یـەکتر، لـە چوارچێوەی جۆرە بەرنامەیەکی رێکوپێکدا ئەنجام بـدرێ: روو لـە وەرگێڕانـی ئـەو کتێبو شاکارانە بکـرێ کـە بایـەخی رۆشـنبیری پێشـڕەوانەیان هەیـەو دەبنـە بەشـدارییەك لـەکاروانی پێشـڤەبردنی ژیـارو شارسـتانیەتی مرۆڤایـەتی، وازهێنـان لـە وەرگێڕانـی پەڕاگەنـدەو بەرهـەمی کـەم بایـەخو نیمچـە مـردوو، رەچـاوکردنی پسـپۆڕی و حـەز لـە وەرگێڕانـدا، رێزگـرتنی کـاری سـەرکەوتووی هـەر وەرگێڕێـك، رێککـەوتن لەسـەر زاراوە هەمـە پەسـندو زانسـتیو چەسـپاوەکان. دەزگـا رەسمییـە رۆشنبیرییەکان وەرگێڕە بە تواناکان بەسەر بکەنەوە. دەستیان بگرنو هانیـان بـدەن کـە شـاکاری هونـەریو رۆشنبیریو زانسـتی بـە زمـانی پـاراوو رەوان وەربگێـڕن، چـونکە بـەم کـارە هـەم توانـاو بەهرەی خوێنەرو نووسەر دەخـەمڵێنیو هـەم بـەهرەو سـەلیقەی بـەراوردو جیاکردنـەوەی بەرهـەمی رەسـەن لـە بەرهـەمی نـا ڕەسـەنو بـازاڕی دەرِسـکێ. ئەمـەش لـە دوا ئەنجامـدا خزمـەتێکی فـرە بـە نووسینی خۆماڵیش دەکات. چونکە ئەو کاتـە نووسـەر ناچـارە حورمـەتی خـۆی بگـرێو نـاوێرێ بەرهەمی کاڵو کرچ رەنگماڵ بکاتو بە نرخی شاکاری هونەریو رەسەن بە خوێنەری بفرۆشێت.

گوتمـان مێـژووی ئێمـەی کـورد، مێژوویـەکی نیمچـە وەسـتاوو پچڕپچـڕ بـووەو هەڵبەتـە بـیرو بیرکردنەوەشمان زادەو رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ئەو واقیعەیـە بۆیـە لـە زۆربـەی وارەکـانی ژیانـدا تا رۆژی ئەمڕۆ بێ بەرنامەینو بە نەفەسی کورتەوە مامەڵە لە تەك واقیعی خۆماندا دەکەین.

هەڵبەتە مەیدانی وەرگێڕان یەکێکە لەو مەیدانانەی کە پاشا گەردانی پێوە دیارەو دوور لە هـەموو نەخشەو بەرنامەیەكو پلانێك بـەپێ خاوسـی بـەناو کـەوتووینو تەنانـەت وەرگێـڕ لەگـەڵ خۆشـیدا بەرنامەی نییە. هەر جارە روو لە دنیای بابەتێك دەکـات، دیـارە یـەکێك لـە فاکتـەرەکانی ئـەم حاڵـە ئەو کەلێنو بۆشاییە گەورەیـە یـە کـە لـە کتێبخانـەی کوردیـدا هـەس... یـا دەیاردەیـەکی سـەقەتی دیکە ئەوەیە پێمان وایە ئەم دنیایە هەر شیعرو چیرۆکە! بێ چەندو چوون پڕی دەدەێنیو هەر کە چەند شیعرۆکەو کورتە چیرۆكو هەندێ وتارۆکەمان بە سەقەتی وەرگێڕاو بە بەرتیلو خاترانە لێـرەو لـەوێ بڵاومـان کـردەوە، ئیـدی خۆمـان لێـدەبێ بـە ئەرەسـتۆو مامۆسـتاو دەفتـەری کـەس ناخوێنینـەوە. هەڵبەتـە لـە ئـەنجامی ئـەم پاشـاگەردانییەو لـە ئاکـامی بـێ توانـایی گەلـەك لـە وەرگێڕەکانمـانو لـە ئـەنجامی نـەزانینی تـەواوی هـەردوو زمـانی لـێ وەرگێـڕدراو و بـۆ

وەرگێڕدراوەوە دووچاری بەد وەرگێڕان بووین و ئەم دیاردەی بەد وەرگێڕانەش روو لە زیادییەو خەریکە هەڕەشەی شیواندن و سەقەتکردنی زمانەکەمان لێدەکات...
ئەوەتا لافاوی رستەو دەستەواژەو رستەسازی هەڵەو بێ بنچو بناوانی زانستی و دوور لە تەبیعەتی زمانی کوردی و سەرباری ئەمەش نا مەفهووم وا خەریکە زمانی کوردی بەرەو هەڵدێری وێرانکردن دەبات. ئەم دیاردەی بەدوەرگێڕان و زمان شێوانە زۆر بە زەقی لە کتێبە دەرسییەکانی قوتابخانەکاندا، بەتایبەتی لە بابەتی زانستە ئینسانییەکاندا بەدی دەکرێ و پێدەچێت هەر کاریگەری ئەمەش بێ کە کەم و زۆر لە رۆژنامەو گۆڤارو بلاڤۆکە کوردییەکاندا رەنگی داوەتەوە. دەزگاکانی دیکەی راگەیاندن ئەوە هەر باسیان مەکە! دیارە گەر کار وابڕوات ئەوا چەند ساڵێکی دی کوردینووس و کوردیزان دەچنە قاتی و مەگەر بە چراوە بۆیان بگەرێی.
هەڵبەتە خەتەری مەزنی شێوانی زمان لە وەرگرتنی وشەی بێگانەدا نییە، بەڵکو لەوەرگرتنی ئەو داڕشتن و رستە بەندییە ناکوردیانەدایە کە هەندێ وەرگێڕ لەبەر نابەڵەدی و تەمەڵی خۆی، خێرا وەریدەگرێ و دیارە ئەم زمانە سەقەتەی بەرە بەرە دەبێ بە زمانی باوو وەرگێڕانی پچڕپچڕو بێ سەروبەر کار دەکاتە سەر زمانی نەوە تازەکان و پاشان کار دەکاتە سەر زمانی نووسین و ئەدەبیاتی تازەو ئیدی نەوەکانی دی کە چاویان بە بەرهەمی تەرجەمەکراوی پڕ هەڵەو بێسەروبەر دەکەوێ، وا هەست دەکەن کەئالۆزی و پچڕپچڕی بابەتەکە، بۆ خۆی جۆرە شێوازێکی نوێیە، نازانێ کاکی وەرگێڕ بە پەندی دنیاو قیامەتی کردووەو بە جۆرێکی وەرگێڕاوە مەگەر هەر خۆی سەری لێدەربکات.
ئیدی خوێنەریش چونکە پشتیوانەیەکی رۆشنبیری ئەوتۆی نییە، بۆیە بەلەز وەك ئەوەی هەنگوین لە دارا بدۆزنەوە دەکەنە لاسایی کردنەوەی. بۆیە سەیر دەکەی کۆمەڵێکی زۆری خوێندەواران، کە تاقە پەیوەندییان لەگەڵ رۆشنبیری جیهانیدا، لە رێگەی ئەو وەرگێڕانە سەقەت و شێواوانەوەیە... بێ ئەوەی تاقە یەك زمانی زندووی جیهانی یان ناوچەیی بزانن بەناوی نوێنەرو ردێن سپی رۆشنبیرییەوە خۆ لە قەرەی مالیجەو چارەسەری گەورەترین و گەرمترین کێشەی رۆژی ئەم دنیایە دەدەن، بێ ئەوەی پشت بە تاقە یەك سەرچاوەو ژێدەرو دەهمەنی دەرەجەیەك ببەستێ، دێن سەرچاوە دەرەجە چوارو پێنجە لەبنەڕەتدا شێواوەکان کاوێژ دەکەنەوەو دەیتفێننەوەو خەڵکەکە بێ چ قێزکردنەوەیەك هەڵی دەگرنەوەو تا رادەیەکی زۆریش پێی قاییلن و بانگەشەی هزرڤانی و پیتۆڵیش بۆ ئەو جۆرە کەسانە دەکەن و ئیدی لە چەندین لاوە مونتیکارلۆی بانگەشەیان بۆ وەگەڕ دەخرێ.
گەر هەندێ ورد سەرنجی دنیای ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان بدەین گەلەك نموونەو دەقی ئەدەبی زادەو لە دایکبووی ئەم حاڵەتە بەدی دەکەین، راستە زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەو پێ بەپێی پەرەسەندنی قۆناغە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان گۆڕانی بەسەردا دێ و پەرەدەسەنێ و قاڵبە کۆنەکان دەشکێنێ و قۆناغ بە قۆناغ کاژە کۆنەکان فڕێ دەداو کاژی تازە دێنێتەوە، لێ بەو مانایە نییە کە بنەما سەرەکییەکان نەمێنن و هەڵوەشێنەوە.

هەڵبەتە دەبێ ئەوە بگووترێ کە ئێمە کەوتووینەتە سەردەمێکی فرە خێراو خۆشبەزەوەو تەکنۆلۆژیا میللەتانی تەواو لێکدی نزیك کردۆتەوە... گەر هەر بەم خەمساردییەوە بمێنینەوەو بە تەمابین بە پشتیوانی نامیلکەی شیعریو کۆمەڵە چیرۆکی پەرپوتو بێ رەونەقو کەم نموودەوە ببین بە خودانی کتێبخانەی دەوڵەمەند ئەوا کاتێ بە خۆ دەزانین لە هەموو جەژنان بووینو دەستمان لە بنی هەنبانەوە دەرچوو، بۆیە بەبێ وەرگێڕانی بەرنامەدارو بەردەوام نابین بە خودانی کتێبخانەی دەوڵەمەند.

جا خانەڤانی هەژی، ئەم کتێبەی ها لە بەردەستتدا، کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە لە برای ئازیزم سەرۆ قادرم وەرگرت. کە خوێندمەوە، خۆزیام خواست کە کوردیش چەند کتێبێکی وای هەبا، بەڵام بە خۆتان دەزانن کە ئەهلی قەڵەمی کورد –ئەگەر بەندە بەئەهلی قەڵەم حەساو بکرێمو ئەمەم بە جۆرە رووداریییەك بۆ لێك نەدرێتەوە– زۆربەیان کوشتەی دەستی ژیانو هەندێکیان تەمەڵن –بۆیە خۆزیا رۆشنبیرییەکانیان زۆربەی شین نابێ‌و هیچی لێ ناڕوێ. بە هەر حاڵ بەندە بەدەم مەشغەڵەتی ژیانەوە، ناوە ناوە هەندێ وەختم دەدزییەوەو بە کۆڵێك مەمنوویەوە لە مامۆستای بەڕێز "سەید رەزا حسەینی" کە ریگەی دووری دانانو سەرچاوەگەڕانی بۆ کورت کردبوومەوە، چەند لاپەڕەیەکم لە کتێبە بەنرخەکەی وەردەگێڕا.. بە هەر حاڵ من نامەوێ باسی نێوەڕۆكو دەوڵەمەندی کتێبەکە بکەم یان باسی زەرورەتی تەرجەمەکردنەکەی بکەم. ئەم دەقەی بەندە تەرجەمەم کردگە چاپی نۆیەمی ساڵی ١٣٦٦– ١٩٨٧)ـە کە ئەمە خۆی لەخۆیدا شادییەکی بێ چەندو چوونە لەسەر گرینگیو کاریگەریی کتێبەکە.

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە لە کۆتایی هەر قوتابخانەیەکی ئەدەبی ناو ئەم کتێبەدا هەندێ نموونە هێنراوەتەوە.. لێ لەبەر ئەوەی نموونەکان یان نیوەچڵن یان کورتکراوەن یان بەشێکی بچووکن لە دەقێکی گەورە.. ئەو جاش نووسەری بەڕێز زۆربەی نموونەکانی لە چەند وەرگێڕێکی ترەوە وەرگرتووە، بەندە ئەو نموونانەم وەلاوە ناوە بە ئومێدی ئەوەی خوێنەر لەسەرچاوەی دیکەدا دەقی تەواوەتی ئەو نموونانە پەیدا بکات.

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم کتێبە کە کورتە مێژوویەکی چڕو دەوڵەمەندی هەموو قوتابخانەو گۆڕانکارییە ئەدەبیو هونەرییەکانی ئەوروپای ئەم چوارسەد ساڵەی دوایی لە خۆگرتووە، بشێت ببێ بە رێنوێنێکی باشو یارمەتی خوێنەر، بە تایبەتی وەچەی نوێ بدات لە هەڵبژاردنی کتێبی دڵخوازی خۆیدا...

بە هەر حاڵ ئەمە ئەو کارەیە کە لە دەستم هاتووەو تا رادەیەك تینوێتی خۆزیاکەمم پێ شکاندووە... ئیدی نازانم سەرکەوتووم یان بەسەر سەردا کەوتووم....

رێ بەڕاستو بەد بە خوا......

**حەمە کەریم عارف**

**تێبینی:**

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی:

**پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم ٢٠٠٤**
**وەزارەتی رۆشنبیری/ هەولێر، ل ٢٥٠- ٢٥٣**

# چەند پەیڤێك لەمەڕ سەدەکانی ناڤین و رینیسانس و سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی نەتەوەیی لە ئەوروپا

**وەکو ئاشکرایە قوتابخانە ئەدەبییەکان بەقوتابخانەی کلاسیك دەست پێ دەکەن و باوترین پێناسەی ئەم قوتابخانەیەش بریتییە لە (گەڕانەوە بۆ هونەری کۆنی یۆنان و رۆم بەپێی راپەڕینی هومانیزم "مرۆڤدۆستی"و رینسانس).**

**لێ لەبەراییدا وا چاکە کە بزانین هۆی ئەم بێ خەبەری رۆژاواییانە لە ئەدەبیات و هونەری باوباپیرانیان بەدرێژایی سەدان ساڵ چ بووەو دووبارە کەشف کردنەوەی ئەو ئەدەبیات و هونەرە چۆن روویداوە. هەروەها مامەڵەو بەرخوردی سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ کەلتورو فەلسەفەی یۆنانی کۆندا چۆن بووەو لە سەردەمی رینیسانس و لەگەڵ پەیدابوونی هومانیزمدا چ گۆڕانێك لەم مامەڵەو بەرخوردەدا روویداوە. هەڵبەتە ساغ کردنەوەو چوونە ناو ئەم هەموو مەسەلانە، بۆ خۆی کتێبێکی ئەستووری گەرەکە، لەبەر ئەمە، ئێمە لێرەدا تەنیا ئاماژە بۆ هەندێ مەسەلەو رووداوان دەکەین کە بۆ رەواندنەوەی ئاڵۆزی لە تێگەیشتنی سەردەمی کلاسیك پێویستە.**

**وەکو دەزانین سەدەکانی ناوەڕاست بە سەردەمی نێوان سەدەکانی کۆن (سەردەمی شارستانیەتی یۆنان و رۆم)و سەردەمی تازە دەگوترێ کە سەرەتاکەی بریتییە لە روخانی ئیمپراتۆری رۆم (رۆمی رۆژئاوایی) بەدەست بەربەرەکان و کۆتاییەکەی بریتییە لە روخانی قەستەنتەنییە (و نەمانی ئیمپراتۆری رۆمی رۆژهەڵاتی) بەدەستی تورکەکان.**

**ئیمپراتۆری رۆمی رۆژئاوایی کاتێ لەسەدەی چوارەمی زایینی دا گەورەترین فەلسەفەو نووسەرانی مەسیحی خۆی پەیدا کردبوو- کە بەرهەمەکانیان کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر نەوەکانی ئایندە هەبوو و تەنانەت لە رۆژگارو سەردەمی ئێمەشدا دەخوێنرێنەوەو مایەی سوودوەرگرتنی توێژەرانە- لە حاڵی نەماندا بوو: (جروم قەدیس) (هیرونوموس) دەساڵ پاش تاڵانکردنی رۆم بە دەستی (ئالاریك)ی فەرماندەی گۆتەکان مردوو (ئوگوستین قەدیس) رۆژی ٤٣٠/٨/٢٤ لە شاری هیپون کە سێ مانگ بوو لە گەمارۆدا بوو- لە حاڵێکا کە رۆژانە بەسەعاتان بۆ کوژراوان و بریندااران و راکردووان و یەخسیران و هەروەها وێران بوونی ماڵان و شارانی تاڵانکراو فرمێسکی دەڕشت- لەنێو کۆڕی موریدانیدا گیانی سپارد.**

**زاڵ بوونی گەلانی جەرمانی بەسەر مەملەکەتانی رۆژئاواییدا کە بەشێك بوون لە ئیمپراتووری رۆم، بەجارێ مەدەنییەتی شارنشینی و بازرگانی و کەلتوری رۆمی نابوود کرد. ئیدی هەموو رێگەکان نەدەچوونەوە رۆما، ژیانی گوندەکی لە شانشینە بچوکەکاندا، جێگەی ئیمپراتۆری**

مەزنی رۆمی گرتبووەوە.
پێویستە لە پێشەوە ئەوە بگوترێ کە ئیمپراتۆری رۆمی رۆژاوایی، تەنانەت پێش روخانیش، پەیوەندی خۆی بە کەلتورو ئەدەبیاتی یۆنانەوە بڕی بوو و میراتگری کەلتوری یۆنانی، و تەنانەت مەڵبەندی قودرەت و دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەکە، رۆمی رۆژهەڵاتی بوو، لە رۆژئاوادا، بەهۆی ئەوەی کە زمانی لاتینی لە جێی زمانی یۆنانی بوو بەزمانی رەسمی، تەنانەت لە سەدەکانی چوارەم و پێنجەمدا، پشت گوێ خستنی زمان و کەلتوری یۆنانی-ش زیادی کردبوو، ئەم دیاردەیە بەرادەیەك بوو کە فەیلەسووفێکی گەورەی وەکو ئوگوستین قەدیس، لە رێگەی تەرجەمەی بەرهەمێن فلوتین بۆ سەر زمانی لاتینی ئاشنایەتی دەگەڵ ئەفلاتون دا پەیدا کردبوو، چونکە زمانی یۆنانی نەدەزانی و بە ئاشکرا دەیگوت کە حەز لە زمان و ئەدەبیاتی یۆنانی ناکات، ئەم جۆرە سەلیقەیە لە سەدەی پێنجەمدا تەواو باوی سەندبوو، خوێندکارانی گەنجی رۆمی پاش تەواوکردنی خوێندنیان بەدەگمەن رویان دەکردە یۆنان و زیاتر رێگەی (مارسی)و (ئارل)یان دەگرتە بەر.
لێ نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە یەکێتیی شارستانییەتی (یۆنان و رۆم) بەو حاڵەشەوە نزیکەی دە سەدە لە رۆژهەڵاتی نزیك و لە حکومەتی رۆمی رۆژهەڵاتیدا مایەوە. هەرچەندە کە بیزانس نەیتوانی بەشێوەیەکی بنجبڕ بە سەر رۆژاوای دا بسەپێنێ، لێ دەسەڵاتە کەلتوری و هونەرییەکەی تا رۆژگارێکی دوورو درێژ، زۆر لە مەرزی جوگرافیایی خۆی هێوەتر رۆیی. تەنانەت دەشێت بگوترێ کە ماوەی پێنج سەدە- لەساڵی ٥٠٠وە تا ١٠٠٠- باڵا دەستی کەلتوری بیزانس شتێکی بەڵگەنەویست بوو، بەڵام وێڕای ئەم گەورەیی و شکۆداریەش، بیزانس نەیتوانی ئەو میراتەی کە بەو سپێردرابوو، تازەترو دەوڵەمەندتر بکات وێڕای ناسکی و زەوق و سەلیقەی لە رادە بەدەریشی هەمیشە لە دنیایەکی دەکرد کە لە حاڵی کۆتایی هاتندا بێ، لەگەڵ هەموو ئەمەشدا تەلارکاری و پەیکەرسازی و شێوەکاری کارولنژینەکان و رۆمانەکان بەتەواوەتی لە ژێر کاریگەری هونەری بیزانس دایە. لەبواری ئەدەبیاتدا وەکو ئاماژەی پێکرا، جیاوازی زمان گەورەترین لەمپەرو بەرهەڵست بوو کە پەیوەندی نێوان رۆژهەڵاتی یۆنانی زمان و رۆژئاوای لاتینیی زمانی دابڕی. سەرەنجام روخانی ئیمپراتۆری رۆژاواو داگیرکردنی قەڵەمڕەوی بەرینی ئیمپراتۆری لەلایەن نەتەوەێن جۆراو جۆرەوە هێندەی دی ئەم دابڕانەی قوڵکردەوە.
تاقە یەکێتییەك کە مابووەوە، یەکێتیی زمان و ئەدەبیات بوو کە ئەویش زۆر بەتوندی لەبەر هەڕەشەدابوو، لێ دوو فاکتەری گرینگ بوونە هۆی ئەوەی کە بەر لەم نابودییە بگرێت و سەدەکانی ناڤین لە ئەوروپادا ئەدەبیاتی تایبەت بەخۆی بەرهەم بێنێ و پەیدا بکات، ئەم دوو فاکتەرە بریتیی بوون لە:
١- دەوری کڵێسا.
٢- سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی نەتەوەیی.

## دەوری کڵێسا :

فاکتەری مەزەبی و ڕۆڵی کڵێسا، دووبارە ئەم سەرزەمینە بەگوند بووانەی بوژانەوەو روحانیانی مەسیحی بەکردەوە جڵەوی حکومەتەکان و خەڵکانیان گرتە دەست.
فەرمانڕەوایانی داگیرکەر بەرەبەرە ئاینی مەسیحیان قەبوڵ کردو کڵێساکان بوون بە بنکەو مەڵبەندی فێرکردن و پەروەردەو نووسینەوەو لەبەرکردنی کتێبان.
ئەگەر زانیاری ناتەواوی هەندێ فەرهەنگ نووسان و گوتیاران وەلاوە بنەین، ئەوا دەتوانرێ بگوترێ کە یەکەم تەماس دەگەڵ کەلتورو ئەدەب و فەلسەفەی یۆنانی کۆندا لەم سەردەمەدا دەستی پێکردو بۆنی بەرهەمی ئەوەش لە زندانی یەکێك لە فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمە دزەی کردۆتە دەرێ.
(بویپیوس) کە (دوا رۆمی) پێ دەڵێن، کتێبی (تەلاری فەلسەڤ) لە زینداندا نووسی کە نامەیەك بوو بەپەخشانی ئاوێتە بەشیعر.
بویپیوس کە راوێژکاری (تیودوریك) پاشای گۆتەکان بوو، بەوە تاوانبارکرا کە گوایە بەشداری پیلانێکی کردووە دژی پاشا، و پاشاش حوکمی ئیعدامی دەرکردبوو، لەو ماوەیەدا کە لەزیندان دا بوو، نامەیەکی لە قاڵبی گفتوگۆ دەگەڵ دڵڕفێنترین خۆشەویستی ژیاندا، یانی دەگەڵ فەلسەفەدا نووسی، کە لە شیعر چاتر تەسەلای رۆژە رەشەکانی دەدایەوە، چونکە (هاوئاهەنگی) جاویدانەی (ئەندێشەی ئیلاهی) لە بەرهەمێن هزرڤانانی گەورەدا فێری ئەو دەکات، ئەم کتێبە کە بەزمانێکی رەوان نووسراوە پوختەیەکە لە ئەندێشەێن کۆنی نۆئەفلاتونی، نوئەرستۆیی و نۆڕەواقی. ئەوەی مایەی سەرنجە لەم کتێبەدا باسی سوقرات و (سنکا)و کەسانی دی کراوە، بەڵام هیچ ئاماژەیەك بۆ ئینجیل نەکراوە.
بویپیوس ئیمانی بەخوا هەیەو ئەم باوەڕەی خۆی بەزمانێکی شاعیرانە دەردەبڕێت، بەڵام خوای ئەو زیاتر خوای فەیلەسوفەکانە تا خوای مەسیحیەت، کتێبەکە مێژووی ٥٢٣-٥٢٤ لەسەرەو لە حاڵێکا زۆر بە ئاسانی دەتوانرا پێنج سەدە بەر لەوە بنووسرابووایە. ئەم بەرهەمە پوختەیە کە لە بەها فەلسەڤ و ئەخلاقییەکانی سەردەمی بت پەرستی کە دەتوانرا راستەوخۆ لە فیکری مەسیحیدا سوودی لێوەربگیرێت و هەر واشی لێهات، (ئانسەلم قەدیس) (سەدەی یازدەیەم)، (ئابلارد) (سەدەی دوازدەیەم)و (توماس ئاکویناس) (سەدەی سێزدەیەم) لە تەعامولی فەلسەڤ گەورەی خۆیاندا سوودیان لێوەرگرت.
تەماسێکی دیکە لەگەڵ بیری یۆنانیدا لەسەدەی دوازدەیەم و سیزدەیەمدا (کە بەسەدەکانی ناڤینی باڵا ناسراوە)و لەرێگەی تەرەجمەێن عەرەبی هزرڤانان و زانایانی ئیسلامیەوە روویدا کە لە رێگەی ئەسپانیاوە گەیینە ئیتالیا و فەرەنساو تەرجەمەی زمانی لاتینی کران.

هەندێك بەر لە ساڵی ١٢٠٠ بوو، کە هەر دوو بەرهەمی (فیزیك)و (میتافیزیك)ی ئەرستۆ لەبەر دەست نووسێن عەرەبی زانایانی ئیسلامییەوە کە لە ئەسپانیاوە هاتبوون، تەرجەمەی لاتینی کران، ئاشنابوون بەم دوو بەرهەمە رووداویکی هێندە گرینگ بوو کە ناوەندی قوتابخانەیی مەسیحی ناچارکرد کە سەر لەنویٚ بە پێکهاتەی ئیلاهیاتی کاسولیك و میتافیزیکی یۆنانیدا بچنەوە.

بەبایەخترین ئەنجامی ئەم پێداچوونەوەیە کتێبی (ئیندێکسی ئیلاهیات)ەکەی (توماس ئاکویناس قەدیس) بوو کەشتێکی بە هزری سەدەکانی ناڤین بەخشی کە چەندین سەدە لەوەپێش چاوەڕوانی بوو: یەك سیستەم، کە بایەخێکی زندووی ئەوتۆی هەبیٚ هەم ئیلاهی بیٚ و هەم فەلسەڤی.

تومیزم یان فەلسەفەی توماس قەدیس کە لە راستیدا فەلسەفەی ئەرستۆییە لە هەیکەلی زانستێن قوتابخانەیی مەسیحی، ئەگەرچی چەندین جار لەلایەن پاپاوە رەت کرایەوە، لە ئەنجامدا بوو بە فەلسەفەی رەسمی کلیسای مەسیحی و پاش ئەوەی لەسەردەمی کلاسیك دا هەندیٚ لە تەنەزولی دا، بەڵام لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دووبارە لەدایك بووەوەو بووژایەوە.

## ئەدەبیاتی لاتینی لە سەدەکانی ناڤیندا

هەرچەندە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆری رۆم پارچە پارچە بوو، بەڵام یەکێتییەکی گرینگ مابووەوە، ئەویش یەکێتی زمان و ئەدەبیاتی لاتینی بوو کە لە لایەکەوە لە سایەی کڵێسادا و لەلایەکی دیکەوە لەسایەی بایەخدانی هەموو پاشایانی گەورەو بچووکەوە بەشکۆو مەزناتی رابردووی ئیمپراتۆری بەردەوام بوو، چونکە هەر یەکێکیان ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە ببێتە میراتگری ئیمپراتۆرییەتەکەو جێگەی ئیمپراتۆرانی رۆم بگرێتەوە.

دەربارەی ڤاندالەکانی ئەفریقا، دەربارەکانی ویزیگوت لە تولوزو تولدو، دەرباری پاشایانی بورگونی و دەربارێن پاشایانی بچووکی ئانگلوساکسون، بەتایبەتی دەرباری ئوستروگوتانی راون، هەروەها دەربارێن لمباردی و پاڤیا، و سەرەنجام دەرباری فرانکەکان، جگە لەوەی کە بۆ رێکخستنی یاساو نووسینێن رەسمی خۆیان سودیان لە مافناسانی رۆمی وەردەگرت، لەهەمان کاتدا دەیانویست وەکو ئیمپراتۆرانی گەورە پارێزەرو رەواجدەری ئەدەبیاتش بن، گوتاربێژان و شاعیرانی لاتین و تەنانەت ئەڵمانیش ستایشنامەیان بەزمانی لاتینی دەهونییەوەو پێشکەشی شاهنشاکانیان دەکرد.

بەتایبەتی (شارلمانی) لە سەدەی هەشتەمدا بایەخێکی زۆری بە ئەدەبیاتی لاتینی دەدا، وێڕای ئەوەی کە بەخۆی خوێندن و نووسین بەڵەد نەبوو، بەڵام رۆژی چەند سەعاتێکی بۆ ژنەوتنی ئەو بەرهەمە ئەدەبی و فەلسەفیانە تەرخان دەکرد کە بۆیان دەخوێندەوە، بەتایبەتی دڵبەندی (شاری خودا)ی قەدیس ئوگوستین بوو، لەدەرباری کوڕونەوەشیدا، ئەدەبیاتی لاتین شان و شەوکەت و پایەی خۆی هەبوو.

تا له كۆتاييەكانی سەدەكانی ناڤین نزیكتر دەبینەوە، له كۆشكێن فیودالەكاندا، كه رۆژ بەرۆژ زیاتر له دەسەلاتی مەركەزی دوور دەكەونەوە، هەست بەوە دەكرێت كه بایەخێكی پتر بە بزوتنەوە ئەدەبییەكان دەدرێت، ئەم فیودالانە بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ لەساو پەنای دەرباری پاپاو دێرەكاندان كه جگه له ئەدەبیاتی ئاینی، ئەدەبیاتی غەیرە ئایینیش بەرێوە دەبەن. له پالْ دنیایەك سروودو ژیانی قەدیساندا، زنجیرەیەك بەرهەمێن غەیرە ئایینی وەكو مێژوونووسین و داستان و شیعری لیریكی و فێركاریش بەرهەم دێن.

## گەشەكردنی ئەدەبیاتی نەتەوەیی:

لەسەدەی یازدەیەم بەدواوە لەولاتانی جیاوازدا، لەپالْ ئەدەبیاتی لاتینییەوە، ئەدەبیاتی نەتەوەییش دێتە ئاراوەو لەسەدەی یازدەیەمەوە تاسەدەی سێزدەیەم بەلەز پێشدەكەوێت، ئەم نەتەوەو میللەتانە بەزمانی خۆمالّی و زكماكی خۆیان دەست به نووسین دەكەن.
یەكەمین میللەتانیْ كه شارەزاییەكی ئەوتۆیان دەربارەی زمانی لاتینی نییەو تەنیا ژمارەیەكی كەمی رۆشنبیرانیان نەبیْ كه زیاتر روحانییەكانیانن لاتینی دەزانن، یانی ئەنگلوساكسونییەكان، سەلتەكان، ئیرلەندییەكان و پاشان ولاتانی باكورین، ئەوجا نۆرە دێتە سەر جەرمەنەكان كه هاتوونەتە ناو قەلّەمرەوی ئیمپراتۆریەتی رۆم كه له دانیمارك و هۆلّەنداو بەلجیكاو ولاتانی دیكه بەرەبەرە رەگ و ریشەی ئەم زمانە كۆنە هەلّدەكەنن. پاشان نۆرەی میللەتانی ئاكنجی فەرەنسا و نیمچە دورگەی ئیبری دێت، دوای هەموویان نۆرە دێتە سەر ئەو ولاتانەی كه زمانی عامیانەی خەلّكەكەی خزمایەتی و نزیكی لەگەلْ زمانی لاتینیدا هەیە، وەكو ئیتالیا كه مێژووی ئەدەبیاتی لەسەدەی سیازدەیەمەوە دەست پیْ دەكات. لیْ میللەتانی ئاكنجی رۆمانی و دەوروبەری له سەدەی شازدەیەمدا لەژێر دەسەلاتی زمانی لاتین ئازاد دەبن، و دەبن به خودانی ئەدەبیاتی تایبەت به خۆیان، ئەدەبیاتی میللەتانی سلاڤ و ترك له سەدەی چواردەمەوە دێنە ئاراوە.

## ئەدەبیاتی ئەسپانیای موسلّمان:

لەم نێوەندەدا تەنیا یەك ولات هەبوو كه له دەرێی بازنەی كیشمانەكێشی زمانی لاتینی و زمانە عامیانەكاندا دەژیا، ئەویش ئەسپانیای موسلّمان بوو كه ئەدەبیات و بەشێوەیەكی گشتی شارستانیەتی ئیسلامی ئەو ولاتە كاریگەرییەكی گەورەی بەسەر دنیای رۆژاوادا هەبوو. **شیعری عەرەبی ئەندەلوس له سەدەی دەیەم و یازدەیەمدا، جگه له شیعری سەلتی، تاقە شیعری غەیرە لاتینی بوو كه له جیهانی رۆژاوادا بایەخی خۆی هەبوو،** ئەم شیعرە راستەوخۆ له رۆژهەلاتەوەو به تایبەتی له بەغداوە دەهات كه ئەو سەردەمە مەلّبەندی زانستی و ئەدەبی جیهانی ئیسلام بوو. له ئەسپانیاشدا (قەرتوبە) پایەیەكی وای هەبوو، لەبەر ئەمە دەكریْ شیعرو مێژوونووسی

موسڵمانانی ئەسپانیا لەریزی زمانانی نەتەوەیی تازە لە دایك بوو دابنرێت، چونکە لقێك بوو لە شیعرو مێژوونووسی رۆژهەلاتی موسڵمانان و جا چ لقێکی بتەوو گەورە! شیعرێك کە هاوتای بەرهەمی شاعیرانی دەرباری خەلیفەکانی بەغدای بەهەموو ناسکییەکیانیەوە دەکردو ئەدەبیات و فەلسەفەیەکی هێندە دەوڵەمەند بە بیری فەیلەسوفانی کۆن و مەسەلەێن مرۆڤانی گرتبووەخۆ کە دەکرێت بەپشتیوانیان، باسی جۆرێك لە مرۆڤدۆستی ئیسلامی ئەسپانیا بکرێت. وەکو گوتمان رۆژاوای بیٚ خەبەر لە ئەدەبیات و فەلسەفەی یۆنانی کۆن، لە رێگەی ئەسپانیای موسڵمانەوە بوو کە دووبارە ئاشنایەتی دەگەڵ بەرهەمی ناودارانی کۆندا پەیدا کردەوە. ئەم گوتەیەی (لویجی رنالدی) وەکو توێژەرێکی ئەوروپایی باشترین گەواهی ئەم حاڵەتەیە: (بالاٚ دەستی موسڵمانان بەسەر ئێمەوە ئەمەیە کە ئەوان ئێمەیان بە گەلێك لە فەیلەسوفانی یۆنانی ئاشناکرد. حەکیمانی جیهانی ئیسلامی لە رنیسانسی فەلسەفەدا لەنێو مەسیحیاندا کاریگەرییەکی شایشتەیان هەبوو. (ئیبن روشد) گەورەترین وەرگێرو شرۆڤەوانی تیۆرییەکانی ئەرستۆیە، هەربۆیەش لەلای موسڵمان و مەسیحیاندا پایەیەکی بەرێزی هەیە.. نابیٚ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەو داهێنەری رەوش و رێبازی (هزری ئازاد)ە، ئاشقینی دەگەڵ فەلسەفەدا دەکردو شەیدای زانست بوو و باوەری بەو دووە هەبوو و بەجۆش و خرۆش و شەوق و زەوقێکی فرەوە دەرسی بەقوتابییەکانی دەگوتەوە..)"١". (بروانە: تاریخ فلسفە در جهان اسلامی، ایر حنا الفاخوری- خلیل الجر، ترجمە عبدالحمید ایتی، کتاب زمان، تهران ١٣٥٥)

## ئەدەبیاتی لاتین لەسەردەمی رینیسانسدا :

لیٚ سەرهەڵدان و پەیدابوونی زمانانی نەتەوەیی، بەمانای تەرك كردنی زمانی لاتینی نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەم زمانانەدا قۆناغێکی تازەی بەکارهێنانی زمانی لاتینی دەست پیٚ دەکات کە کاریگەرییەکی گەورەی لەپەیدابوون و سەرهەڵدانی ئەدەبیاتی سەردەمی رینیسانسدا دەبێت، بەگوتەی (ئەتین گیلسون)ی فەیلەسوف فەرەنسی، سەدەکانی ناڤین بەدرێژایی رۆژگار سوودی لە زمانی لاتینی وەردەگرت بیٚ ئەوەی بایەخ بە جوانییەکەی بدات، لیٚ سەردەمی رینیسانس بەکردەوە کەوتە خزمەتی زمانی لاتینی، پێویستە پێشینەی ئەم گۆرانە لە چەند سەدەیەکی پێشووتردا تاقیب بکریٚ:
وەکو گوتمان لەسەدەی یازدەیەم بەدواوە زمانێن نەتەوەیی و دیالێکتی ناوچەیی برەویان سەندو لەلایەن جەماوەری خەڵکییەوە بەکارهێنراو بەکردەوەش هەموو پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی خەڵکی فەراهەم دەکرد، لەئەنجامدا زمانی لاتینی وەکو زمانێکی مەعنەوی و بەرجەستە بووە مایەی سەرنج، ئیدی زمانی لاتین لە روانگەی ئەهلی ئەدەبەوە لە جۆری زمانە جیاوازەکانی بەربەر نەبوو کە هیچ جۆرە تایبەتمەندییەکی ناوازەی نەبێت، بەڵکو زمانی (سیسرون) و (ڤەرجیل) بوو.

## ئیتالیاو پترارك:

لەسەرەتای سەدەی چواردەمدا کە پاپایانی کڵێسا هزرو بیری خۆیان بەزمانی لاتینی، بەڵام بەشێوازێکی زۆر وشك و لە تەحەمول بەدەر دەنووسیو دەخوێندەوە، منداڵێکی فلۆرانسی کە بابی لە زێدی خۆی دوورخرابووەوەو پەنای بردبووە بەر پاپا ئاڤینیون، لە قوتابخانەیەکی پەرپوتدا لە (کارپانتراس) سەرگەرمی فێربوونی دەستوری زمان بوو، ئەم منداڵە ناوی (فرانسیسکوپترارکا)یە کە پاشان بەمەبەستی خۆش ئاوازبوون، تەنیا ناوی (پترارکا) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت، ئەم کوڕە بەتاسەو ئارەزووەوە بەرهەمەکانی سیسرون-ی دەخویندەوەو لەگەڵ ئەوەی کەشتێکی ئەوتۆی لێ حاڵی نەدەبوو، بەڵام مۆسیقای زمانەکە شەیدای دەکات، جگە لەم بەرهەمانە هەر شتێکی دیکەی دەخوێندەوە، یان دەژنەوت، زبرو بەدئاوازو ئاهەنگ دەهاتە بەرچاوی.

پترارك وێڕای ئەوەی کە وەکو (قەدیس جروم) شەیدای بەرهەمێن سیسرون-ە، وەکو ئەویش مەسیحییەکی بەباوەڕە، ماوەی حەڤدە ساڵی رەبەق دژی هەواو هەوەسی نەفسی سەرکێش دەخەبتێ.

سەرەنجام لەتەمەنی ٢٩ساڵیدا لەم نەبەردەدا، ئەو رێبەرو دۆست و رێنوێنە پەیدا دەکات کە پێویستی پێیەتیی و ئەویش (قەدیس ئوگوستین)ە کە مەسیحییەکی گەورەیە، لێ زمانێکی وەکو زمانی سیسرون-ی هەیە، بەتایبەتی (ئیعترافاتەکەی) کە لە هەقیقەتدا چیرۆك\و داستانی نەبەردە دژی نەفس.

پترارك لە جەنگیدا دژی ئەوانەی کە زمانی جوانی لاتین-یان دەکردە قوربانی بەڵگە وشك و بێگیانەکانیان، ئاقڵانەترین رێگە هەڵدەبژێرێ. ئەو زمانێك بۆ نووسینەکانی خۆی هەڵدەبژێرێ کە جوانی جاران بۆ ئەدەبیاتی مەسیحی سەدەکانی ناڤین دەگەڕێنێتەوە.

ئەمڕۆکە پترارك زیاتر بەغەزەلە ئیتالیاییەکانی دەناسنەوە، لێ قەوارەی بەرهەمەکانی بەزمانی لاتینی، نزیکەی بیست هێندەی ئەم شیعرە جوانە ئیتالیانەیەتی، پترارك لەنامەکانیا بە ئانقەست لاسایی شێوازی (سیسرون)ی کردووەتەوە. ئیلهامی نامە شیعرییەکانی لە (هوراس)ەوە وەردەگرێت و ئیلهامی شیعرە کورتە شوانانەکانی لە (ڤەرجیل)ەوە وەردەگرێت و بەرهەمە ئەخلاقی و عیرفانییەکانیشی قەدیس ئوگوستین وەبیر دێننەوە. هەموو ئەو کەسانەی کە زەوقی ئەدەبیان، یان هەستێن مەزەبی و ئاینیان لە ئەنجامی چەندو چونی بێ گیان بە زمانی زبرو ناشیرین و ناخۆش ماندوو بووە، روو دەکەنە پترارك. (بوکاتچو) کە نۆ ساڵان لەو گەنجترە، لە چل ساڵیدا دەست لە ئیقاعی هەستێن هەوسبازی هاوڵاتیانی دەگەڵ چیرۆکێن ئیتالیدا، هەڵدەگرێت، شازدە غەزەل بەزمانی لاتینی بەناوی (Buco Lium Garmen) دەڵێت و کتێبێك-ی پازدە

بەرگی بەناوی (درەختی خوداوەندانی سەردەمی کفر) دەنووسێت کە تیایدا شیعرێن شاعیرانی یۆنـان و رۆم لەگـەڵ بابـەتێن کتـێبی موقەدەسـدا تـەتبیق دەکـات. هـەر ئـەم تاسـەو کەڵکەڵەیـە سەبارەت بە گێڕانەوەی ئابڕوو حەیسییەت بۆ بەرهەمێن پێشینیان، خۆی لە خۆیدا زەمینەیەکە بۆ ئەو شتەی کە پاشان ناونرا (رینیسانس).

## کەلە پورو میراتی یۆنان و سەردەمی رینیسانس:

روخـانی قەسـتەنتەنییە مێژووییـەکی دیـاری هەیـە: لـە سـاڵی ١٤٥٣دا، قەستەنتینی دوازدەیـەمی ئیمپراتـۆری رۆمـی رۆژهـەڵاتی لـەژێر داروپـەردوی کۆشـکەکەی خۆیـدا کـە لەلایـەن لەشـکریانی سـوڵتان محەمــەد فاتحــەوە داگــیر کــرا، گیــان دەســپێرێت، ترکــەکان جگــە لــە قەڵــەمڕەوی ئیمپراتۆریەتەکـە زۆر شـوێنی ئـەوروپای ناوەنـدیش داگیر دەکـەن، دوا پاشمـاوەی دەوڵـەتی رۆم نـابوت دەبێـت و شـان بەشـانی ئـەو شارسـتانیەتی یۆنـانیش وێـران دەبێت کە رۆمیـان میراتگـری بوون.
هەمان مێژوو ١٤٥٣ دەبێتە مایەی گۆڕانکاری گرینگ لە رۆژاوای ئەوروپاشدا: جەنگی سەد ساڵە لە ئەنجامدا کۆتایی دێت، پیشەسازی چاپ پەرەدەستێنێ و رابوونی هـزری دەگەشێتەوە کە لـە زەمانی (میشلە) بەم لاوە ناوی رینیسانسی لێ دەنەین.
یـەکێك لـە فاکتـەرە هـەرە گرینگـەکانی ئـەم رابوونـە هزرییـە، گواسـتنەوەی کـەلتوری یۆنانییـە لـە رێگەی هەڵاتوانی بیزانسی، لە کتێبخانەی قەستەنتەنییەوە بۆ ئەوروپای رۆژاوایـی و بەتایبـەتی بـۆ ئیتالیـا. یـەکێك لـەو هەڵاتووانـە کـە نـاوێکی سەیریشـی هەیـە، (لایونیکـوس کالکنـدیلاس) (١٤٣٠-١٤٨٠) کە پاش داگیرکردنی قەستەنتەنییە لەلایـەن ترکانـەوە، فیراری کـردو پـەنای بـردە بەر ئیتالیا.
کالکنـدیلاس، ئـەدیب و مێـژوونووس بـوو، و لـە قەسـتەنتەنییە لـە ژینگـەی ئـارام و بێـدەنگی کتێبخانەکاندا دەژیا، پێش ئەوەی کە قەستەنتەنییە داگیر بکرێت، شاری بەجێ هێشت و لـەبری ئەوەی وەکو زۆر کەسێن دی پەنابەرێتە بەر دوورگەکان، راستەوخۆ چوو بۆ ئیتالیـا، لـە راسـتیدا ئـەویش یـەکێك بـوو لـەو هەڵاتوانـەی کـە هـەر یـەکێکیان چەند تێکستێکی سـەرەکی کلاسـیکیان لەگەڵ خۆدا بۆ رۆژاوا دەبردو کۆڕو ئەنجومەنەکانی رینیسانس کە بەر لەمـە دەسـتیان نەدەگەییـە ئـەو تێکسـتانە، پێشـوازی لێـدەکردن، (کالکنـدیلاس) کـە بەپێچـەوانەی هـەموو هاوڵاتیـانی خـۆی پەی بەوە بردبوو، بیزانس مەڵبەندی جیهان نییەو ئـەوو مێژوونووسـەکانی دیکـە لـە چ خـەونێکی غەفڵەتـدا ژیـاون، مێـژووی دوو دواسـەدەی، واتـە داڕوخـانی دەوڵـەتی رۆمـی رۆژهـەڵاتی بـەزمانی رەمەکی مەردم نووسییەوەو بۆیە پێویستە ئەو بەدوا نووسـەری بیزانسـی و یەکـەمین نووسـەری یۆنانی تازە بژمێردرێت. کالکندیلاس، جگـە لەمێژوونووسـی، دەقی بەرهەمـەکانی (هومـەر)یشـی لەگەڵ خۆیـدا هێنـابوو، کـەمێ بـەر لـە مردنـی (١٤٨٠) تەرجەمـەی کردبوو و ئامـادەی کردبـوو بـۆ چاپ کە لە ساڵی ١٤٨٨دا لە فلورانس دا بڵاوبووەوە. سنعەتی چاپ لـەزەرفی ٢٥ سـاڵدا بـەجۆرێ

دەرفەتی بڵاو بوونەوەی کتێبانی رەخساندو فەراهەم کرد کە نەسساخان بەدرێژایی چواردە قەرن ئەمەیان بۆ نەکرابوو، چاپی تەرجەمەکەی کالکندیلاس کاریگەرییەکی بروسکە ئاسای هەبوو، چاپی کۆبەرهەمێن ئەرستۆ لەساڵی ١٤٩٨دا و بەرهەمێن ئەفلاتون لەساڵی ١٥١٢دا لەو کەمتر نەبوون.

وا باوە کە سەدەیەك بەر لەوە، پترارك نوسخەیەکی بەرهەمەکانی هومەری بەزمانی یۆنانی بەدەست هێنابوو، دەڵێن کە پەڕەکانی هەڵدەدایەوە، لەتاواندا لە خەفەتی ئەوەی کە یۆنانی نەدەزانی و نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە، خوڕخوڕ فرمێسکی دەڕشت، ئەوانەی دوای ئەو بەر لە ساڵی ١٤٥٣ یۆنانی فێربوون، بەجۆرێ یۆنانی فێربوون کە کاتێ نوسخەکانی بیزانس-یان بەدەست گەیی و یەکەمین پەخشکاران بۆ راستکردنەوەو چاپکردنیان پێویستیان بە پسپۆڕ پەیدا کرد، ژمارەیەکی هێندە زۆریان دەئیختیاردا بوو کە توانیان کۆمەڵێك لیژنەی خوێندنەوەو کۆڕێکی رۆشنبیریی تایبەتیان بۆ ئەم مەبەستە لێ پێك بێنن و دامەزرێنن.

لەدەوروبەری ساڵی ١٥٠٠دا ئەم لیژنانە هێندە بەعەشقەوە کاریان دەکرد کە (میشلە) بەرێزو ستایشەوە یادیان دەکاتەوە:

(زۆریان لەمەڕ ئەرستۆ و ئەفلاتون گوتبوو، لێ تەرجەمەێن لاواز و ناڕەوانی بەرهەمەکانی وانیان لەبەردەست دابوو، وەختێ دوای ئەو هەموو سەدەو رۆژگارانە سیمای سەرنج راکێش و بەڕێزی ئەم دایکە مەزن و رەسەن و جوانە، ئەم سەردەم و دەورانی کۆنی ئەفسانەییەیان بینی، چەند باڵاترو گەورەتربوو لە هەموو ئەو شتانەی کە دەیانزانی).

(بۆتیرەی بەشەر نهێنییەك لەمەدا هەبوو: نوێ لەبەرچاویان پیرو داڕوخاوو کەنەفت بوو و سەردەمی کۆن بەو جازیبە غەریب و هاوئاهەنگییە قوڵەی کە لەگەڵ زانستی نۆ باودا هەی بوو، جوان و تەڕو تازە دەینواند، بەشەراوی گیانی هومەر، ئەشیل، و سوفوکیل خوێنی گەرمتر و مەشخەڵی عەشق هاتە ناو دەماری ژاکاوو سیسەوە بووی ئێمەو بلیمەتیی یۆنانی بەجادوو پیاوەتی خۆی بوو بەرێنوێنی کوپرنیك و کریستوف کولەمب، فیتاغورس و فیلولاتوس سیستەمی گێتیان فێری وان کرد، ئەرستۆ دڵنیای کردن لە خڕبوونی زەوی و ئەفلاتون باسی رۆژاوای بۆ کردن.

هەرئەوەندە؟ نە، دڵی ئێمە لەسەردەمی کۆنین جگە لە ئەمریکاو جگە لە زانست یان جازیبەی ئەدەبی شتێکی دیکەی دەخواست، ئێمە بەتایبەتی ئەوەمان لێی دەخواست کە روحمان لە بەند ئازاد بکات. سینگ فراوانی و مەعنەویەتێکی ناسکترو مرۆڤانی تر.. بەئێمە ببەخشێت، دەمانویست نەك میحراب بشکێنێ، بەڵکو بەرینتری بکات، نەك قەدیسان بسڕێتەوە، بەڵکو ژمارەیان زیاد بکات و باوەشی کڵێسا بۆ (سوقراتی قەدیس)، (ئانتونین)انی قەدیس و بۆ تۆ ئەی (فەرجیل)ی قەدیس بکاتەوە).

(میشلە) مێژوونووسێکی رۆمانتیکە کە لە (تاریکی سەدەکانی ناڤین)و (تاریك هزری دەورانی گوتیك) بێزارە، دەبینین کە بۆ رینیسانس دوو رەگەز بەبنەڕەتی دەزانێت: ١- کەشفکردنی دەورانی کۆنین بەشێوەێن ئەسڵی خۆی. ٢- رابوونێکی مەعنەوی ئازادی ساز کە نەزۆك بووە.

(بەپێی پێناسە تەقلیدییەکان، رینیسانس رابوونێکی مێژووییە کە بێداری و هۆشیاری ئەوروپا لە زەمانێکی دیاریکراوو لەژێر کاریگەرییێن دیاری کراو فەراهەم دەکات، واتە لە ئاخرو ئۆخری سەدەی پانزەیەمدا، بە تایبەتی ئەدەبیاتی ئەوروپا، بەدۆزینەوەو کەشفکردنی بەرهەمێن دەورانی کۆن، لە حاڵەتی خامۆشی و کپی دێتە دەرێ، خۆی لە روحیەتی سەدەکانی ناڤین رزگار دەکات، ئازادی هزر، تاك گەرایی و زەوقی ئەستاتیکایی هونەری و ئەدەبی و هوشیاری هونەری وەکو هۆیەکی باڵای دەربڕینی هومانیستی (مرۆڤدۆستی) دەخوڵقێنێتەوە).

(لیون تورانس)ی نووسەری دەورەی (نەخشەی ئەدەبیات) جگە لەوەی کە لەسەرێ را باسکرا، هەموو ئەو بیروبۆچوونە جیاوازانەی لەمەڕ سەدەکانی ناڤین و رینیسانس هاتوونەتە دەربڕین بەشێوەیەکی چڕ لە لاپەڕەیەکدا کورت دەکاتەوە کە لێرەدا وەکو خۆی نەقڵی دەکەین:

(ئەم نەخشەیە فریودەرەو بەکەڵکی کتێبە دەرسییەکان دێت، چونکە یەکێك لەسەر فەسڵەکانی مێژووی ئێمە روون دەکاتەوە، لێ بۆ ئەوەی هەقیقەتی کارەکە نەکەوێتە ژێرەوە، پێویست بە سەرنجێن وردتر هەیە، مێژوونووسانی کەلتوری جیهانی زۆربەیان ئەم خاڵە وردانەیان باسکردووە، لێ تانهوو نەیانتوانیوە ئەو ئاڵۆزییەی کە دەوری ئەم کارەی داوە بڕەوێننەوەو ئەم مەسەلەیە هەمیشە لە گۆڕێ بوو: سەدەکانی ناڤین لای هەندێك سەردەمی باوەڕو ئیمانە سەردەمی گەشانەوەی ئیحتوباری مرۆڤانییە لە کۆمەڵگەی کاسولیکی بێ کون و کەلەبەردا، و لای هەندێکی دیکە سەردەمی پایەماڵکردنی تاکە لە کۆمەڵگەی توتالیتاردا، هەروەها رینیسانس-ش لای هەندێك سەردەمی بیری ئازادە کە تاك لە بەند رزگار دەکات و بەلای هەندێکی ترەوە هەڵەیەکی مێژوویی گەورەیە کە دنیای یەکگرتوو دەکات بە گەردیلەی پەراگەندەوەو ئەو بوونە مرۆڤانییەی کە بەشێوەی (تاك) بەرجەستە بووە، دەخاتە گیرودای گۆڕانێکی بێ گەڕانەوەو لە ئەنجامدا دەبێ بەبوونەوەرێکی بەرهەمهێن\و مەسرەفکاری لە خۆ غەریب و نامۆ و لەدرێژایی ئەم رەوت و کاروانەدا روحی خۆی لەدەست دەدات، بەلای هەندێکەوە رینسانسی هزری و هونەری، سەرکەوتنێك بوو، چونکە لەدایکبوونەوەی هومانیزم هونەری پەیکەرسازی تازەکردەوەو ئەدەبیاتی میللەتانی بەتەماس لەگەڵ بەهاێن کۆنێن و داب و نەریتێن میللی دا کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ گۆڕابوو، بوژاندەوە، لێ بەلای هەندێکی دیکەوە رینیسانس-ی هزری و هونەری نیمچە شکستێك بوو، چونکە پەرەسەندنی رینیسانس لەبوارەکانی دیدا، بەتایبەتی لەبواری سیاسەت و ئایندا کارەساتی نایەوە- ریفۆرم و دژە ریفۆرم، سانسۆری بیروباوەڕ، جەنگێن مەزەبی و ئاینی مەرکەزەبوونی دەسەڵاتێن سیاسی و پەیدابوونی وابەستەگییێن نەتەوەیی- کە ئارامی تیرەی بەشەریان شێواندو شڵەقاندو ئەوروحی لێبووردەیی و چاوپۆشییەی کە هومانیزم بۆ بوژاندنەوەی خۆی پێویستیەتی، بەرەبەرە لەناوی برد.

(لەواقیعدا رینیسانس رابوونێکی مێژوویی نییە، بەڵکو دەورانێکە کە سەرەتاو ئەنجامەکانی لە شوێنێکەوە بۆ شونێکی دی فەرق دەکات و هەر لەو سەروبەندەدا لەهەر گۆشەیەکدا گۆڕانێن مێژوویی ئەوتۆ روو دەدەن کە تا رادەیەك پێکەوە بەندن، بەڵام لەنکاودا ئەم گۆڕانانە لە

ژێرکاریگەری سنعەت و کەشفیاتی تازەدا سورعەت پەیدا دەکەن و نەزم و ئاهەنگی ژیانی بەشەر لەبنەوە دەگۆڕن.

یەکێك لەو سنعەتە هەرە گرینگانە وەکو گوترا سنعەتی چاپە، یەکێکی دیکە کە کاریگەرییەکی گشتی تری هەیە، پێشکەوتنی تواناکانی دەریاوانییە کە کەشفیاتی تازەی جوگرافیایی لێدەکەوێتەوە کە خودی ئەم کەشفیاتە دیسانەوە کۆمەڵە گۆڕانێك لەرەوشی ژیانی مرۆڤدا دێنێتە ئاراوەو و بۆچوونی مرۆڤ سەبارەت بە فەزاو کەش و هەوای ژیانی خۆی ژێرو بان دەکات. لێرەدا ئێمە هەقمان بەسەر ئەوەوە نییە کە زانایانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵناسی دەیلێن، تەنیا ئاماژە بە کاریگەریی لەسەر ئەدەبیات دەکەین، **شاعیرانی سەدەکانی کۆن و ناڤین، باسی دنیایەکی زۆر سنوورداریان دەکرد کە چەند هەنگاوێك پتر لە مرۆڤەکە دوور نەدەکەوتەوە،** لەنکاودا– چونکە ئەم رووداوە تەنیا لە زەرفی چەند ساڵێکدا روویدا– دنیای مرۆڤان بەرینتر بوو، بەڵام دیسان بە چەند مەوداو بازنەیەك سنووردار کرابوو. جا هەڵسوکەوت و مامەڵە لەگەڵ ئەم وەزعە تازەو چاوەڕوان نەکراوەدا، هێندەی بیرو هەستی جیاوازو ناکۆك هێنایە ئاراوە کە (جان دولومو)ی مێژوونووسی تایبەتی رینیسانس بە ئۆقیانووسێك لە ناکۆکیانی دەشوبهێنێ و دەڵێت: ".. هاوژینی دژواری ویستی دەسەڵات و زانستێك کە هێشتا رێگەی خۆی نەدۆزی بووەوە، ئارەزووی جوانی و ئیشتیای شەڕاڕەت ئامێزی رق، تێکەڵەیەك لە سادەیی و ئاڵۆزی، پاکی و شەهوەت، خێرخوازی و کینە..".

هەروەها دەورانی رینیسانس لە نەوەستانێکی توندا دەبینین لەنێوان سیستەمی زانستی و فەلسەفی باڵابووندا، خۆ ئەگەر ئەم دوو تەرزە تێفکرینە بگێڕینەوە بۆ گەورە هزرڤانانی کۆنیش، ئەوا دەبێتە ساکاری کە ئەگەر تەرزی یەکەم بدەینە پاڵ ئەرستۆو تەرزی دووەم بدەینە پاڵ ئەفلاتون، چونکە زانایان و هزرڤانانی زۆر لە رووبەڕووبوونەوەیاندا لەگەڵ ئەم فەلسەفەیەدا بۆچوونی جۆراوجۆری وەهایان هەیە کە لەوەیە جیاوازی بۆچوون لەنێوان دوو گرووپی پەیڕەوی ئەرستۆ، لە جیاوازی نێوان یەك گرووپی ئەفلاتونی لەگەڵ گرووپێکی ئەرستۆییدا زیاتر بێ، بیری ئەرستۆییانی دژە مەسیحی پەیڕەوی (ئیبن روشد) هیچ پەیوەندییەکی بەبیری ئەرستۆییانی تۆمیست (قەدیس توماس) یان (ئیسکوتیست) (فەیلەسوفێکی ئوسکاتلەندییە ١٢٧٠–١٣٠٨) نییە. لەهەمان کاتدا لەزۆر رووەوە، هەوڵێکی ئاشتکردنەوەی ئەم دوو فەیلەسووفە دەبینرێ. نموونەی ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە تابلۆ بەناوبانگەکەی (قوتابخانەی ئەتین)ی بەرهەمی (رۆفائیل)ە. کە لەوێدا ئەفلاتون دەبینین کە ئەرستویی ترین بەرهەمی خۆی واتە (تیمایوس)ی بەدەستەوە گرتووەو ئەرستۆ ئەفلاتوونی ترین بەرهەمی خۆی واتە (ئەخلاقی نیکوماخوس)ی بەدەستەوەیە.

جا بەم پێیە ئەگەر بمانەوێ تەنیا قوتابخانەی کلاسیك بەپاشکۆی ئاسایی هومانیزم و رینیسانس بزانین، ئەوا زۆر هەڵەین، چونکە لە بواری کردەییدا هەر هەموو قوتابخانەکان و رەوتە فیکرییەکانی پاش سەدەی شازدەیەم، بەجۆرێك رەگ و ریشەیان لەم رۆژگارە پڕ جۆششەدا داکوتاوە، لەوەیە قوتابخانەی کلاسیك کەمترین کاریگەری ئەم رەوت و رەوشە فیکرییە ئاڵۆزانەی

بەسەرەوە بێ، چونکە لەدەورانی دەسەڵاتی حکومەتی دکتاتۆری پاشایەتی و سەروەت و خۆشگوزەرانیدا هاتبووە ئاراوە، و بەگوێرەی وەزعی سیاسی رۆژ عەودالّی نەزم و گوێڕایەڵی یاسا نووسراوەکان بوو، بۆیە ئەو سیما ئەرستۆییەی کرد بە پێشەوای خۆی کە هەموو ئەم یاسایانەی لەکاری ئەدەبیدا بەدەستەوەدابوو.

ئاشنایی تەواو سەبارەت بەلایەنە جۆراوجۆرەکانی سەدەکانی ناڤین و هەروەها هومانیزم و رینیسانس لە عۆدەی ئەم گوتارە بەدەرە، خوێنەری ئارەزوومەندی ئەم بوارە دەبێ بگەڕێتەوە بۆ کتێبانی مێژووی شارستانییەت و بەرهەمێن دیکە. مەبەست لە نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیە تەنیا ئەوەبوو کە مەسەلەکە بخرێتە روو و هەندێ زانیاری لەبارەوە بدرێت.

# کلاسیزم
# Classicisme

## پێشەکی

وشەی کلاسیك، بەمانای بەرینی خۆی، بە هەموو ئەو بەرهەمانە دەگوترێ کە بەنموونەی ئەدەبیاتی نیشتمانی دەژمێردرێت و مایەی شانازی ئەدەبیاتی نەتەوەیی ئەو وڵات و نیشتمانەیە، بۆ وێنە ئێمە دەتوانین هەموو بەرهەمی نەمری شاعیرانی گەورەمان بە کلاسیکیاتی ئەدەبیاتی فارسی ناوبەرین، لێ کە باسەکەمان بێتە سەر قوتابخانە ئەدەبییەکان، ئیدی ئەو مانا بەرین و دەڵبە نایخوات و زاراوەو چەمکی کلاسیك قاڵبێکی دی وەردەگرێت و لەم بارەیەوە کلاسیك بەو قوتابخانە ئەدەبییە دەگوترێت کە بەر لە هەموو قوتابخانە ئەدەبییەکان (لە سەدەی هەڤدەدا) لە فەرەنسا هاتۆتە ئاراوەو لاسایی ئەدەبیاتی کۆنی یۆنان و رۆمی کردوەتەوە.
بۆیە دەڵێین لە فەرەنسە، چونکە ئەم قوتابخانەیە، ئەگەر خۆ لە چەمکی گشتی وشەکە ببوێرین، ئەوا قوتابخانەیەکی تایبەتی فەرەنسەوییە.
سەبارەت بە قۆناغەکان یان قوتابخانەکانی دیکە، بۆ وێنە دەربارەی رینیسانس، رۆمانتیزم و یان سەمبولیزم بەرەحەتی دەتوانرێ باسی رووداوێکی گشتی ئەوروپایی بکرێ، واتە وەکو دیاردەیەکی گشتی ئەوروپایی ناوببرێ. لێ سەبارەت بەو رێچکە ئەدەبیانەی کە لەسەدەی هەڤدەیەم و سەرەتای سەدەی هەژدەیەمی ئەوروپا لە وڵاتانی جیاوازدا بەکلاسیك ناو براون کەمتر لێکچوون هەیە، واتە لێکچوونێکی ئەوتۆ لەنێوان رێچکە ئەدەبییەکاندا نییە، ئەم راپەڕینە تەنیا لە فەرەنسادا یاساو رێسایەکی پەیدا کردو شێوەی قوتابخانەیەکی تایبەتی وەرگرت.
خراپ نییە کە لێرەداو لە رووی مێژوویی و لە روانگەی ماناشناسییەوە چاوێك بە چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا بگێڕین:
لەسەدەی دووەمی زاییینیدا ئولوس جلیوس-ی توێژەری رۆمی نوسەرانی بەسەر دوو گرووپدا دابەش دەکرد: (نووسەری کلاسیك)و (نووسەری عەوام). بەو نووسەرانەی دەگوت کلاسیك کە بەرهەمەکانی شایستەی موتاڵاو خوێندنەوەی چینە باڵاکانی کۆمەڵ بوایە، بەرەبەرە ئەم سیفەتە مانایەکی فراوانتری پەیداکردو بە بەرهەمێك دەگوترا کە شایستەی وتنەوە بوایە لە پۆلەکانداو بۆ پەروەردەی جەوانان بشیایە. ئەو نووسەرانەی کە بەرهەمەکانیان بۆ سەرمەشقی خوێنکاران پێشنیاز دەکرا، بێگومان بەباشترین نووسەران دانراون و وشەی کلاسیك-یش بە هاوتای باڵایی بێ چەندو چوون ژمێردراوە. بەرهەمێن باڵاش، بەتایبەتی لە روانگەی فێرکارانەوە، دیارە ئەو

بەرهەمانەن کە بە تێپەڕبوونی سەدەو قۆناغان بایەخ و گرینگی خۆیان پاراستووەو لە حەقیقەتدا ئەو بیناو تەلارانەن کە فیردەوسی گوتەنی باو باران کاریان تێ نەکردوون، جا بەم پێیە لە زۆربەی زمانانی ئەمڕۆی ئەوروپاییدا، بەرهەمێن کلاسیك بەهەمان ئەو بەرهەمە کۆنانە دەگوترێ.
لێ لەپاڵ ئەوەشدا نوسەرانی تازەش هەن کە بەرهەمەکانیان شایستەیی ئەوەیان پەیداکردووە کە شان بە شانی بەرهەمێن گەورە نووسەرانی پێشینیان بوەستن، بە نووسەرەکان دەگوترێ کلاسیك و بە بەرهەمەکانیان کلاسیکیاتی ئەدەبیات بۆ وێنە بەرهەمێن تولستوی، گوتەو پروست ناو دەنێن کلاسیکێن ئەدەبیاتی روسی، ئەڵمانی و فەڕەنسی.
لێ تەنێ لە سەدەی هەژدەیەمدا، لە رێگەی لاهارپ، ڤۆڵتێرو تەعلیماتی یەسوعیان و پاشان لە سەدەی نۆزدەیەم و لە رێگەی زانستگەی ئیمپراتۆری و مامۆستایانی سەردەمی گەڕانەوەی دەسەڵاتی پاشایەتی و لویس فیلیپ-ەوە کە بە زۆری دژی شۆڕشی رۆمانتیك بوون، ئەم سیفەتە (کلاسیك) بە شێوەیەکی سیستماتیك دەرهەق بە نووسەرانی فەرانسەوی سەردەمی لویسی سێزدەیەم و لویسی چواردەیەم بەکاربرا. وشەی کلاسیك لەوە بەدواوە جگە لەوەی خۆی لە خۆیدا نیشانەی بەهاو بایەخ بوو، لە هەمان کاتیشدا بەسەرزەنشتێك دەژمێردرا بۆ نووسەرانی رۆمانتیك کە بە نوێئاوەرو بازاڕی و ناسازگار دەژمێردران. گۆتە رای گەیاند کە بۆ یەکەمین جار ئەو و شیلەری دۆستی ئەم جیاوازییەیان خستۆتە نێوان کلاسیك و رۆمانتیکەوەو پاشان برایانی شلگل ئەم مەسەلەیەیان گرتۆتە ئەستۆ. لە رەخنەگرانی سەدەی نۆزدەو بیستەمی فەڕەنسەنیسار، برونتیرو موراس و لە وڵاتانی دیکەدا ئیرونیك بابیت-ی ئەمریکایی تی. ئی. هولم-ی ئینگلیزی و تی. ئیس. ئیلیوت و ژمارەیەکی دیکە ستایش و مەدحێکی زۆری کلاسیسزمیان کرد کە بۆ خۆی لە هەمان کاتدا جۆرە بوغزاندنێکی رۆمانتیزم بوو.
جا بەم پێیە دەبێ ئەوە بگوترێ کە هونەری کلاسیکی ئەسڵی هەمان هونەری یۆنان و رۆمی کۆنە. شاعیرانی سەدەی هەڤدەیەمی فەڕەنسا، دوا بەدوای راپەڕینێك کە هومانیزمی پێ دەگوترێ، ئەم هونەرە کۆنەیان بۆ خۆ کرد بە سەرمەشق و بەرهەمی خۆیان بە گوێرەی کۆمەڵێك یاساو رێسای دیار کە لە ئەدەبیاتی یۆنان و رۆمی کۆنەوەو بەتایبەتی لە بیروبۆچوونەکانی ئەرستۆوە وەرگرتبوو، بەرهەم هێنا. هەڵبەتە ئەم راپەڕینە بە قەرنێك بەر لەوەی لە فەڕەنسادا پەیدا ببێ، لە ئیتالیاو ئیسپانیادا هاتبووە ئاراوە.
ئیسپانیاییەکان هیچ کارێکیان نەکردە سەر فەڕەنسەوییەکان، چونکە وێڕای ئەوەی لە سەدەی شازدەوە کەوتنە تەحقیق دەربارەی ئەرستۆ، لێ هەوڵیان دەدا ئەم یاساو رێسایانە لەگەڵ ئەو ئەدەبیاتە دەوڵەمەندو بایەخدارە بسازێنن کە خۆیان هەیان بوو، ئەدەبیاتێکی تازە دابهێنن. بۆیە نەیان توانی ئەدەبیاتێکی تۆکمەو جێگیر بئافرێنن.
لێ هیچ گومان لەمەدا نییە کە تیۆری سازانی فەڕەنسایی لە هەموو لێکۆڵینەوەو یاساڕێژییەکانیاندا قەرزاری هومانیستە ئیتالیاییەکانن.

## دەربارەی هومانیزم

ئەو راپەڕینەی کە لەو ڕۆژگارەداو بەناوی هومانیزمەوە (مرۆڤگەرایی) یەکەمجار لە ئیتالیادا هاتە ئاراوە، ناوەکەی لە ڕۆمییەکانەوە وەرگرتبوو، چونکە ڕۆمییەکان لەسەردەمی خۆیاندا بۆ موتالاو تەحقیق و توێژینەوە دەربارەی بەرهەمێن یۆنانی کۆن سیستەمێکی ئەدەبی و فەلسەفییان بەناوی (Studia humanit atis) دامەزراند بوو پییان وابوو کە (لە سایەی توێژینەوەو موتالای بەرهەمێن کۆندا دەتوانرێ توانای مەعنەوی مرۆڤ پەرە پێ بدرێ و بەشێوەیەکی مرۆڤانی ترو مەدەنی تر پەروەردە بکرێ). وشەی هومانیزم لە بنەڕەتدا بەمانای (تۆژینەوەی ئازاد) بوو.

لە سەرەتادا تۆژینەوەی (ئەدەبیاتی مرۆڤانی) یان (ئەدەبیاتی تیر\ەی بەشەر) بە ئەدەبیاتی جیاواز لە (ئیلاهیات) دەگوترا. کەواتە بەم پێیە هومانیزم دەکاتە تۆژینەوەو لێکۆڵینەوەی غەیرە مەزەبی. لێ دەبێ ئەو خاڵە لەبەرچاو بگیرێت کە بە هیچ جۆرێك بەراورد لە نێواندا نییە، بەڵکو ئەگەر بەراوردێك لەنێواندا هەبێ، ئەوا بەراوردە دەگەڵ ئەدەبیاتی غەیرە مەزەبی سەدەکانی ناڤیندا کە بەزۆری بەهای ئەدەبییان نەبوو. جا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردتر ئاشنای ئەم مەسەلەیە بین، چاکتر وایە خودی دەستەواژەو رستەکانی ڤ. ل. سولینەر لە پەیامی (رومی رینیسانس) لە (مێژووی ئەدەبیاتی جیهان) لە بلاوکراوەکانی بلییاو نەقڵ بکەین:

(ئەگەر فاکتەرێن تایبەتی بوو بوونە باعیسی ئەوەی کە وشەی هومانیزم مانایەکی لاوەکی پەیدا بکات کە بریتییە لە لێکدانەوەو تۆژینەوەی ئەدەبیانەی دەقێن یۆنانی و ڕۆمی واتە بەرهەمێن ڕۆشنبیریی سەردەمی ئیلحادە، لەبەرئەمەیە کە تاقە دەقێن کە رینیسانس توانیبووی پەیدایان بکات و بەدەستیان بێنێ، هەر ئەو بەرهەمانە بوون. هومانیزم کە بەپێی پێناسەکەی، دژی تۆژینەوەکانی باوکانی کلێسابوو، هیچ مەبەستێکی دژایەتی کردنی دەگەڵ ئەواندا نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەیویست ڕۆشنگەرییەکی تازە بخاتە خزمەتی ئیمان و تۆژینەوەێن مەزەبییەوە).

لێ هومانیستەکان بەزمانێکی بێگیان و مردوو لاسایی و پەیڕەوی پێشینیانیان دەکردەوە، زمانی ڕەمەکی مەردمیان دەبوغزاندو لە دوا ئەنجامدا، لەڕۆحی مەردوم واتە زەوق و هونەری میللی دوور بوون. هەرچەندە لایەنگرانێکی زۆریان لەدەور خڕ بووبوونەوە، بەلا زۆربەی خەڵکی چونکە توانای فێربوونی زمانی لاتینیان نەبوو، هیچیان لەبەرهەمەکانی ئەوان هەڵنەدەکڕاند. جا لەم ڕووەوە لە شەست ساڵی یەکەمی سەدەی پازدەیەمدا، لە کاتێکدا لە لایەکەوە (هومانیستەکان) سەرگەرمی داهێنانی جۆرە ئەدەبیاتێکی ئەرستۆکراتی بوون بەزمانی لاتین، لەلایەکی دیکەشەوە لەناو جەماوەری خەڵکدا ئەدەبیاتێکی سادەو جوانی عامیانە لەدایك دەبوو. هەڵبەتە شاعیران و نووسەرانی ئەم ئەدەبیاتی عامیانەیە خودان پاشخانی ڕۆشنبیریی قووڵ نەبوون و بابەتی نوێ و تازە لە گوتاریاندا بەدی نەدەکرا، بەڵکو لاسایی پێشینیانیان دەکردەوەو تەنانەت هەندێ جار هەمان رستە ئیتالییەکانی پەترارك-یان دووبارە دەکردەوە، لێ پاش ماوەیەکی کەم هونەری کلاسیکی هومانیستەکان تێکەڵ بەزمانی عەوامی خەڵك بوو، لەم دوو توخمەوە (عنصر) ئەدەبیاتێکی میللی نوێ هاتە ئاراوە. بەمجۆرە یەکەمین قۆناغی رینیسانس لە ئیتالیاوە دەستی پێکرد. ئامانجی ئەسڵی ئەمەبوو کە ڕوح و تەبیعەتی مرۆڤانی لەگەڵ زەوق و سەلیقەی

کلاسیکدا بگونجێنن و برەو بەرەخنەی ئازاد بدەن کە بەدرێـژایی سـەدەکانی نـاڤین بەرەبەرەکانی دەکرا.

ئەنجام هومانیزمی ئیتالیا کە لەسـەدەی چواردەیەمدا بەشێوەی گەڕانـەوە بۆ زمـان و ئـەدەبیاتی لاتـین دەسـتی پێکردبـوو، لەسـەدەی شـازدەیەمدا بـووە مایـەی سـەرهەڵدان و پەیـدابوونی ئەدەبیاتێکی میللی تازە، بەمجۆرە هومانیزمی ئیتالیا کە بەتەواوەتی شەقڵی ئوروستوکراتیانەی هەبوو، تەنانەت کەسێکی وەکو (دانتە)ش لەبەر ئەوەی بـەزمانی عـەوامی خـەڵك شیعری گوتـووە، بەشاعیر نەدەزانی، ناوەڕۆك و ماهیەتی خۆی لەدەستدا.

*** پـەراوێز: لیونـاردو برونـی ئـارزوو-ی مێژوونووسـی ئیتالیـایی کـە لەسـاڵی ١٤٤٤دا مـردووە، دەربارەی دانتە دەڵێت: دانتە پێدەچێت کە هەموو بەرهەمە بچووك و بێ بایەخەکانی کەشیشان و موعەلیمانی منداڵانی خوێندبێتەوە، لێ لەبەرهەمە کلاسیکەکاندا تەنانەت ئەوانەشی نـەدیوون کە ئەمڕۆکە گەییونەتـە دەسـتی ئێمـە. گومـانی تێدا نییـە کـە هـەر کەسـێك چـەندە عـەوام و بێ ئاگاش بێ شەرم دەکات کە ئەوەندە گەوجانە بنووسێت. بۆیە من ئەم شاعیرە لەریزی ئەدیبان و هونەرمەندانـدا دانانێم و ئەو بەشایستەی دەباغکاران و ئاشەوانان و ئـەو جـۆرە ڕەش و رووتانـە دەزانم، چونکە لە قسەکانی خۆشیا باش دیارە کە ویستوویەتی دۆستی خەڵکانی وابێ.**

## هومانیزم و رینیسانس لە فەڕەنسادا :

لەنێوان ساڵانی ١٥٤٦-١٥٥٠دا لەپڕ کۆمەڵە هونەرمەندێکی گەنج توانیان پرەنسیپی (جوانی) لە ئەدەبیاتـدا کەشـف بکـەن. ئـەم کەشـفە زادەی ئاشـنایی راسـتەوخۆی ئەوانـەبوو لەگـەڵ شـاکارێن شـیعری یۆنـانی، هەنـدێ لـە ناسـکترین شـاعیرانی لاتـین، پـەنزارك و دواجـار شـاعیرانی ئیتالیـایی رینیسانس کە بەزمانی لاتین شیعریان دەگوت. لە سەدەکانی ناڤیندا ئاسانی دەربڕین و رەوانـی خۆڕسك، چەمکی هونەری خستبووە ژێرەوە. جا لەم میانەدا لە قوتابخانـەی (کوکرە)ی پـاریس، (رونسار)و دۆستەکانی ئەو، بـە رێنـوێنی مامۆسـتایانەی (دورا)ی مامۆسـتای زمـانی یۆنانیـان بـۆ یەکـەمجار ئاشـنایەتیان لەگـەڵ بەرهـەمێن هومـەر، سـوفوکل و شـاعیرانی ئەسـکەندەرانی دیکـەدا پەیداکردو لە ئەنجامـدا چـەمکی هونـەر لـەنك وان بایـەخی پلـە یـەکی وەرگـرت. جا لێرەدا دەبـێ ئاگامـان لـە خاڵێـك بـێ. هەرچـەندە کـە سـەدەکانی نـاڤین شـاکاری حاشـا هەڵنـەگری لـەبوارێن نیگارکێشی، تەلارکاری، شیعرو تەنانـەت مۆسـیقادا هێنـابووە ئـاراوە، لـێ هـەموو ئـەم بەرهەمانـە یازادەی قەریحەی تایبەتی بوون یا بەرهەمی حیساباتی ورد بوو. لێ گومان لەوەدا نییە کـە هـیچ یـەکێك لـەو هونـەرمەندانـەی کـە ئـەم شـاکارانەیان داهێنـابوو کەوتبنـە ئـەو بیرەی کـە بـۆ وەدەسـت هێنـانی جـوانی دەتـوانرێ بگەڕێنـەوە سـەر زنجیرەیـەك یاسـاو رێسـاو سیسـتـەمێکی کـەم تـا زۆر سـازگارو گونجـاو و جـوانی یاسـای تایبـەتی خـۆی هەیـە. لـە قەڵـەمڕەوی هونـەرو لـە قەڵـەمڕەوی زانست-یشدا، سەرمەشقی فرە هەبوو، لێ چ خەبەرێك لە بنەماو رێسایانەوە نەبوو، ئێستا ئەگـەر بێین شاکارێکی سەدەکانی ناڤینی وەکو (سروودی رولان) بخەینـە بـەر وردەبینی لێکۆڵینـەوەوە،

پێشگۆییەکی سەیری زنجیرەیەك یاسای هونەری تێدا دەبینین، بەتایبەتی لەبواری کێش و پێکهاتەی کەلامەوە. لەپشت ئەم جۆرە بەرهەمەوە زەوقێکی ناسك و هوشیارانەو هونەرمەندێکی وردەکار دەبینریٚ. لەگەڵ ئەمەشدا لە کۆی بەرهەمێن فێرکاری سەدەکانی ناڤیندا هیچ بەرهەمێن نابینریٚ کە پیشەی شاعیری و بەشێوەیەکی گشتی پیشەی نووسەری فێری شاعیرو نووسەر بکات. واهی وێنا دەکرا کە تەنیا خەیاڵی حازرو بەبڕشت، هەستی ناسك و بەهێز، دەربڕینی رەوان و لە هەقیقەتدا بەهرەیەکی سەرەتایی کافییە کە بەرهەمێکی خۆش بخوڵقێنیٚ و بەرهەمی هونەری هیچ پێویستی بەمە نەبووە کە هونەرمەند دەربارەی هونەری خۆی بیربکاتەوەو سوود لە دەرسی مامۆستا، یا ئامۆژگارییێن تەقلیدی وەربگرێت.

لیٚ سەبارەت بەو شاعیرە لاوانەی کە هەوەڵجار بەناوی گرووپی (بریگاد)و پاشان لەدەوروبەری ١٥٤٦دا لە کۆمەڵەیەکدا بەناوی (پلییاد) کۆدەبنەوە، مەسەلەکە تەواو جیاوازە. ئەوانە بەر لەوەی داهێنان بکەن و بنووسن، دەیانەویٚ فێربن. پەیان بەم خاڵە بردووە کە لە رابردوودا شاعیرانی گەورە هەبوونە کە بەرهەمەکانیان زۆر باڵاترە لە باشترین و سەرکەوتووترین شاعیرێن هاوچەرخی وان. باوەڕیان وایە کە بۆ گەیشتن بە ئاستی ئەو گەورانەو دابڕان لە رابردووی نزیك و یا لەو ئێستایەی کە بە لای ئەوانەوە بیٚ بایەخە، دەبیٚ بەرهەمێن وان بکەن بە سەرمەشق و هەروەها پەی بە نهێنی داهێنانی وان بەرن و بنەماو یاساو رێسایانێك لەو بەرهەمانەوە هەڵێنجن. بەیاننامە زۆرەکانی گرووپی پلییاد لە فەرەنسادا لە هەقیقەتدا یەکەمین ئەزموونە لەکاری بیرکردنەوە دەربارەی هەلومەرجێن گشتی بەرهەمێن شاعیرانەو هەروەها یاسایێن تایبەتی هەر (ژانر)ێکی ئەدەبی.

ئێمە بەدروستی نازانین (دورا) کە شاعیرانی لاوی پلییادی بە دەقێن یۆنانی ئاشناکردبوو تا چ رادەیەك یارمەتی دابوون بۆ داهێنانی شیعری تازە. چونکە ئەم شاعیرە زانایە بەزمانی لاتین شیعری دەگوت و موریدەکانی خوازیاری بەکارهێنانی زمانی فەرەنسایی بوون لە شیعردا.

دیارە ئەو بۆ خۆی هیچ بەرهەمێکی تیۆری لە پاش بەجێنەماوەو پێدەچیٚ هەموو تەعلیمات و ئامۆژگاری و دەرسەکانی زارەکی بووبن و لەناو چووبن، بەڵام دوو کەس لەنێو شاگردەکانیدا واتە (رینسار)و (دوبلیە) هەر لەسەرەتای دەستپێکی شاعیریانەوە، سووربوون لەسەر ئەوەی کە بنەماو یاساو رێساکانی شیعر رێك بخەن و ئەم کارەیان بە درێژایی شاعیری خۆیان کە سەبارەت بە (دوبلیە) ١٥٢٢–١٥٦٠ زۆر کورت بوو و سەبارەت بە (رینسار ١٥٢٤–١٥٨٥) درێژبووە، درێژەی پیٚ داوە.

ئەمانە بەر لە هەر شتێك و بەتەواوەتی باوەڕیان بەلایەنی پیرۆزی و تەنانەت ئیلاهی شیعر هەبوو و زۆربەی تیۆرییەکانیان هەڵقوڵاوی سەرچاوەی ئەم باوەڕەیان بوو کە بۆ گەیشتن بە باڵاترین پیشە بەبیٚ دەستمایە ناکریٚ بێیتە مەیدان. مادام بلیمەتی شاعیرانە بەهرەو سروشێکی خواییەو بەبایەخترین–ی هەموو بەهرەکانە، هەق وایە کە بە نەزانی و پیٚ خاوسی خیانەتی لیٚ نەکەین. ئیدی لەو رۆژەوە کە شیعر چوون ئاینێك (نەك وەکو هۆیەکی کات بەسەربردن و سەرگەرمی) لە قەڵەم دراوە، پێویستی بەوە پەیداکردووە کە داب و نەریت و ریٚ و رەسمی خۆی هەبیٚ، ئەم ریٚ

و ڕەسمە پێویستە بەوپەڕی وردییەوە جێبەجێ بکرێ و هەر کەسێك کەملی دابێتە ئەم ئایینە نابێ دوای هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی خۆی بکەوێت، یاساییێن پیشەی شاعیری لە ڕاستیدا فێربوونی وردو جدی ئەم ئایین و ڕێوڕەسمەیە.

رینسار لە (خۆلاسەی هونەری شاعیری)دا ئەم خاڵە وەبیر دێنێتەوە کە شیعر لە سەرەتادا ڕەگەزێکی ئایینی بووەو شاعیر ئاگادار دەکاتەوە کە بەبێ شایستەگی دەستی نەداتێ، دەڵێت:

(شیعر لە سەردەمانی سەرەتاییدا جۆرە حیکمەتێکی خوایی ئیستیعاری بووە تا ئەو نهێنیانەی کە ئەگەر بە ئاشکرا بەیان بکرابوایەن، خەڵکانی سەرەتایی شتێکیان لێ حاڵی نەبوایە، لە ڕێگەی چیرۆکانی خۆش و جوانەوە بخرایەتە مێشکیانەوە.

لە حاڵێکا کە شیعر سەرچاوەو ماکێکی خوایی هەبێ، دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئەم حاڵەتە جۆرە شەقڵێکی ئاسمانی بە شاعیریش دەبەخشێت، چونکە نەمری پێ دەبەخشێت. لە ئەنجامدا شاعیریش دەبێ بازنەی ئارەزووەکانی خۆی، سنووری حەزەکانی خۆی فراوان و بەرین بکات، دەبێ شیعرێك بڵێت کە تا چەندین سەدەی دواتر بڕ بکات و مایەی پەسەندی جەماوەری خەڵکی بێ، یانی ئیدی نابێ لەبەر خاتری فلان حوکمڕانی ڕۆژ یان لەبەرخاتری چەند ئەدیبێك شیعر بڵێت، دەبێ عەودالْ و خوازیاری فەخرو شانازی و شکۆیەکی ئەبەدی وەهابێ کە بە تێپەڕبوونی نەپوکێتەوە، نەك عەودالی سەرکەوتنێکی هەنووکەیی تیژتێپەڕی ڕەوتەنی یان ژیانی خۆشگوزەرانی دنیایی).

(دوبلیە) لە (بەڕەڤانی و توێژینەوە لە شیعری فەڕەنسایی)دا دەڵێت: (ئەوەی دەخوازێت بکەوێتە سەردەست و زارێن خەڵکی، دەبێت بۆ ڕۆژگارێکی دوورو درێژ دەرکە لە خۆی دابخات و ئەوەی بیەوێ لە یادی ئایندەییەکاندا وەمێنێ، وەکو ئەوەی بەخۆی زندووبێ، پێویستە ئارەقە بڕێژێ و بلەرزێ، بەهەمان ئەندازەی کە شاعیرانی دەرباری سەردەمی ئێمە دەخۆن و دەخۆنەوە بێ دڵی خۆیان ناکەن، برسێتی و تینوێتی بکێشن و شەونخونی دوورودرێژ بکێشن، ئەمانە ئەو باڵانەن کە شیعری خەڵکی پێیان دەفڕێت و دەکەوێتە ئاسمان).

بەمجۆرە پیشەی شاعیری لەنکاودا ڕەسەنایەتی پەیدا دەکات، شاعیر کە خۆی بەهەڵگری حیکمەتی خوایی بزانێ، دەشتوانێ بگاتە نەمری و جاویدانی، بەڵام بەو مەرجەی خۆی وەقفی خوای خۆی بکات و لە رای ئەودا چاو لە شادی و نیعمەتێن دنیایی بپۆشێت و بە ئەشقەوە لە کارەکەی خۆیدا غەرق بێ.

شاعیر تا زیاتر لە سەرچاوەی ئیلهامی ئیلاهی خۆی نزیکتر بێتەوەو شانازی پێوە بکات، دەبێ لە بەکارهێنانی بەهرەو بلیمەتی خۆیدا خاکی و بێ هەوابێ و خاکی بوونیش ئەوەیە بەر لە هەرشتێك لەبەرانبەر ڕابەرانی ئەم هونەرەدا (یانی شاعیرانی کۆنی یۆنان و ڕۆم-دا سەر دابنەوێنێ).

ئەوەی شاعیر دەبێ لە شاعیرانی سەردەمی کۆنەوە فێری بێ، بەپلەی یەکەم (ژانرە ئەدەبییەکان)ی ئەوانە، دوبلیە بەر لە شاعیرانی دی پەی بە ناخی فاکتەری (ژانری ئەدەبی) بردو لەوە حاڵی بوو کە سرووش و ئیلهام ناکرێت دیاردەیەکی جیابێ و لەو قاڵبە بەدەربێ کە تێی

بڕێژرێت. پوچەڵی و بیٚ نێوەڕۆکی هۆزانێن سەدەکانی ناڤین و هاوچەرخ لە روانگەی ئەوەوە پتر زادەی قاڵبەکانی ئەو هۆزانانە بوو. دوبلیە لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا (بەرەڤانی لە زمانی فەرەنسی و شرۆڤەی) رایگەیاندووە کە تا ئەو رۆژەی هەموو شاعیرانی فەرەنسی جگە لە نەزم و قافیەی جاهیلی چ شتێکی تریان لەدەست نەهاتووە تەنیا شاعیرانی یۆنان و لاتین شاعیری راستەقینەن و فەرەنسییەکان دەتوانن پاش ئاشنابوون بە بەرهەمێن وان خۆیان بگەیەننە ئاستی ئەوان و پێشیشیان بدەنەوە.

بەشێوەیەکی گشتی نیوەی دووەمی سەدەی شازدەیەم قۆناغ و سەردەمێك بوو کە بۆ یەکەمین جار رێبازێکی ئەدەبی فراوانی بۆ خوڵقاندنی بەرهەمێن ئەدەبی تێدا هاتە ئاراوەو ئەم رێبازو ئاینە ئەدەبییە یاساو رێساو بنەمای خۆی هەبوو کە تا کۆتایی سەدەی هەژدەیەمیش بایەخ و ئیحتوباری خۆی لەدەست نەداو هەر ئەم بنەمایانەبوو کە لە سەرەتای سەدەی هەڤدەیەمدا بووە هەوێنی دامەزرانی قوتابخانەی کلاسیك.

## لە رینیسانسەوە تا کلاسیسیزم

دەشێت سەردەمی پاشایەتی هنری چوارەم کە لە ساڵی ١٥٨٩وە (مێژووی پایانی رینیسانس-ی فەرەنسا) تا ١٦١٠ بەردەوام بوو، بەقۆناغێکی نێوان رینیسانس و کلاسیسیزم بێتە ژماردن. چونکە ئەو نووسەرانەی کە لەم قۆناغ و سەردەمەدا هاتنە ئاراوە نەدەتوانریٚ لە ریزی نووسەرانی سەدەی شازدەیەمدا دابنرێن و نەبە بەشێك لە نووسەرانی سەدەی هەڤدە بژمێررێن. ئەم جەماعەتە هەرچەندە شوێنێکی گرینگیان لە مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسادا نەگرتووە، لیٚ چونکە زەمینەیان بۆ سەرهەڵدانی قوتابخانەی کلاسیك سازکردووە، شایستەی ناوهێنانن، گرنگترین نووسەرانی ئەم قۆناغە بریتین لە: (ئانتوان رومون کرتین ١٥٧٥-١٦٢١)، (ئولیویە دوسر ١٥٦٩-١٦١٣)، (پیرشارون ١٥٤١-١٦٠٣)، (ماتورن رینیە ١٥٧٣-١٦١٩)و چەند نووسەرێکی دی.

کاریگەری ئەو کەسایەتیانە لەسەر ئەنجومەن و هۆڵە ئەدەبییەکانی سەدەی هەڤدە بەهیچ جۆریٚ حاشای لێناکرێت، لیٚ دەبیٚ ئەوەش بگوتریٚ کە ئەم کاریگەرییە لایەنی ئیجابی نەبوو، بەڵکو لایەنی سەلبی هەبوو، چونکە ئەو کەسانەی کە لەم هۆڵانەدا کۆدەبوونەوە کاریان باس وخواس و دیالۆگی واقیعی و بایەخداری زانستی و ئەدەبی نەبوو، بەڵکو بریتی بوو لە چەنەبازی دەربارەی زانست و ئەدەب و جۆرێك لە خۆنواندنی بەناو رۆشنبیری بوو هەربۆیەش زانایانی مەزنی سەدەی هەڤدەیەمی چوون دیکارت و پاسکال لەم هۆڵانەوە سەریان دەرنەهێنا، بەڵکو لەدەرێی ئەو جۆرە ئەنجومەنانەوە پەیدا بوون و سەریان هەڵداو گەورەترین شاکاری خۆیان لە ئەنجامی گۆشەگیری لە بورجی عاجی(١) خۆیاندا بەرهەم هێنا.

ئەم نەخۆشی تەکەلوف و رۆشنبیریی فرۆشییە نەك هەر لە فەرەنسادا بەڵکو لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا وەکو نەخۆشییەکی درم بڵاوبووبووە، بۆ وێنە لە ئاخرو ئۆخری سەدەی شازدەیەمداو لە سەرەتای سەدەی هەڤدەدا لە ئینگلستانی سەردەمی ئیلزابتدا جۆرە تەکەلوفێك بەناوی

2) Euphulsme) برەوی پەیدا کردبوو، هەروەها ئەو رەوش و رێبازەی کە لە ئیتالیادا مارینیزم یا کونستیزمی(٣) پێ دەگوترا بەشێك بوو لە هەمان تەکەلوف، هەروەها لە ئیسپانیاشدا گونگوریزم(٤) هەبوو.

ئەو رەوش و رووداوی تەکەلوفەی کە لەسەدەی هەڤدەدا لە فەرەنسا هاتە ئاراوە تەنیا زادەی کاریگەری رووداوە دەرەکییەکان نەبوو. چونکە دەبێ ئەوە بزانرێ کە لە فەرەنسای سەدەکانی ناڤیندا، لە سەدەی سێزدەدا کە رۆمانان دەربارەی ئورستوکراتی دەهاتنە نووسین و چ لەو زەمانەدا کە بەرهەمێن کینایە ئامێزی وەك (Roman de La rose) دەنووسران، دەستپێکی ئەم نەخۆشییە تەکەلوفە دەستی پێکردبوو.

پەیرەوانی تەکەلوف پێیان وابوو کە کاری هونەری دەبێت بەزمانێ بنووسرێت کە جەماوەری رەش و رووت نەتوانن تێی بگەن، جا بۆ ئەم کارەش پێویستە زمانێکی تازەی ئەوتۆ بخولقێنرێت کە لەگەڵ زمانی ئاسایی خەڵکیدا فەرقی هەبێت.

رێبازێن دیکەی وەك بورلیسك و هی تریش هاتنە ئاراوە، لێ رەوش و بارودۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی فەرەنسای سەدەی هەڤدەم وای دەخواست کە ئەدەبیاتیش بکەوێتە ژێر زەبت و رەبتێکی تایبەتییەوە.

١- بورجی عاجی: دەستەواژەی (بورجی عاج) لە مونقنییەوە ماوەتەوە چونکە ئەو لە کۆشکەکەی خۆیدا لەویلایەتی (پریگور)دا ئەو بورجەی کە بۆ کتێبخانەو ژووری کاری تەرخان کردبوو، ناونابوو (بورجی عاج).

٢- ئەم ناوە لە رۆمانی Euphues بەرهەمی رۆماننووسێك بەناوی ١٥٥٤-١٦٠٦ Johnlyly ەوە وەرگیراوە.

٣- لە ناوی مارینی شەوالیەو لە هەمان کاتدا لەناوی شاعیرێکی ئیتالییەوە (١٥٦٩-١٦٢٥) وەرگیراوە.

٤- لەناوی گونگوری (١٥٦١-١٦٢٧)ی شاعیری ئیتالییەوە وەرگیراوە.

## بارودۆخی کۆمەلایەتی سەردەمی کلاسیك

بۆ ئەوەی بزانین چ فاکتەرو هۆکارگەلێك ئیجادی یاساێن مکوم و نەگۆڕیان بۆ هونەرو ئەدەبیات ئیجاب دەکرد دەبێ ئامازە بەرەوشی کۆمەلایەتی سەردەمی کلاسیك بکەین. سەردەمی کلاسیك بەر لە هەر شتێك سەردەمی زنجیرە قۆناغێکە لە مەیدانی سیاسەتدا، پاش جەنگێن قۆچەقانی، حکومەتێکی پاشایەتی زۆر بەهێز بەرقەرار بووە. پاشا بەو هەقەی کە (خوا) پێی داوە، فەرمانڕەوای موتڵەق بووە، رەعیەتی خۆی و سەرو سامانی رەعیەتی خۆی بەئارەزووی دڵی خۆی بەڕێوە بردووە، خۆشەویستی نیشتمان هاوتای خۆشەویستی پاشاو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پاشا بووە، دروشمی هەرە باو ئەمە بووە: (یەك یاسا، یەك دین، یەك پاشا)، کلاسیسیزم ئەم چەمکانەی بە حەقیقەتێن حاشا هەڵنەگر دەژمارد، ژیانی دەربارو هۆڵەکان یەکجار بەرەونەق و رەوجدارە. لەم کۆڕو ئەنجومەنانەدا هەموو شتێك بەپێی داب و نەریت و رێ

و ڕەسم تەرتیب کراوە، هەموو کەس دەبێ ئەو یاسایانە بزانێ کە بەوپەڕی وردییەوە چەسپێنراوە، نەزانینی ئەم یاسایانە یان هەوڵدان بۆ گۆڕینیان کاری نەکردەنییەو مایەی تەوس و پێکەنینە.
جگە لەوانە، ئەدەبیاتیش یاسای خۆی هەبوو، دەشێت مشتومڕ لەسەر ئەو یاسایانە بکرێت، لێ نابێ بیر لە دوورخستنەوەیان بکرێتەوەو دەبێ ئەوە بزانرێت کە بەرهەمێن هونەری وەختێ دەگەنە پلەی کەماڵ کە پەیڕەوی ئەو یاسایانە بکات.

## سەرهەڵدانی یاسایێن قوتابخانەی کلاسیك

دوابەدوای هەوڵ و تێکۆشین (رینسار)و (دوبلیە)و کەسانی دی، توێژەرانی ئەدەبی لێبڕان کە بەر لە لاسایی کردنەوەی بەرهەمێن هونەری پێشینان، بکەونە خوێندنەوەو تۆژینەوەی تیۆرییەکانی وان، ئەو یاساو ڕێساو بنەمایانە شەرح و شرۆڤە بکەن کە ئەوان لەبەرهەمێن خۆدا باسیان کردووەو ئەو بەرهەمانەی کە دەینووسن دەگەڵ ئەم یاساو ڕێسایانەدا تەتبیقی بکەن. لەم کارەدا ئیسپانیایی و ئیتالیاییەکان لەپێش فەڕەنساییەکانەوە بوون، ئەم بابەتە مشتومڕە لە ئیسپانیادا لەساڵی ١٥٩٦وە تا ساڵی ١٦٤٠ دەوامی بوو، بەڵام دەبێ ئەوە بگوترێ کە توێژەرانی ئەسپانیایی هیچ جۆرە کاریگەرییەکیان بەسەر فەڕەنساییەکانەوە نەبوو، فەڕەنساییەکان لەبەشی هەرە زۆری ئەوەی کە لە قوتابخانەی کلاسیکەوە وەریان گرت و فێری بوون، قەرزارباری ئیتالیاییەکان بوون، زۆربەی یاساو ڕێساکانیان وەکو ئیتالیاییەکان لە (ئەرستۆ)وە وەرگرت.
مامۆستای گەورەی ئەم قوتابخانەیە لە فەڕەنسادا بوئیلو بوو کە بنەماو ڕێساو یاساکانی قوتابخانەی کلاسیکی بۆ فەڕەنساییەکان بەیان کرد یان باشتر بڵێین ئەوەی پێشینان گوتبوویان ئەو بەشێوەیەکی فراوانترو ڕەوانتر دووبارەی کردەوە. لەڕوانگەی کلاسیکەکانەوە هونەری ئەسڵی شاعیر یان نووسەر بریتی بوو لە پەیڕەوکردنی وردی ئەم بنەماو ڕێساو یاسایانەو نووسەرێك دەیتوانی بەرهەمی (جوان) بەرهەمبێنێ کە باشترو زیاتر پابەندی یاساکانی قوتابخانەی کلاسیك بێ، جا لەبەر ئەمە ئەو نووسەرانەی کە بەتەواوی پابەندی ئەم یاسایانە نەبووایەن، نەدەکرا بە نووسەری کلاسیك بژمێررێن. وەکو چۆن ئەمڕۆکە مێژوونووسانی ئەدەبی، شاعیران و نووسەرانی وەك رینسار و مونتنی و کورنی بەبێ کەمترین دوو دڵی و ڕاڕایی لەریزی نووسەرانی کلاسیك دەردەکەن.
عینوانی (کلاسیك) بەتایبەتی بەو نووسەرانە دەدرێ کە سەر بە قوتابخانەی ١٦٦٠ بوون، بوئیلو، راسین، مولیر، لافونتین، بوسویە، لابرویرو مادام دولافایت لە جوملەی ئەو نووسەرانەن.
ژمارەیەکی دیکە باوەڕیان وایە کە بنەمایێن قوتابخانەی کلاسیك جگە لە بیست ساڵ (١٦٦٠-١٦٨٠) کە بە تەواوی پابەندی زەبت و ڕەبت بووە، لە ساڵانی دیکەدا پەیڕەو نەکراوە، چونکە مولیر نەیتوانیوە بەتەواوەتی بەسەر شێوازی تەکەلوفدا زاڵ بێ و نووسەرانی تراژیدی هەوێنێکی ریالیزمیان تێدا بووە.

## بنەماو یاساێن قوتابخانەی کلاسیك

### لاساییکردنەوەی سروشت:

ئەوەی نووسەری کلاسیك دەبێ بەر لە هەر یاساو رێسایەك-ی دی پەیڕەوی بکات و پابەندی بێ، لاسایی کردنەوەی سروشتە، بوئیلو لە (هونەری شیعر)ەکەی خۆیدا دەڵێت: (تەنانەت بۆ یەك ساتیش لە سروشت غافڵ نەبن)، "فەسڵی سێیەم".

بەڵام ئەوەی کە مایەی سەرنجە ئەوەیە کە دامەزرێنەرانی هەموو قوتابخانەکانی دیکەش ئیدیعای لاسایی کردنەوەی سروشت دەکەن، بۆ وێنە ڤیکتۆر هۆگۆ-ی پێشەوای رۆمانتیزم لەو کاتەدا کە ئاڵای دژایەتی کلاسیسیزمی هەڵکردووەو دەیەوێت لە بناغەوە هەڵیتەکێنێ، دەیەوێت و سوورە لەسەر ئەوەی کە فەرمانڕەوایی تەبیعەت و سروشت بەر قەرار بکات و دەڵێت: (کەواتە تەبیعەت! تەبیعەت و هەقیقەت!)، پاشان زولا کاتێ کە ناتورالیزم بونیاد دەنێ، ئیدیعا دەکات کە تەبیعەتی وەکو شتێکی تازە هێناوەتە ناو ئەدەبیاتەوە، تەنانەت شاعیرانی تەکەلوفخوازیش ئیدیعا دەکەن کە بەرهەمەکانیان لەگەڵ تەبیعەتدا گونجاون و بریتییە لە نەخشاندنی تەبیعەت، واتە نیگارکێشی تەبیعەتە.

لێ لاسایی کردنەوەی کلاسیك بۆ تەبیعەت و سروشت جیاوازە لە رێبازی ئەوانی دیکەو جێی مشتومڕو باس\وخواسە: ئایا لاسایی کردنەوەی تەبیعەت دەبێ وەکو فۆتۆگراف موو بە موو و تەواو وەکو خۆی بێ؟ نە! پێویستە لە نەخش ونیگارە تێکەڵ و پێکەڵەکانی تەبیعەتدا، جەوهەرو کرۆکی هەرشتێك بە باشی دەربهێنرێ وئەم جەوهەرو کرۆکە دیاریکراوە بە شێوەیەك کە لەگەڵ هەقیقەت و واقیعدا بگونجێت، بەتەواوەتی بەیان بکرێت، ئیدی ئەم بەرهەمە دیاریکراوە لەشتی زیادە جیا بکرێتەوەو بەتەنیا بەرجەستە ببێ، هونەرمەند دەبێ ئەم حاڵەتەی کە دەیەوێ نیشان بدات، لەبری درێژدادڕی و بەتان وپۆدا چوون بە چەند دەستەواژەیەکی کورت و بەهێز بەیانی بکات و لە هەقیقەتدا دەبێ فەرمان بە تەبیعەت بدات کە باشتر لە هەر مەوقیعێکی دیکە خۆی بنوێنێ، واتە هونەرمەندی کلاسیك لە جیاتی نیگارکێشانی تەبیعەت، وێنەیەکی کامڵتری تەبیعەت بخوڵقێنێ و لەگەڵ ئارمانج و ئارەزووە بەشەرییەکاندا بیسازێنێ.

لێرەدا پرسیارێکی دیکەش دێتە پێشێ: لەخۆمان دەپرسین ئایا هونەرمەندی کلاسیك بەنیازە یان بەتەمایە هەر هەموو ئەو شتانەی لە سروشتدا هەن بەیانیان بکات؟ ئەگەر وابێ مەبەستی (بوئیلو) لەم خاڵەی کە لە (هونەری شیعر)دا نووسیویەتی چییە: (لە تەبیعەتدا مارو گیانلەبەرانی نەفرەت هێن هەن کە لاسایی کردنەوەیان لەلایەن هونەرمەندەوە ناخۆش دەبێ)؟ لەبەر ئەمە هونەرمەندی کلاسیك نایەوێ لاسایی هەموو تەبیعەت بکاتەوە. تەنیا لاسایی کردنەوەی تەبیعەتی مرۆڤانی مەبەستە چونکە هێشتا سەدەی هەڤدەم، تەبیعەتی دەرەکی، واتە ئەو تەبیعەتە زندوو و جوان و رەنگاوڕەنگە کە دەبوایە لە ئایندەدا ژان ژاك رۆسۆ کەشفی بکات، نەناسی بوو و بایەخی نەدابوویێ.

سەنت ئورمون–ی نووسەری سەدەی هەڤدەیەم لەم بارەیەوە دەڵێت: (گوتارێك كە تەنیا باسی درەختان و رووباران و چەمەنزاران و كێوان و باخانی تێدابێ، خاومان دەكاتەوە یان بەلای كەمەوە لەزەتێكی تازە نابەخشێت، لێ ئەوەی لە مرۆڤایەتییەوە وەرگیراوە، وەكو ئارەزوو خۆشەویستی و كەڵكەڵە مرۆڤانییەكان، بە تەبیعەت كار لە كانگای روحمان دەكات و هەستی پێدەكرێت، چونكە زادەی یەك تەبیعەتەو بە ئاسانی لە روحی هونەرمەندەوە بۆ روحی خوێنەر یا تەماشاڤان دەڕوات).

سەبارەت بە تەبیعەتی مرۆڤانیش پێویستە لە خۆمان بپرسین كە ئایا هونەرمەندی كلاسیك دەیەوێت سیفەتە نزمەكانیش كە دەستكرد نین و لە تەبیعەتیا هەیە وێنەبگرێت و بەیان بكات؟ (بوئیلو) خۆی لەم كارەش دوور دەگرێت. یاسای كلاسیك ئەدەبیات لە نیشاندانی سیفەتێن پەست و نزمی مرۆڤایەتی مەنع دەكات، چونكە باوەڕی وایە كە ئەم سیفەتانە لە گیانلەبەرانیشدا هەن و ئەو سیفەتانەی كە ئێمە لە حەیوانات جیا دەكاتەوەو كردوونی بە مرۆڤ زۆر لەمانە باڵاترن و دەبێ بكەوینە شەرح و شرۆڤەی ئەوانە. حەیوانات یەخسیری غەریزەن و مرۆڤ حاكمە بەسەر حەیواناتدا، بەتایبەتی لە سیفەتە مرۆڤانییەكاندا، پێویستە ئەو سیفەتانە شرۆڤە بكرێن كە رەوتەنی نین بەڵكو بەردەوامن. ئەم سیفەتە بەردەوامانە لە روحی مرۆڤانیدا هەن: خۆشەویستی و حەسودی و رەزیلی و رژدی و قرچۆكی لەم سیفەتانەن و هەمان بەشی كلاسیسیزمە كە لە ریالیزمیان، كە لەوانەیە هەندێك بەشی ژیانی كۆمەڵایەتی سەردەمێكی دیاریكراو یان ژینگەیەكی تایبەتی شەرح بكات، دوور دەخاتەوە. لاسایی كردنەوەی پێشینیان. تەبیعەت بە شێوەیەكی راستەوخۆ نایەتە لاسایی كردنەوە، چونكە هیچ یەكێك لەو سەر مەشقانەی كە تەبیعەت خستویەتێ بەر دەیدەی بەشەر، خودان خەسڵەتێن تەواو بی كەمووكوڕی ئەستاتیكی نییە. لەم میانەدا پێشینیان توانیویانە لە نێوان ئەم دیاردانەی تەبیعەتدا، باشترین و گونجاوترینیان هەڵبژێرن و بەتەرزیكی شایستە لە بەرهەمەكانیاندا بەرجەستەی بكەن. هونەرمەندی كلاسیك دەڵێت كە پێویستە لەبەرهەمێن پێشینیاندا بۆ جوانی زیندوو و جاویدان بگەڕێ و لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەو بەرهەمە تازانەی دێنە ئاراوە لەوەیە باش بن یان خراو، زۆربەی ئەم بەرهەمانە درەنگ یازوو لە بیر دەچنەوە بەڵام تەنیا شاكارێن بێ چەندو چوونی وەكو ئینیید–ی ڤەرجیل و ئیڤیژینی ئورییید–ە كە دەتوانێ پاش تێپەڕبوونی دوو هەزار ساڵیش هەر مایەی پەسند بێ. كەواتە ئەم بەرهەمانە بە شێوازێكی شایستە نووسراون و كەسێك كە بیەوێ بەرهەمەكەی بە زیندوویەتی وەمینێ دەبێ لاسایی ئەو بەرهەمانە بكاتەوە، بۆیە دەبێ لاسایی ناوەڕۆك و شێوەیان بە تایبەتی شێوازو تەكنیكیان بكاتەوە، (هەڵبەتە شاراوە نییە كە راسین لاسایی ئوریپیدو لافونتین لاسایی ئیزوپ–ی كردۆتەوە)، هەڵبەتە نابێ ئەم لاسایی كردنەوەیە بە جۆرێك لە كۆیلەیەتی بێتە ژماردن، بەڵكو بریتییە لە رەچاوكردنی یاساو رێبازێكی دیاریكراوو هەر هونەرمەندێك دەتوانێ بۆ خۆی بایەخێكی جیاو داهینانی تازەی خۆی هەبێ، كەواتە كاتێ كە نووسەرێك لاسایی پێشینان دەكاتەوە، ئەگەر بیەوێ بەرهەمێكی بایەخدار دابێنێ، پێویستی بە شتێكی تازە هەیە ئەویش "قووڵبوونەوە"یە. هەر نووسەرێكی كلاسیكی وەكو (لاپروید)

بگری ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە: "هەموو شتێك گوتراوە." بەڵام لە هەمان کاتدا (ئالن) دەڵێت: "خاڵی سەرنجڕاکێشی ژیانی بەشەر ئەمەیە کە هەموو شتێك گوتراوە، بەڵام هیچ شتێك بە تەواوەتی دەرك نەکراوە". لەبەر ئەمە پێتڤییە حەقیقەتەکان لە هەر سەردەمیکدا دووبارە ببنەوە. کاتێ کە بەرهەمێن نووسەرێن پێشین و کۆن دەخوێنینەوە دەبینین وەکو چۆن کە دیدون-ی قارەمانی فیرجیل و یا ئاندروماك-ی قارەمانی ئوریپید عاشق بوونە، لە سەدەی هەڤدەشدا بە هەمان شێوە عاشقێنی دەکرێت. کەواتە دەبێ بگوترێ کە دڵی ئاشقان نەگۆڕاوە. راسین لاسایی ئیفیـژینی ئوریپید-ی کردۆتەوەو لەو پێشەکەییەیدا کە بۆی نووسیوە دەڵێت: "لاسایی کردنەوەم بۆ ئوریپید و هەروەها هۆمەر، لە بواری شانۆ کاریگەرییەکی چاکی بەسەرمانەوە بوو و ئەم کاریگەرییە پێی نیشاندام کە زەوقی ساغڵەم هەمیشە بەرقەرارەو لە هیچ سەدەیەکدا جیاواز نییە لە سەدەیەکی دیکە. زەوقی پاریس وەکو زەوقی ئەسینا دەرچوو. تەمەشاڤانانی من بە دیتنی شتگەلێك کە زەمان و رۆژگارێك فرمێسکی بە زانایانی کۆنی یۆنان هەڵدەڕشت، هاتنە جۆش و خرۆش و هەڵچوون".

## بنەمای "ئاوەز"

نووسەرێکی کلاسیك دەنووسێت: "من تەنیا لەو بارەیەوە لاسایی نووسەرانی کۆن دەکەمەوە کە ئاوەز قەبوڵی بکات!"و بەمجۆرە بنەمایەکی تازە بۆ قوتابخانەی کلاسیك دێتەگۆڕێ کە بریتییە لە "ئاوەز". ئەم بنەمایە لە نێو کلاسیکەکاندا بایەخێکی زۆری هەیەو لەو رووەوە کە بیرو بۆچوونی هەمەجۆر هەڵدەگرێت، شایستەی باس و موناقەشەیە. (بوئیلو) لە فەسڵی یەکەمی کتێبەکەیدا (هونەری شیعر) دەڵێت: "ئەقڵ و مەنتیقتان خۆش بوێ. بەردەوام گەورەترین زینەت و بایەخی بەرهەمەکانتان لە ئەقڵەوە هەڵێنجن". بە گوێرەی قسەی فیلیپ ڤان تیگم-ی مێژوونووسی ئەدەبی فەرەنسەوی ئەم بنەمایە بە ناهەق دەدرێتە پاڵ ئەرستۆ، چونکە بە شێوەیەکی زۆر ئاشکراو دیار دژی رێبازو میتۆدی ئەرستۆیە. بەکردەوە لە جیهانی هونەردا "ئاوەز" بریتییە لەو شتەی کە دژ یان پێچەوانەی خەیاڵ و "ئیلهامی مەحز" بێ. کلاسیکییەکان لەم رووەوە زیاتر پەیرەوی فەلسەفەی راسیونالیستی دیکارتن کە لە کتێبی (گوتار لەمەڕ رەوتی بەڕێوەبردنی ئەقڵ)دا ئیدیعا دەکات کە دەبێ ئاوەزو ویست بەسەر هەست و سۆزو هەڵچووندا زاڵ بن چونکە ئەقڵ گەورترین هاوێردەیە کە مرۆڤ لە حەیوان جیا دەکاتەوە. لە کاتێکدا کە رێبازی ئەرستۆ شتێکی دیکەیەو بریتییە لە پابەندبوون و رەچاوکردنی عورف و عادەت و داب و نەریت و دەرنەچوون لە رێگەیەکی زۆر سنووردارو باریك کە ئەرستۆ ناوی دەنێ (مەرزی ناوەند)و پێی وایە کە هەر کەس پێ بنێتە دەرێی ئەم رێگەیە تەبیعەت بە توندی سزای دەدات. هەڵبەت ئەم تیۆرییەی ئەرستۆ مایەی لاسایی کردنەوەو تەقلیدی کلاسیکەکان بووە بەڵام هەمیشە کەوتۆتە بەر سێبەری بنەمای گرینگ و بنەڕەتی "ئاوەز"ەوە. لە ساڵی ١٦٦٠دا هونەرمەندانی کلاسیك مەجبوور بوون کە لە نێوان رێبازی (ئەرستۆ)و بنەمای (ئاوەز)دا یەکێکیان هەڵبژێرن و لە ئەنجامدا بنەمای (ئاوەز)یان بەسەر رێبازی ئەرستۆدا تەفزیلدا. هەڵبەتە دەبێ ئەوە لەبەر چاو

بگیرێت کە مەبەست لە ئاوەز، ئاوەزی تاك نییە کە ئازادی بە ئیلهامی شەخسی دەدات، بەڵکو مەبەست ئەو ئاوەزە گشتی و جیهانییەیە کە لە هەموو شوێنێك یەکسان و نەگۆڕەو لە کات و شوێنانی جۆراوجۆردا بەیەك ریتم جوانی دیاری دەکات. کاریگەری (ئاوەز) ئەمەیە کە خەیاڵی مرۆڤانی دەخاتە سەر ئاوەڕۆی دروستی خۆی و سنووری بۆ دادەنێ. بەمجۆرە (ئەقڵی ساغڵەم)و (داوەری) بەسەر هونەردا زاڵ دەبن. بنەمای ئەقڵ، بەسەر ئەدەبیاتی کلاسیکدا زاڵەو پێشڕەوی هەموو بنەماکانی دیکە دەکات. بەم جۆرە، هونەرو ئەدەبیات بە هاوئاهەنگی لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەدا کە لە ژێر هەمان عینواندا لە ڕێگەی دیکارتەوەو لە فەلسەفەدا ڕوویداوە، دەباتە پێشێ.

## پەندو ئامانجی باش:

بە باوەڕی شارەزایانی کلاسیك، تەنیا بەرجەستەکردنی جوانی بۆ تەواو کردنی بەرهەمێکی هونەری بەس نییە، بەڵکو بەرهەمی هونەری دەبێ لە هەمان کاتدا هەم دەرس و پەندی تێدابێ و هەم ئەنجامی ئەخلاقی تێدا بێ. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانرێ کە کلاسیسزم قوتابخانەی وەعزو خوتبەدانی وشك نییە، بەڵکو قوتابخانەیەکی ئەخلاقییە کە سنووری نێوان دەرس و تەعلیمی رووت و وازی و شادی سادە جیا دەکاتەوە، ئەو ڕێگەیەی بۆ ئەم تەعلیماتە دەگیرێتەبەر دەبێ بەلای خەڵکەوە خۆش بێ. ڕەوانی و سواری و ڕەوانبێژی (بوسویە) بەتایبەتی لە شیننامەکانیدا ئەم مەبەستەی پێکاوە (لۆکریس) دەڵێت: "دەرمانی تاڵ لە شوشەیەکدا دەدەنە منداڵان کە شیرینیان لە دەوری داوە، چونکە منداڵەکە بە شیرینییەکەوە دەخافڵێ و دەرمانەکە دەخوات" بە شێوەیەکی گشتی هەموو هونەرمەندانی کلاسیك باوەڕیان وایە کە بەرهەم یا کاری هونەری دەبێ لە ژێر ڕواڵەتی جوانی خۆیدا لایەنێکی ئەخلاقی بگرێتەخۆ کە بە گەوهەرو کرۆکی ئەسڵی ئەو بەرهەمەو هۆی دروستبوونی ئەو بەرهەمە بژمێردرێ.

## روونکاری و کورتبڕی:

بەرهەمی چاك و پوختە بەرهەمێکە کە ڕوون و ئاشکرا بێ. ڕوونی و سادەیی ناکاتە ئەوەی کە بەرهەمەکە لە نەخشەیەکی سەرڤە سەرڤەو سادە پێك هاتبێ، واتە خودانی پێکهاتەیەکی سادەو ساکاربێ، بەڵکو بریتییە لەمەی کەرستەکان بە وردی و ناسکییەکی هونەرمەندانە ڕێك بخرێ و لە وشەێن نا مەفهوم و زیادە بژار بکرێت. زمانی کلاسیك بەرین نییەو وشەێن سنوورداری هەیە. دەڵێن (ڕاسین) لە بەرهەمەکانی خۆیدا پتر لە هەشت سەد وشەی بەکار نەهێناوە. هونەرمەندی کلاسیك لە بەکار هێنانی زاراواندا زۆر گیرو مقەیەتەو وشەێن هەمە جۆرو ناباو بەکار ناهینێ. هەروەها یاسای گرنگی شێواز، لە قوتابخانەی کلاسیکدا، ئەمەیە کە زۆرترین بابەت و مەبەست بە کەمترین وشە دەربڕدرێ، نمایشنامەیەك کە دوو هەزار بەیت بێ و پەندێك کە بەسێ دێڕ بگات

بە درێژ دێتە ژماردن. بەرهەمێن هەر نووسەرێك دەبێ لەیەك دوو بەرگدا جێی ببێتەوە. تەنیا دەبێ بۆ دەربڕینی بابەتێك بنووسرێت، ڤۆلتێر گوتەنی: "نابێ هیچ شتێکی بێ سوود بگوترێ".

## هەقیقەت نوێنی:

"هەقیقەت نوێنی" لەناو بنەماکانی قوتابخانەی کلاسیکدا لە ریزی پێشی پێشەوە دێت. ئەرستۆ لە فەسڵی نۆیەمی (هونەری شیعر)دا پەرەگرافێکی بۆ شرۆڤەی ئەم مەبەستە تەرخان کردووەو نووسەرێن سەدەکانی پاشتر، هەر هەموو ئەو پێناسانەی لەم بارەیەوە هێناویانەتەوە لەو پەرەگرافەی ئەرستۆیان وەرگرتووەو گوتەکانیان لە هەقیقەتدا شەرح و شرۆڤەی ئەو پەرەگرافەیە. پەرەگرافەکەی ئەرستۆ بەم جۆرەیە: "گومانی تێدا نییە کە بەرهەمی شاعیر باسی ئەو شتە ناکات کە رووی داوەو بەڵکو باسی ئەو شتە دەکات کە دەشیا رووبدات. یان جیاوازی شاعیرو مێژوونووس ئەمە نییە کە یەکەمیان گوتاری کێشدارو ئاهەنگدار بێ و دووەمیان گوتاری پەخشان بێ، بەڵکو جیاوازی سەرەکییان ئەمەیە کە مێژوونووس باسی ئەوە دەکات کە روویداوەو شاعیر باسی ئەوە دەکات کە دەشیا رووبدات" شیعر هەمیشە باسی کولیات "گشت" دەکات و مێژوو باسی جوزئیات. "کولی" ئەو شتەیە کە هەر کەسە، بە گوێرەی تایبەتمەندی روحی خۆی و بە پێی پێداویستی و زەروریات یان حەقیقەت نوێنی دەتوانێ بیڵێ یان ئەنجامی بدات. شیعر ناوێن تایبەت لەم زەمینەیە دەنێ و "جوزئی" ئەوەیە کە بۆ وێنە "ئەلکیبیاد" ئەنجامی داوە، یان بەناوی ئەوەوە ئەنجامیان داوە". ئەم تیۆری "هەقیقەت نوێنی"یە کە لە "هەقیقی" و "مومکین"یان جیاکردۆتەوە، پاشان لەلایەن توێژەرانی ئیتالیاییەوە شەرح و شرۆڤە کراوەو توێژەرانی فەڕەنسەوی ئەم بنەمایەیان لەوانەوە وەرگرتووە. وەکو چۆن پاشان "شاپلن"ی نووسەری کلاسیك ئیرادی لە "کورنی" دەگرت و دەیوت کە بابەتی نمایشنامەی "لوسید"ی ئەو بە هەموو مومکینی و حەقیقی بوونێکییەوە، حەقیقەت نوێن نییە. "دوبریاك" لە ساڵی ١٦٥٧دا دەربارەی رەچاوکردنی ئەم بنەمایە نووسیویەتی کە: "ناکرێ هەقیقەت ببێ بە بابەتی نمایشنامە، چونکە زۆر شتی هەقیقی هەن کە ناکرێ بخرێنە بەرچاوو تەماشا . . مومکینیش نابێ بکرێ بە بابەتی شانۆو نمایشنامە، چونکە زۆر شت هەن دەکرێ ئەنجام بدرێ، بەڵام نواندنیان پێکەنین هێنەر دەبێت. . . کەواتە لەم میانەدا تەنیا شتی "هەقیقەت نما"یە کە دەکرێ شیعری شانۆیی لەسەر بنیات بنرێ". وەکو گوترا بەرهەمی هونەرمەند پێویستە خەڵکی بەرەو شەرافەت و خەسڵەتێن ئەخلاقی رێنوێنی بکات، تەنیا نواندن و بەیانکردنی مەسەلە "هەقیقەت نما"کان، کە دەکرێ شاعیر سوودی لێوەربگرێت نەك باسکردنی رووداوە هەقیقییەکان. لە هونەردا، هەقیقەت نما ئەو شتەیە کە زۆربەی خەڵکەکە پێیان پەسندە. بۆیە نووسەری کلاسیك کاتێك کە کەسێکی دیاریکراو وەکو قارەمانی بەرهەمی خۆی هەڵدەبژێرێت، ئەو خوو و خەسڵەتانەی ئەو کەسە بکات بە بابەتی بەرهەمەکەی کە بەلای خەڵکانی هاوشێوەی ئەوەوە لایەنی گشتی هەبێ دەنا هەڵبژاردنی خووی ریزپەڕی ئەو کەسە، بۆ وێنە "تورەیی ئاشیل" وەکو هەوێنی ئەسڵی رووداوێن ناو بەرهەمەکە، بە هیچ جۆرێ پەسند نییە.

## نەزاکەتی ئەدەبی:

بە باوەڕی نووسەرانی کلاسیك، ئەو شتە جوانە کە لەگەڵ تەبیعەتی خۆی و دەگەڵ تەبیعەتی ئێمەدا گونجاوبێ. ڕەچاوکردنی ئەم گونجانە لە قوتابخانەی کلاسیکدا بە (نەزاکەت) ناو دەبرێت. "نەزاکەتی ئەدەبی" یەکێکە لە مەرجە بنەڕەتیەکانی ئیجادی بەرهەمێن کلاسیك. ئەم وشەیە مانایەکی گەلەك فراوان و بەرینی هەس و لە مەسەلە ئەدەبییەکاندا هاوتاو بەرانبەر ئەو شتەیە کە هاوئاهەنگی و هارمۆنی پێ دەگوترێت. جا بۆ ڕەچاوکردنی ئەم بنەمایە پێویستە یەکەم هاوئاهەنگی نێوان بەشە جیاوازەکانی بەرهەمی هونەری و دووەم هاوئاهەنگی ئەو بەرهەمە دەگەڵ سەلیقەو روحیەتی تەمەشاکارانی بەرهەمەکەدا بپارێزرێ. (ئەرستۆ)و (هوراس)ش باسی ئەم بنەمایەیان کردووە. بۆ ڕەچاوکردنی نەزاکەتی ئەدەبی پێویستە پەسندی بەرهەمەکە لە رووی ئەخلاقییەوە بپارێزرێ، لایەنی ئەخلاقی ڕووداوەکان و رەفتارو هەڵسو کەوتی قارەمانانی بەرهەم لەگەڵ داب و نەریتی گشتیدا بگونجێت و رەفتاری هەر کەسێك لەگەڵ تەبیعەت یان وەزع و پێگەی ئەودا بگونجێت، هەروەها تەبع و تەبیعەت و تایبەتمەندییەکانی قارەمان لەسەرانسەری بەرهەمدا بەرقەراربێ و نەگۆڕیت. بە تایبەتی دەربارەی ئەو هەقیقەتە مێژوویانەی کە بەلای خەڵکییەوە نا ئاسایی و شڵەقێنەرن، دەبێ بۆ ڕەچاوکردنی ئەم (نەزاکەت)ە وەکو چۆن لە فەسڵی "هەقیقەت نوێنی"دا باسکرا، هەقیقەت فیدای هەقیقەت نما بکرێ و خاڵێن درێوو نا ئاسایی وەکو خۆی نەخرێتە بەرهەمەوە. هەر چەندە دروستکردنی هارمۆنییەکی واهی لە نێوان ڕووداوێن رابردوو باری دەروونی و تەبیعەتی هاوچەرخان کارێکی ئەستەمە، لێ هەموو پێشەوایانی کلاسیك لەسەری مکوڕ بوون و گوتویانە کە پێویستە لە نیشاندانی هەر ڕووداوێکی خیلاڤ رەوشت و هەر دیمەنێکی بو سوێ و کارەساتاوی و ناڕەحەتکەردا دوورەپەرێزی بکرێ. ئەم بنەمایە رەگی دەچێتەوە سەر هەر هەموو بنەماکانی دیکەی قوتابخانەی کلاسیك و ئەگەر ڕەچاو نەکرێت، ئەوا هەموو بنەماکانی دیکە بایەخی کلاسیکی خۆیان لەدەست دەدەن.

## یاسای سێ یەکێتی:

مەبەست لە "قانوونی سێ یەکێتی" یەکێتیی بابەت و یەکێتیی کات و یەکێتیی شوێنە کە بە بنەمای گرینگی قوتابخانەی کلاسیك دێتە ژماردن و لە ئەدەبیاتی یۆنان و بەرهەمێن ئەرستۆوە بە میرات ماوەتەوە. نووسەرانی کلاسیك بە پەیڕەوکردنی پێشەوایانی یۆنانی باوەڕیان وابوو کە پێویستە لە هەر بەرهەمێکی ئەدەبیدا ئەو یەکێتییانە ڕەچاو بکرێت و هەر بەرهەمێك ئەم سێ یەکێتییەی تیدا نەبێت لەلایەن هونەرمەندانی کلاسیکەوە پەسند ناکرێت. بۆیە لێرە هەر یەکیك لەم سێ یەکێتییە بەجیا دەخەینە بەر باس و لێکدانەوە:

## یەکێتیی بابەت:

یەکێتیی بابەت بریتییە لەمەی کە ڕووداوێن لاوەکی و زیادە تێکەڵی ڕووداوی ئەسڵی و سەرەکی نەکرێ و ڕووداوی شانۆنامە لە لقوپۆپی دەرەکیو ڕووداوی زیادە پاك بکرێتەوە. ئەرستۆ لە "هونەری شیعر"دا باسی (یەکێتیی بابەت)ی کردووە، لە هەوەڵەوە دەڵێت: کە یەکێتیی بابەت بە هیچ جۆرێ بە تەنیا بە هەڵبژاردنی یەك قارەمانی چیرۆك مەیسەر نابێت چونکە لەوەیە لە ژیان و زنەگیی یەك قارەماندا چەندین ڕووداوی هەمە جۆر ڕووبدەن. پاشان لە قسەکەی خۆیدا ئەم ئەنجامگیرییە بە دەستەوە دەدات. "حیکایەت Fable" دەبێ تەنیا یەك ڕووداو (بابەت)ی تەواو نیشان بدات و بگرێتەخۆ. هەموو بەشەکانی ئەم بابەتە دەبێ بە جۆرێ بدرێنە دەم یەکترەوەو یەکێتییەکی یەکپارچەی ئەوتۆ پێك بێنن کە نەتوانرێ بچوکترین بەشی لێ بگۆڕدرێ یان لێ لا ببرێ. چونکە هەر ناوەڕۆکێك بتوانرێ هەم بخرێتە ناو بابەتیکەوەو هەم بە ئاسانی و بێ زیان گەیاندن بە بابەتەکە لابدرێ، نابێ بە بەشێك لەو بابەتە. "ئەم بنەمایە لە سێیەکی یەکەمی سەدەی هەڤدەیەمدا کێشمانەکێشێکی زۆری نایەوە لێ بەرە بەرە نووسەرانی کلاسیك پشتیان بەم بنەمایە بەست و لێکدانەوەو شرۆڤەیان لەسەر نووسی و وەکو بنەمایەکی سەلماو پەسندیان کرد کە دەبێ هەر بەرهەمێك تەنیا یەك ڕووداوی ژیانی قارەمان نیشان بدات، ڕووداوێك کە هەموو بەشە جیاوازەکانی بە تەواوەتی پەیوەست بن بەیەکەوە. لە ساڵی ١٦٦٠دا (کورنی) بۆچوونی شەخسی خۆی خستە سەر ئەم بنەمایەو گوتی کە یەکێتیی بابەت لە کۆمیدیدا بریتییە لە یەکێتیی "مانع"و لە بەرهەمی تراژیدیدا بریتییە لە یەکێتیی "تالوکە"و بەمجۆرە هەر هەموو ژانرەکانی دیکەی بەرهەمێن ئەدەبییش دەگرێتەوە.

## یەکێتیی زەمان:

یەکێتیی زەمانیش لە ئەرستۆوە ماوەتەوە. ئەرستۆ دەڵێت: "تراژیدی هەوڵدەدات کە لە سنووری تواناادا لە شەوو ڕۆژێك پتر نەخایەنێت یان بەلای کەمەوە لەو سنوورە دەرنەچێت. " شانۆنامەی پەسند ئەوەیە کە ماوەی ڕووداوەکەی بەرانبەر هەمان ماوە بێ کە بۆ پیشاندان و نمایش کردنەکەی پێویستە. چونکە جێکردنەوەی ڕووداوی ساڵان و چەندین سەدە لە یەك شانۆنامەی سێ چوار سەعاتیدا ئاسایی نییەو دوورە لە "هەقیقەت نمایی"یەوەو نەگونجانی زەمانی نواندن لەگەڵ زەمانی واقیعی ڕووداوەکاندا تراژیدییەکە لە شێوەی ئاسایی خۆی دەردەخات.

## یەکێتیی شوێن:

ئەرستۆ چ شتێکی لەمەڕ (یەکێتی شوێن) نەگوتووە، بەڵکو لە ساڵی ١٤٥٥دا (ماگی)ی رەخنەگری ئیتالیایی یەکێتیی شوێنی هێناوەتە ناو ناوانەوە رەخنەگری ناوبراو ئەم بنەمایەی لە بنەماڵەی (یەکێتیی زەمانەوە) هەڵێنجاوەو گوتوویەتی کە ئەگەر ماوەی نواندنی شانۆنامە کەم بێ لێ ئەو شوێنانەی کە رووداوەکانی تێدا روو دەدەن جۆراوجۆرو دوور لە یەکتر بن ئەوا تراژیدییەکە شەقڵی ئاسایی خۆی لە دەست دەدات. بۆیە تا دەکرێت دەبێ رووداو لەیەك شوێندا روویدات. تراژیدی وەختێ کاریگەر دەبێ کە گردو کۆ بێ و ئەگەر رووداوەکەی بەسەر زەمانان و شوێنانی هەمە جۆرو زۆردا دابەش بێ، نابەجێ و نا پەسند دەبێت. یەکێتیی شوێن لە هەوەڵەوە ئەوەندە بەهەند وەرنەدەگیراو دەیانگوت: "ئەو یەك شوێنەی بۆ شانۆنامەیەك لە بەرچاو دەگیرێت، دەشێت دوڕگەیەك، شارێك، یان دەڤەرو وڵاتێك بێ یان کورنی گوتەنی "شوێنانێ بێ کە لە زەرفی ٢٤ سەعاتدا بتوانرێ هاتوچۆیان لە بەیندا بکرێ" لێ شاپلن لە ساڵی ١٦٣٥دا بە تەواوەتی سەپاندی و گوتی لە سەرانسەری نمایشدا هیچ جۆرە گۆڕانێکی دیکۆری شیاو نییە. ئەنجام پاش ساڵی ١٦٦٠ سەرکەوتنی هەر سێ یەکێتیی لە جیهانی فیکرو ئەدەبدا سەپاو بڕایەوە.

## یەکێتیی تۆن:

چوارەمین یەکێتییە، هوراس لە سەرەتای "هونەری شیعر"ەکەی خۆیدا، یەکێتیی چوارەمیشی خستە سەر ئەم سێ یەکێتییە، کە یەکێتیی تۆنە. لێ ئەگەر ئەم یەکێتییە پەیڕەو بکرێ، یانی لە سەرانسەری بەرهەمەکەدا تەنیا یەك تۆن بەکار ببرێ، ئەوا بەرهەمێن تێکەڵی وەکو (حەماسی و کۆمیدی) یان (تراژیدی و کۆمیدی) لە جوملەی بەرهەمێن کلاسیك دەردەچن.

## جۆرەکانی بەرهەمێن ئەدەبی:

لە قوتابخانەی کلاسیکدا جۆرەکانی بەرهەمێن ئەدەبی وەکو چینەکانی کۆمەڵ، ریزبەندی کراون. نهۆ ئێمە دێینە سەر شەرح و شرۆڤەی خولاسەی ئەم (جۆرانەی ئەدەب):

## داستان و رۆمان:

سەرکەوتنی بێ نەزیری (ئیلیاد)و (ئینیاد) بووە هۆی ئەوەی کە حەماسە لە نێو جۆرەکانی بەرهەمێن ئەدەبیدا ریزی یەکەم بگرێ و هەر یەکێك لە شاعیرانی سەدەی کلاسیك لەلای خۆیەوە هەوڵی داوە کە بەرهەمێکی حەماسی وەکو ئەو بەرهەمە کۆنانە بەرهەم بێنێ. لە تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە بەرهەمە ئەدەبیانە، شەوکەت و شکۆی جەنگاوەرایەتی، بەرجەستەی بابەت و قارەمانەکانیەتی. بەمەرجێ کە بەرجەستەو گەورە بێ دەکرێ ناوکێشی رووداوەکانی بکرێ. قارەمانانی حەماسە "داستان" دەبێ لە هەموو روویەکەوە بێ کەم و کەسر بن، بە شێوەیەك تەنانەت خەتاو گوناحەکانیشیان لەلایەنی قارەمانێتی بەدەر نەبێ. کاتێ کە

داستان (حەماسە) لەبری شیعر بە پەخشان بێتە دەربڕین، هەنگێ جۆرە بەرهەمێکی دیکەی ئەدەبی پێك دێنێ کە (رۆمان)ی پێ دەڵێن، لە رۆمانیشدا هەمان یاسای هەڵبەستنی داستان بەکار دەبرێ، لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا کە لە داستاندا (حەماسە) جەنگ بابەتی هەرە زاڵە، بەڵام لە رۆماندا ئەم مەقام و پایەیە دەدرێ بە ئەشق و خۆشەویستی. لە رۆماندا بایەخی زیاتر بە حەقیقەت نمایی بەرهەم دەدرێ. دەبێ ئەم خاڵەش لەبەر چاو بگیرێت کە دەبێ رۆمان ئەنجامێکی بە کەڵکی ئەخلاقی هەبێت. شایانی باسە کە نووسەرانی کلاسیك نەکەوتنە بیری رۆمان نووسین، لەم نووسەرانەدا تاقە کەسێك کە رۆمانیکی نووسی و توانی خۆشەویستییەك پەیدا بکات، مادام دولافایت بوو کە بە پەیڕەوکردنی بنەماکانی کلاسیك شاکاری (دۆتمیدکلیفس) بەرهەم هێنا.

## تراژیدی و کۆمیدی:

دەربارەی پێناسەی تراژیدی-ش هەر دەبێ بچینەوە لای ئەرستۆ چونکە توێژەران و شاعیران لەم بارەیەوە پەیڕەوی ئەویان کردووە. ئەرستۆ لە "هونەری شیعر"ەکەی خۆیدا بەمجۆرە (تراژیدی) پێناسە دەکات: "تراژیدی بریتییە لە تەقلیدی یەك رووداوی جدی و تەواوی خودان بەرینییەکی دیاریکراو، لە دەربڕینێکی جواندا کە جوانییەکەی لە سەرانسەری بەرهەمەکەدا بەیەك ئەندازە بێت و لە شێوەی شانۆنامەو نمایشدا بێ نەك لە شێوەی داستان و حیکایەت و بەزەبری سوود وەرگرتن لە ترس و بەزەیی، سۆزی خەڵکی پاك و خاوین بکاتەوە". ئەم پێناسەیە پاش ئەرستۆ بووەتە مایەی تەعبیرو تەفسیری فراوان. (کورنی) پێی وایە کە تەنیا جدی بوونی رووداو کاراکتەرو بایەخی قارەمانانی بەرهەم بۆ جیاکردەنەوەی تراژیدی لە کۆمیدی بەسە. دەربارەی رووداوی تراژیدی هەموو خودان راو شارەزایان لەسەر ئەوە رێکن و پێیان وایە کە دەبێ لە مێژووەوە یان لە ئەفسانانەوە هەڵێنجرێت، هەموو شاعیرانی کلاسیك جگە لە ژمارەیەکی زۆرکەم نەبێ ئەم تیۆرییەیان پەسند کردووە. ئەم رووداوە دەبێ لە مێژووی رۆم یان ئەفسانەکانی یۆنانەوە دەربهێنرێ. رووداوێن تازە بە هیچ جۆر ناشێ پەسند بکرێ.

## قارەمانانی تراژیدی:

ئەرستۆ دەڵێت کە قارەمانانی تراژیدی نابێ جینایەتکاربن. هەروەها نابێ زۆر پارێزکارو کار دروست بن. دەبێ "لە خۆشییەوە بکەونە رۆژەڕەشی، بەڵام نەك لە ئەنجامی تاوان و گوناهێك بەڵکو لە ئەنجامی هەڵەیەکدا" دەبێ ترس و بەزەیی بوروژێنێ و دروست بکات. لەم رووەشەوە هەموو شارەزایان پەیڕەوی ئەرستۆیان کردووە، بەڵام لەم میانەدا (کورنی) بەمجۆرە رای خۆی دەربڕیوە: "قارەمانانی تراژیدی دەکرێت بێگوناهێك بێ کە کەوتبێتە بەدبەختییەوەو یان کەسێکی شەڕانی و شەڕخواز بێ و دووچاری رۆژەڕەشی بووبێ. " بە گوێرەی بۆچوونی ئەرستۆ کە خەڵکانی دیکەش پەیڕەویان کردووە- قارەمانی تراژیدی دەبێ لەگەڵ ئەو کەسایەتیانەی کە

لە تراژیدییەکەدا قوتب و جەمسەری بەرانبەری پێك دێنن. پەیوەندی خزمایەتی و کەسایەتی یا هەستی هەبێ. شارەزایان هەندێ ئەندازەیان بۆ تراژیدی دیاری کردووە کە بەم شێوەیەیە: ماوەی نمایش دەبێ لە سنووری سێ سەعاتداو ژمارەی بەیتەکانی تراژیدی ١٥٠٠ تا ١٨٠٠ بەیت و ژمارەی پەردەکانی پێنج پەردە بێ.

## کۆمیدی:

تیۆری کۆمیدی یەکجار کورتە. ئەرستۆ چ شتێکی ئەوتۆی لە بارەیەوە نەگوتوە، لێ شرۆڤەکارانی یاسایێن کلاسیك، کۆمیدی-یان بەمجۆرە پێناسە کردووە: "کۆمیدی بریتییە لە بەرهەمێکی شانۆیی جوان و سەرنجراکێش کە کەسایەتییەکانی لە کەسایەتییێن خوارتری کۆمەڵ پێك هاتبن و رووداوەکانی لە ژیانی رۆژانەوە وەرگیرابن. لە کۆمیدیدا پێویستە بنەمای "حەقیقەت نمایی" زیاتر رەچاو بکرێ، کۆتاییەکی خۆشی هەبێ و رووداوێکی تازەو پێشڕەوانەی هەبێ". لە رووەکانی دیکەوە، هەمان بنەماکانی تراژیدی بۆ کۆمیدی-ش دروستە.

جۆرێن دی:

شیعری شوانکارەیی، لیریکی، هیجایی و" هتد.

شیعری شوانکارەیی:

ئەمە بەسەرهاتی شوانانێکە کە نەغمەی تەبیعەت و ئەشقی خۆیان دەشیعرێنن. بایەخی ئەم شیعرانە بەندە بە ئاسانی و رەوانی و سروشتی بوونیانەوە. شیعری شوانکاری دەبێ لە هەر زبرییەك کە ناشی و نەزاکەتەکەی دەشێوێنێ بەدوور بێ، لێ لە هەمان کاتدا پێویستە شەقڵی سەرەتایی و گوندییانەی خۆی لە دەست نەدات.

## شیعری لیرکی:

جۆری زۆرو جیاوازی هەیەو بەرجەستەترین و دیارترین جۆری قەسیدەیەکە ستایشی خواوەندان و وەسفی فتوحاتی گەورەو دەربڕین، و نیشاندانی ئەشق و خۆشەویستی دەگێڕێتەوە. ئەم جۆرە شیعرانە دەبێ دەربڕین و بابەتی جوان و بەرجەستە بگرێتەخۆ.

*هەندێ وردە جۆری دیکەی لەم بابەتە شیعرانە هەن وەکو شیعری هیجا و نوکتەو تەرجیع بەند کە پاساو بنەمای دیاریان نییەو شێوەو فۆرمیان زیاتر بەندە بە زەوق و سەلیقەی شاعیرەکانەوە.

* دەربارەی ژانرە ئەدەبییەکان، لەم سەدانەی دواییدا، بەتایبەتی لە سەدەی بیستەمداو لە رۆژگاری ئێمەدا گەلێك توێژینەوەی تێرو تەسەل ئەنجام دراوە کە گرنگترینیان لێکۆڵینەوەکانی نورتروپ فرای، تودوروف و جیرار جەنیت و چەند توێژەرێکی ترن کە زۆربەیان بە پشتیوانی بوتیقای ئەرستۆو ئەفلاتون هەر سێ جۆری حەماسە (داستان)، نمایشی (شانۆیی)و لیریکی-یان بە جۆرە سەرەکییەکانی ئەدەب ژماردووە. یەکێك لە جوانترین توێژینەوەکانی ئەو بوارەی ئەم

چەند ساڵەی پێشوو، توێژینەوەیەکی جیرارجەنیت–ە بەناوی" introductiona کە توێژەری فەڕەنسەوی بە بۆچوونی جیاواز ئەو سێ جۆرە ئەدەبەی خستۆتەبەر وردبینی لێکۆڵینەوە.

## ئەدەبیاتی سەدەی کلاسیك لە وڵاتەکانی دیکەدا:

بە پێچەوانەی رینیسانس و سەردەمی رۆشنگەری و رومانتیزم و سەمبولیزم کە دیاردەی ئەوروپایین و لە چەند وڵاتێکدا پێکەوە یان دوا بە دوای یەك پەیدا بوون و دەرکەوتن، دەبێ ئەوە بگوترێ کە کلاسیسیزمی فەڕەنسە لە دەرێی فەڕەنسەدا هاوتاو هاوشێوەی نەبووە، دیارە ئەمە بە ئیمتیازێکی تایبەتی نایەتە ژماردن و وەکو پێشتر گوترا نووسەرانی سەردەمی رینیسانس یان سەدەی شازدەیەمی ئیتالیای وەك کاستیلیونە، ئاریوستو و تاسو جگە لەوەی کە گەلێك بەرهەمی رەسەن و پڕشنگداریان بەرهەم هێناوە، هیچ کەسێك ناتوانێ نکۆڵی لە "کلاسیك" بوونی بەرهەمەکانیان بکات، لێ لە ئیتالیادا نەیەك ناوەند نە یەك کۆری ئەدەبی هەبوو (ئەم پەراگەندەیی و هەمە جۆرییە خۆی لە خۆیدا هەوێنی دەوڵەمەندی ئەدەبی بوو) و نە کلاسیسیزمی فەلسەفی و ئەدەبی هەبوو، جا ئەم زاراوەیە کاتێ کە دەربارەی ئەم قۆناغەی ئەدەبیاتی ئیتالیا بەکار ببرێ، لە روانگەی زۆربەی مێژوونووسانی کەلتووری ئیتالیاییەوە بە مانای (کۆتایی هومانیزم)و تەنانەت بەمانای داروخان و ئینحیتات دێت. وەکو چۆن هونەرو ئەدەبیاتی ئەسپانیای پاش ڤەلاسکزو کالدرون–ش بەرانبەر بەو سەردەمە پڕشنگدارو درەخشانە بێڕەنگ و بێ بایەخ دەنوێنێ. لە ئاخرو ئۆخری سەدەی شازدەیەمدا، دەوڵەتی ئەسپانیا کە زیاتر خودان مەدەنیەتیکی سەدە ناڤینییەکان بوو، سەرانسەری نیمچە دورگەی ئیتالیای داگیرکردو لێبڕا کە بە توندی بەڕەڤانی لە مەزهەبی کاتولیك بکات و ئەم سیاسەتە ئایینییەی، کە لە ئیتالیادا بە زەبری رەواج و دەسەڵاتی هومانیزم، سست بوو، پیادەکرد. دەسەڵاتی دادگایانی کە یادگاری سەدەی سێزدەم بوو زیاتر کرد. ئەم رەوت و رووداوە کە ئارمانجی بەهێزکردنی رۆژ بە رۆژی دەسەڵاتی پاپا بوو، بەناوی دژە ریفۆرم–ەوە ناو دەبرێ. ئەم وەزع و حاڵە لە سەدەی هەڤدەشدا کە سەدەی دامەزراندنی قوتابخانەی کلاسیك بوو لە فەڕەنسەدا درێژەی پەیدا کرد. چونکە ئیتالیا هێشتا لە ژێر نیری بێگانەدا بوو و فەرمانڕەوایانی ئەسپانیایی و ئەرستۆکراتانی بەرتیل خۆر، خوێنی خەڵکیان دەمژی و شاعیران و ئەدیبانیش بە گوێدان بە جوانی بەرهەم یان ئارمانجی مەعنەوی کاری هونەری، بۆ ئەوەی ژیانیکی ئاسوودەو بێ سەریەشە بگوزەرێنن، دەکەوتنە ریاوێژی. لەو کاتەدا کەلەلایەکەوە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی رۆژ بە رۆژ هەژارترو بێ نەواتر دەبوون، ئەو تاقمە کە لە هیچ شتێکیان کەم نەبوو، گەورەترین حەزو ئارەزوویان ئاسوودەیی خەیاڵ و خۆشگوزەرانی بوو و شاعیران و نووسەران بەرهەمی خۆیان نەك بە مەبەستی هونەری بەڵکو بۆ پارە وەدەست هێنان و شادمانی ئەو تاقمە بەرهەم دەهێنا. بەمجۆرە لە سەدەی هەڤدەدا کە ئەدەبیاتی فەڕەنسە ئەو جۆرە بەرهەمە پڕشنگدارەی خستە جیهانی ئەدەبەوەو ئەدەبیاتی ئیتالیا پتر لە هەر سەدەیەکی دیکە مردوو و بێگیان و سست بوو. کلاسیسیزم کاریگەری سەرەکی خۆی لە سەدەی هەژدەمدا لە ئیتالیادا نواند. لە بواری شانۆدا،

گولدونی (١٧٠٧– ١٧٨٣) کۆمیدی نووس و ئالفیری (١٧٤٩– ١٨٠٣) تراژیدی بێژ ژمارەیەك بەرهەمی بەرجەستەی کلاسیکیان بەرهەم هێنا.

## لە ئەڵمانیا:

وەزع و حاڵەکە لە ئەڵمانیادا ئاڵۆزترە. نیتشە لە "رێبوارو سێبەرەکەی"دا دەپرسێت: "ئایا نووسەرێن کلاسیکی ئەڵمانی هەن؟" بێ چەندو چوون بە نەخێر وەڵام دەداتەوە. ئەدەبیاتی ئەڵمانیا بە هیچ جۆرێ بەشی لە رینیسانس دا نەبوو، لێ لە ئاخرو ئۆخری سەدەی هەڤدەمدا توانی لەگەڵ ئەدەبیاتی کلاسیکدا هاو ئاهەنگ بێ لەم قۆناغەدا، ئەدەبیاتی ئەڵمانیا قۆناغێکی لاسایی و چاولێکەری زۆر لاوازی بەسەر برد. لەناو شاعیرانی ئەڵمانی ئەم سەدەیەدا ناوی (ئوپیتز ١٦٣٩– ١٦٩٤) لە هەر هەمووان دیارترو بەرچاوترە کە ئەویش پتر لەوەی شاعیر بێ هزرڤانێکی گەورە بووەو لە رای چاککردنی زمانی ئەڵمانیدا کۆشاوە. (ئوپیتز) لە هەمان کاتدا دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی ئەدەبی بووە بەناوی (سیلزین). ئەدەبیان بەتایبەتی شاعیرانی سەر بەم قوتابخانەیە پتر پشتیان بە فیکرو هزر دەبەست تا هەست و خەیاڵ. چونکە ئوپیتز دەورێکی زۆر گرینگی لە دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیەدا هەبووە، بۆیە ئەم قوتابخانەیە لە هەمان کاتدا (بە قوتابخانەی ئوپیتز)ش ناو دەبەن. لە نێو وڵاتانی گەورەی ئەوروپای رۆژئاواییدا تەنیا ئەڵمانیا ئەدەبیاتی نوێی خۆی بە دەورانێك کە بە لاسایی کردنەوەی کلاسیسیزم نامۆیە دەستی پێکردووە، لێ لەگەڵ ئەمەشدا گۆتشید (١٧٠٠– ١٧٦٦)و تەنانەت کەمێ پاش ئەویش، ویلاند لە مەیدانی ئەدەبیاتی ئەوروباییدا بە کەسانی ناودار ناژمێردرێن. هەڵبەتە جۆرە شیعرێکی لیریکی باروك هەبوو، هەروەها جۆرە موسیقایەکی باروکی تەژی جوانی و ناسکی و رەسەنایەتیش تەنانەت بەر لە خانەدانی موسیقی زانانی (باخ) هەبوو. لی نە لە بواری شانۆو نە لە رۆمان و نە لە نێو ئەو نووسەرانەدا کە (ئەخلاقیون)یان پێ دەگوترا، کاریگەری کلاسیسیزمی فەرەنسی دیار نەبوو. غەریزەو کەڵکەڵەیەکی هوشیارو دڵنیا، هەر لە سەرەتاوە خەڵکانی وەك لیسینگ، هیردیر، شلیگل و تەنانەت گوتەو شیلەر–ی لاویشی هاندەدا دژی ئەوە بووەستنەوە فەرەنسەوییەکان بکەن بە سەر مەشقی خۆیان، یان سەر مەشق لەوانەوە وەربگرن. ئەوانە رایانگەیاند کە بەرهەمێن شەکسپیر، شیعری عامیانە، فالدرون و یونانییەکان لە هونەرو ئەدەبیاتی فەرەنسە باڵاترن و بیانووشیان ئەوە بوو کە کلاسیکیانی فەرەنسە کاری خۆیان تا رادەی لاسایی کردنەوەی سادەو ساکار هێناوەتە خوارێ. گۆتەو شیلەر، تا چەند ماوەیەك دواتر، پاش ئەوەی رابوونی پێش رۆمانێکی دەورانی لاوی خۆیان کە ناوی بۆران و گوشار – Sturmund Drang )بوو و ئاوێتەی عیرفان و هەڵچوون بوو و هەروەها رومانیتزمی وەچەی پاش خۆیان تێپەڕاندو بڕی، ئیدیعای کلاسیك بوونیان دەکرد. لێ ئەم کلاسیسیزمەی (وایمار)و تەنانەت لە (ئیفی ژینی) گۆتەو (پاکیزە ئورلیان)ی شیلەردا، ئەو نەرم و نیانیە سروشتییەی بەرهەمی کلاسیکی نییە.

## له ئینگلیستاندا:

**له ئینگلیستاندا، تەنانەت پێش فەرەنسەوییەکان چەند تیۆریسینیکی لایەنگری شانۆی شیعری (هەقیقەت نوێن)و (نەزاکەتی ئەدەبی) هەبوون. لەناو ئەمانەدا دەتوانرێ ناوی بن جونسن، خوشکە سیر فیلیپ سیدنی و کونتس پەمبروك ببرێ. شاعیرێکی بچووکیش بە ناوی ٠سیرجان دنهام) نمایشنامەیەکی شیعری جوانی بەناویCoopenss Hill نووسی کە هەندێ لە رەخنەگران هەوڵیانداوە، لەگەڵ شیعرێن کلاسیکی فەرەنسەویدا بەراوردی بکەن. شیعرێن سادەی والەرو شیعرێن پڕ جۆشی مارکەل لە زۆربەی هۆزانێن فەرەنسەوی هەمان سەدە باشترن. لێ ئەم چەند سەرکەوتنە پەراگەندەیە ناتوانێ کلاسیسیزمیکی چەسپاوی بەرقەرار بێنێتە ئاراوە. لە شانۆی ئینگلیسدا تراژیدی مردووەو درامای حەماسی درایدن یان نمایشنامەی بەشکۆی تەوراتی میلتون لە بواری داستانی (سامسون و دلیلە)دا ناتوانێ ژیان بخاتەوە بەر ئەوانە. کۆمیدی دەورانی گەڕانەوەی پاشایەتی، پڕ جۆش و خرۆش و شیرین و درەخشانە، لێ بە چاکی هەست دەکرێت کە سەردەمی مەزناتی و شکۆی شانۆو نمایش لە ئینگلیستاندا، یانی لە سەردەمی ئەلیزابێت و سەرەتاکانی پاشایەتی جاکی یەکەم، بەسەر چووە. هەندێ لە رەخنەگران زۆرجار باسی لێکچوونی نێوان کلاسیسیزمی فەرەنسەو ئەدەبیاتی کلاسیك-ی لەندەن لە زەمانی درایدن، ئاددیسن و سویفت و تەنانەت دکتۆر جونسن دەکەن، بەڵام پێویستە ئەوە بگوترێ کە ئەم ئیدیعایەی ئەوان موبالەغە ئامێزە. لە راستیدا لە سەدەی هەژدەمدا بوو کە لەگەڵ بەرقەراری سیاسیدا، شیکردنەوەی نووسەرانیش بەرە بەرە ماقووڵتر بوو و لەندەن نووسەرانی ئینگلیزی گرد کردەوەو نرخی بۆ بایەخی هزری لە ئەدەبیاتدا دانا. لێ ئەم سەردەمە زۆر رەسەنە زۆر لە سەردەمی لویسی چواردەی فەرەنسا جیاوازترە، چونکە تەژی دژە رووداوانی هەمە جۆرە: دادایزم، میتودیزم، جورنالیزمی پڕ هەراو هەنگامەو تەنانەت هەندێ جار هەجوو ئامێز، ئازادی ئەخلاقی و تەنانەت تەواو دژە مەسیحی. ئەم سەردەمەی کەلتووری ئینگلیز نە توانای بەرانبەری لەگەڵ دەوڵەمەندی بی پێشینەی سەردەمی ئەلیزابیتیدا هەیەو نە رەونەق و شکۆی شیعری لیریکی قۆناغی رۆمانتیزم و زەمان و دەورانی ڤیکتوریای هەیە. وشەی کلاسیك، کە لە ئەدیبانی وەکو مارلو و شەکسپیرو میلتون و ئەوانەی پاش ئەوانیش (وردزورپ، کیتس و دیکنز)ش وەبیر خودی ئینگلیزەکانیش نایەنێتەوە. رەسەنایەتی کلاسیسیزم-ی ئینگلیز لەمەدایە کە بە ئارامی و هێمنی لەناو جەرگەی ئەو رەوت و رووداوە، کە (بەر لە رومانتیزم)ی پێ دەڵێن، تێ پەڕیوە.**

# رۆمانتیزم

ئالفریـە دوموسـیە دەربـارەی رۆمـانتیزم دەڵێـت: "رۆمـانتیزم نـە دژی قـانونی سـێ یەکێتیەکـەی کلاسیکە، نە ئاوێتەکردنی کۆمیدیا و تراژیدیایە، نە هیچ شتێکی دیکەی لەو بابەتەیە. بێهودە بۆ گرتنی پەپولەیەك پەلاماری باڵەکانی دەدەیت، چونکە ئەو داوە باریکانەی کە ئەم باڵـە بـە بـەدەنی پەپولەکـە دەگەیـەنێ لـەنێو قامکەکانتـدا هەڵـدەوەرێ. رۆمـانتیزم ئەسـتێرەیەکی چـاو بەگریانـە، رۆمانتیزم شنەیەکی بەناڵە ناڵە، رۆمانتیزم پڕتەوێکی ناگەهانی و سەرمەستی بیمارێکە..."

بەمجۆرە دەبینین ئەو قوتابخانەیەی کە ئێستا بابەتی باسـی ئێمەیـە، رێك جەمسـەری پێچـەوانەی قوتابخانەی کلاسیکەو فەرمانڕەوایی قوتابخانەیەکی واهی بەسەر ئەدەبیات و هونەری ئەوروپادا دیارە دەبێ زادەی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی و مەعنەوی گەورەبێ. بۆ ئـەوەی هۆیـەکانی سـەرهەڵدان و پەیـدابوونی قوتابخانـەی رۆمانتیـك بـزانین واچـاکە لـە هەوەڵـەوە بـزانین چ فاکتــەرێك یــان فاکتەرانێك بووەتە مایەی لاواز بوون و پاشان شکستی قوتابخانـەی کلاسیك. هـەروەها لـە نێوان ماوەی ئەم دوو قوتابخانەیەدا باری ئەدەبی ئەوروپا، بەتایبەتی فەرەنسا، چۆن بووە. جا بـۆ ئـەم مەبەستە، وەکو چۆن لە فەسڵی پێشوودا کارمان کرد، بەر لە هەر شتێك باری کۆمەڵایـەتی نیـوەی یەکەم و نیوەی دووەمـی سـەدەی هـەژدەو پاشـان سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدە شـرۆڤە دەکـەین تـا خوێنەر بە ئاسانی ئەوە دەرك بکات کە رۆمانتیزم زادەی چ سەردەمێك و ژینگەیەك بووە. چونکە باری کۆمەڵایەتی، بەتایبـەتی دەربـارەی قوتابخانـەی رۆمانتیـك، کاریگەرییـەکی یـەجگار گـەورە و قووڵی هـەبووەو ئـەم قوتابخانەیـە زادەی سـەردەمێکە، کـە گـۆڕانی سـەیر لـە وەزع و بـارووددۆخی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی ئـەوروپا، بەتایبـەتی فەرەنسـا، روویـداوەو ئـەم گۆڕانـە کۆمەڵایەتییـەش راستەوخۆ ئەدەبیاتی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆی.

## لە کلاسیزمەوە تا رۆمانتیزم

### ( سەردەمی فەلسەفی )

لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی هەژدەیەمـدا، چـینی ئەرسـتۆکرات و خانـەدانان بـەرە بـەرە توانـا و ئیحتوبـاری خـۆی، بەتایبـەتی لـە رووی ئەخلاقییـەوە، لەدەسـت دەدا و گەنـدەڵی و داڕوخانیـان رۆژبەڕۆژ زیاتر دەردەکەوت. لەنێو خەڵکی ئەم چینەدا پیاوێك نەبوو وەفاداری ژنەکەی خۆی بێ. ئەرستۆکراتان پێیان شەرم بوو لەگەڵ ژنی خۆدا بچنە پیاسە و گەڕان. خـەڵکانێك بـە نوێخـواز و شایسـتە دەژمێـردران کـە زیـاتر رمـوودەی رابـواردن و خۆپەسـندی و پێشـێل کردنـی یاسـا بـوون. ئەرسـتۆکراتان سـەرگەرمی هـەرزەیی و بـەرەڵلایی بـوون و بـارودۆخی ئـابووری بـەرە بـەرە خراتـر دەبوو. گرانـی بـرەوی دەسـەند و بودجـەی وولات دەشـێوا.. ئیـدی گوێرایـەڵی تەسـلیم بـوونی بـێ چـەند و چـوون بـە هـەر زۆرداریـیـەکی چـینێکی گەنـدەڵ، بـە کـارێکی گاڵتـەبازاڕ و بـێ فایـدە

دەژمێردرا. تەرزی بیرکردنەوەی خەڵکی لە خواستی نووسەرانی کلاسیك دوور کەوتبووەوە. ئیدی نووسەرانی ئامادە نەبوون بەو بیانووەی کە هەر جۆرە ئیعتراز و باوەڕێکی تازە، لادانە لە بنەماکانی قوتابخانەی کلاسیك، خۆیان لە قاڵبی چەند بنەمایەکی سواو بدەن و فزەیان لێوە نەیات. لەم سەردەمەدا خەڵکی هەستیان کرد کە دەبێ دەربارەی مەسەلە جۆراوجۆرەکانی ژیان، باس و گەنگەشە بکەن، و بۆ باشتر کردنی بارودۆخی ژیانی خۆیان، پێویستیان بە زانیاری گشتی پەیدا کرد. بە جۆرێ کە لە شارەکانی فرەنسادا، ل دوا ٢٥ساڵی سەدەی حەڤدەدا پێنج ئەنجومەن و قوتابخانە کرایەوە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا ٢٠ ئەنجومەن و دەزگای فێرکردن و پەروەردە دامەزرا. ژمارەی  ڕۆژنامەکان زیادی کرد. خەڵکی کەوتنە تاقیب و سۆراخی ژیانی خەڵکی وولاتانی دیکە. ئەو گەشتنامە و نووسراوانەی زانیاریان لەمەڕ ژیانی گەلانی دنیا تێدا بوو، ڕەواجیان پەیدا کرد. چونکە سەدەی هەڤدە گیرۆدەی نەزانی بوو و توانای راڤەو شرۆڤە و لێکدانەوە و سەلماندنی مەسەلەکانی نەبوو، بۆیە لەو سەردەمەدا تەنیا یەك (سروشتی جاویدان) و یەك (ئەقڵی جێگیر و نەگۆڕ) هەبوو. کۆمەڵێك بنەمای گشتی و جێگیر دیاری کرابوو، کەس لاری لەو بنەمایانە نەبوو، خەڵکی پێویستیان بە بیر کردنەوەو لێکدانەوەو شیکردنەوە نەبوو. و ڕەچاو کردنی ئەو بنەمایانەش زۆر ئاسان بوو. بەڵام گۆڕانی کۆمەڵایەتی، ئاستی بیر کردنەوەی خەڵکەکەشی گۆڕی.

ئەوروپاییەکان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەمدا پەیان بەوە برد کە دنیا زۆر لەوە هەمەجۆر تر و ئاڵۆزترە کە ئەوان تەسەوریان دەکرد، ئیدی پێویستیان بەوە نەبوو کە گوێ لە هەندێ شیرەت و ئامۆژگاری دەربارەی ڕەچاوکردنی چەند بنەمایەکی جێگیر و پەیڕەو کردنی چەند دەستوورێکی وشك بگرن. دەیانویست تەرزی بیرکردنەوەو هونەر و ئەدەبیات و هەروەها ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان لەبەر ڕۆشنایی هەڵسەنگاندنی دروست و بەزەبری ئەقڵ و هۆش ڕێك بخەن. لەم سەردەمەدا فەیلەسووفانی وەکو مۆنتسیکو و ڤۆلتێر پەیدا بوون و بەرهەمی وەکو (روحی یاساکان) و (نامە فەلسەفییەکان) و (سەدەی لویسی چواردە)یان بڵاو کردەوە. هەڵبەتە دەستەی حوکمڕانانیش دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتبوون و بەو چەکە سامناکەی لە دەستیاندا بوو کەوتبوونە دژایەتی فەیلەسوفان. بۆ وێنە بەپێی قانونی ١٧٥٧ هەر بەرهەمێك بە پێچەوانەی ئەخلاق دابنرایە، هەم نووسەرەکەی و هەم بڵاوکەرەوەکەی حوکمی ئیعدام دەدران. بەڵام گوشاری رای گشتی کۆسپێکی گەورە بوو لە بەردەم جێبەجێ کردنی ئەو جۆرە یاسایەدا. هەرچەندە هەندێك لە نووسەران ساڵانێك لە زینداندا مانەوە بەڵام سەرەنجام و بەزەبری گوشاری رای گشتی کارگەییە ئەوەی کە هەر نووسەرێك دەگیرا، یان دوای چەند مانگێك ئازاد دەکرا، یان دووریان دەخستەوەو تەواو. بۆ نموونە لە ساڵی ١٧٦٢دا (ئەمیل)ی جان جاك ڕۆسۆ مەحکوم کرا، ڕۆسۆ بۆ سویسرا هەڵات. هەروەها لە ساڵی ١٧٥٢دا بڵاو کردنەوەی (ئەنسکلوپیدیا)یان قەدەغە کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، بڵاوکردنەوەی بەردەوام بوو.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا، خەڵکی دووچاری بەدبەختی و پەریشانی بوون، و لەناو جەرگەی ئەم ئاژاوەو پاشاگەردانییەوە هەستیان بەوە دەکرد کە پێویستیان بە ریفۆرم هەیە. بۆیە

نووسەران و هزرڤانانی سەر بەچینی بورژوازی، هەموو هەوڵ و تەقەلایەکی خۆیان دژی دا بە ئەرستوکراتییەکان و و لە پێناوی چاککردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتیدا وەگەڕخست. تا کۆتایی نیمەی یەکەمی سەدەی هەژدەم هەندێ سەرکەوتنیش بەدەست هات. بۆ نموونە ئازادی قەڵەم و دەربڕین کە بە پێی هەندێ یاساێن زاڵمانە زۆر سنووردار کرابوو، بە رێژەیەکی دیار و لەبەرچاو پەرەی سەند.

توندڕەوی پابەندی ئاینی تا ڕادەیەك نەما، زەوجینی پروتستانەکان ئیعتراف پێکرا و لەساڵی ١٧٥١دا ئەشکەنجەدانی تۆمەتباران لە دادگادا بەپێی قانون قەدەغە کرا. لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا (ئەنسکلوپیدیا) و نووسەرانی (ئەنسکلوپیدیا)ی وەکو دیدرۆ و دالامبر دەورێکی گرنگیان گێڕا. وێڕای هەموو کارشکێنییەکانی دەستەی حوکمڕانان، (ئەنسکلوپیدیا) سەرکەوت، سەرکەوتنی ئەو بە سەرکەوتنی فەلسەفە دەژمێردرا. نووسەرانی ئەم بەرهەمە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لە سازدانی خەڵکیدا بۆ شۆڕش.

## بەر لە رۆمانتیزم

سەدەی هەژدەیەم تەنیا سەدەی فەیلەسوفان و زانایان نەبوو، و رەوشی لێکدانەوەو تەجرەبە، تەنیا لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا بە گەرمی رەواجی هەبوو. لە ساڵی ١٧٥٠ بەدواوە بواری رەخنەگرتن لە بەردەم فەیلەسوفاندا بەرینتر بوو و بەرە بەرە ژمارەی خەڵکانی پابەندی هەست و سۆز زیادیان کرد. لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا، چاکی یان خراوی هەر بەرهەمێك بە پرگاڵی عەقڵ هەڵدەسەنگێنرا، یاسا و رێسایەکی دەوڵەمەندتر و هەمەجۆرتر لە یاسا و رێسای کلاسیك-یان بۆ ئەدەبیات دادەهێنا و رەخنەیان لەسەر بناغەی ئەو یاسا تازانە رۆدەنا. لێ لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەدا، لە جێگەی ئەم جۆرە رەخنەیە، "رەخنەی هەستەوەری" رەواجی سەند و بەتایبەتی قەناعەتیان هێنا کە فەلسەفەو "ئەندازە" شیعر بەرەو ئاکام و عاقیبەتێکی ترسناك دەبات. لەم سەردەمەدا، شاعیران و نووسەرانی جۆراوجۆر پەیدا بوون کە زۆربەیان هەمان قاڵبی کلاسیکیان بۆ بەرهەمەکانیان هەڵبژارد، لێ ناوەڕۆکی نووسینەکانیان جۆرە تازەییەکی پێوە دیار بوو، جا ئەو جۆرە خەسڵەتە تازانە ئەم هونەرمەندانەی لە هاوعەسرەکانیان جیا دەکردەوە. رەوش و رەفتاری ئەخلاقی و زەوق و سەلیقەی ئەدەبی و سەرچاوەێن سەرۆ و ئیلهامی ئەم هونەرمەندانە یەجگار جیاواز بوو لە کلاسیکەکان. ئەمە جگە لەوەی کە هەست و سۆزیان لە ئەقڵ پێ پەسندتر بوو و مایل بوون بەلای ئەو خەم و خەمینییەی کە پاشان بەسەر ئەدەبیاتی رۆمانتیکدا زاڵ بوو. لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دۆستداری ژیانی دێهاتی و تەبیعەتی کێوی و سەرەتایی بوون. ژمارەیەك لەوانە، لە جیاوازی و ناکۆکی چینایەتی بێزار بوون و کەوتنە عەودالی ئازادی و یەکسانی. لە لایەکی دیکەوە لایەنگرییان لەو یادەوەری و داب و نەریتانە دەکرد کە شەقڵ و مۆرکی نەتەوەییان هەبوو. لەم رووەوە قۆناغی (سەدەکانی ناڤین) کە مایەی نەفرەت و بێزاری کلاسیکەکان بوو، بایەخ و قەدرێکی پیدا کردوو لە بۆتەی فەرامۆشی هاتە دەرێ. شیعر چەند ناسکتر و سادەترو ئازادانەتر و راستگۆیانەتر بووایە، زیاتر باری

سەرنجی رادەکێشا. جا بۆ ئەفراندنی ئەم جۆرە بەرهەمانە کەوتنە عەودالّی سەرچاوەێن تازەتر، تا لە بری ئەدەبیاتی یۆنان و رۆمان، لەم سەرچاوە تازانەوە ئیلهام وەربگرن.

ئەم سەرچاوەو سەرمەشقانە بەزۆری لە باکوری ئەوروپاوە وەرگیرابوون. ئەفسانەکانی (ئەسکەندیناوە) و بەیتە کۆنەکانی ئەو دەڤەر و سەرزەمینە لە سالّی ١٧٥٦وە بەچاکی ناسرا و لە سالّی ١٧٦٥دا هەلّبژاردەیەکی جوانی سروودی کۆنی ئینگلیزی بلاّو بووەوە. کەشیشێکی سکۆتلاندی بەناوی (مەك فیرسۆن ١٧٣٦-١٧٩٦) لە سالّی ١٧٦٠دا کۆمەلّە پەخشانێکی سەرواداری ئینگلیزی بەناونیشانی وەرگێرانی شیعرێن ئوسیانی، شاعیری شیعری رەزمی سکۆتلاندی لە سەدەی سێیەمی زاینی دا، بلاّو کردەوە. هەرچەندە پاشان دەرکەوت کە بەشی هەرەزۆری ئەم کتێبە نووسینی خودی قەشەی نێوبراو بووەو تەنانەت لە سالّی ١٨٠٧دا دەقە ئەسلّیەکەشی لە شێوەی نامیلکەیەکدا بلاّوبووەوە، لیّ کاریگەری سەیر و موعجیزە ئاسای ئەو بەرهەمە بەسەر هەرهەموو کارە هونەری و هزرییەکانی ئەوروپای رۆژاواییەوە لە سەرانسەری نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا زەق و دیار و حاشا هەلّنەگرە.[1] ئەم کتێبە دنیا نەناسراوەکانی لە رێگەی ئەفسانەکانی قەومی کۆنی (سەلت)ەوە وێنە دەگرت و دیمەنێن غەمبار و هەستێن ناسك و خەماوی دەربارەی چارەنووسی بەشەر دەردەبڕی و خۆزیا و کەلّکەلّە ئیحساسی و ئەدەبییەکانی دوو یان سیّ نەوەی بەرجەستە دەکرد. زۆری نەبرد کە (ئوسیان)ی (شاعیری نا بینای ئەم کتێبە) بەهاوتای (هۆمەر)ی گەورەترین شاعیری شیعری رەزمی و سوارچاکی ئەوروپا هاتە ژماردن.

لە ئەلّمانیاشدا بایەخ بە ئەدەبیاتی سەدەکانی ناڤین درا، لە ئەسپانیادا سروودی کۆن و لە فەرەنسادا شیعری سەدەکانی ناڤین بوژایەوە. بەرهەمەکانی شەکسپیر بەتایبەتی لە ئەلّمانیادا رەونەق و رەواجی پەیدا کرد و لە ئیتالّیادا مەزنایەتی و شکۆی دانتی تازە بووەوە.

ئەدەبیاتی ئینگلستان رۆلّێکی گرنگی لەم دیاردەیەدا بینی. شەکسپیر، لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەمدا بەرە بەرە لە ئەوروپادا شۆرەت و ناوبانگی پەیدا کرد. پاشان فیلدینگ و ریچاردسون-یانش ناسی. کاریگەری ریچاردسون زۆر قوولّ بوو و تا کۆتایی ئەو سەدەیە بەردەوام بوو. چونکە (ریچاردسون) بەرهەمەکانی خۆی بەمەبەستی بەرەبەرەکانی خراپی و بلاّو کردنەوەی چاکە دەنووسی، جا لەم رووەوە حەزی خەلّکی بەلای نووسینی ئەخلاقیدا راکێشا. بەرە بەرە بەرهەمێن دیکەی وەکو: "شین لەسەر گۆرستانی گوندی" نووسینی گری، (ئەندێشەکان)ی هیرڤی و "شەوان"ی یانگ بۆ زۆربەی زمانانی ئەوروپایی وەرگێردران. ئەم بەرهەمانە جگە لەوەی کە لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا بە سەرەتای سەردەم و قۆناغێکی تازە دەژمێردران، سەرچاوەی ئیلهامی شاعیران و نووسەرانی فەرەنسا و هەموو ولاّتانی ئەوروپاش بوون.

ئەدەبیاتی ئەلّمان، پاش ئەو قۆناغە درەخشانەی لە بواری حەماسی و لیریکی دا کە لە سەدەکانی ناڤیندا بە خۆوەی بینی بوو، ئیدی نەیتوانی بوو بایەخ و شکۆیەك بەدەست بێنیّ. سەردەمی زێرینی شیعری ئەلّمانیش لە سالّی ١٧٥٠وە دەستی پێکرد، کە لە راستیدا سەرەتای

گۆڕانی "بەر لە رۆمانتیزم"ە لە ئەدەبیاتی ئەم وڵاتەدا. ئەم سەردەمە درەخشانە تا ساڵی ١٨٤٠ بەردەوام بوو و ئەدەبیاتی رۆمانتیکی ئەم وڵاتەشی لەخۆ گرت.

قۆناغی "بەر لە رۆمانتیزم" لە ئەدەبیاتی ئەڵماندا بە بەرهەمەکانی (کلوپستك ١٧٢٤-١٨٠٣) دەستی پێکرد. ئەم شاعیرە یەکەم کەس بوو کە لە ئەدەبیاتی وڵاتی خۆیدا، بە لاسایی کردنەوەی ئەدەبیاتی ئینگلیز، بەرهەمی ئاینی و نەتەوەیی هێنایە کایەوە، لە بەرهەمێك دا بەناوی "حەماسەی مەسیح" کە بە لاسایی کردنەوەی میلتون بیست دانە سروودی دانابوو، ستایشێکی پرشنگداری وڵاتەکەی خۆی، ئەڵمانیای کرد بوو، پاشانیش لە هەندێ شیعردا باسی خۆشەویستی وڵات و ستایشی ئاینی کرد. شیعرەکانی ئەو پیاوە راستگۆیانە بوون و بەڵام سارد بوون و چ ئاسەوارێکی بلیمەتییان تێدا بەدی نەدەکرا. کلوپستك راپەڕینێکی دژی لاسایی کردنەوەی ئەدەبیاتی فەرەنسی بەرپا کرد و شیعری ئەڵمانی خستە سەر شاڕێیەکی تازە. ئەو شاعیرە لاوانەی کە دوای ئەو، ئەم رێگەیەیان گرتەبەر ئەویان بە مامۆستاو پێشەوای خۆ لەقەڵەم داوە و زانیوە.

دوای ئەم راپەڕینە، هونەرمەندێك بەناوی (گیسفیر ١٧٨٨-١٨٣٠) کە لە شاری زوریخ-ی سویسرادا خەریکی کتێبفرۆشی و نیگارکێشی دیمەنان بوو، کۆمەڵێك بەرهەمی لە شێوەی چیرۆك و هۆزان و پەخشانی ئاهەنگدارا نووسی کە کاریگەرییەکی فرەی کردە سەر ژینگەی ئەدەبی ئەو سەروبەند و قۆناغە. بەتایبەتی یەکێك لە بەیتەکانی بەناوی (مەرگی هابیل) کە بریتی بوو لە سێ سروود، خەڵکەکەی بەتەواوەتی هێنایە جۆش و خرۆش و تەرجەمەی هەموو زمانەکان کرا. ئەو شتەی کە لەم بەرهەمەدا زیاتر سەرنجی رادەکێشا، خۆشەویستی سروشت و ژیانی شوانکارەیی و ئارەزووی شادی خەیاڵی و سۆراخ کردنی جوانی بوو لەناو ئەم ژیانە سەرەتایی و شوانکارییەدا. پاش ئەم قۆناغە ئیدی خەڵکانی وەکو گۆتە و شیلەر لە ئەدەبیاتی ئەڵماندا پەیدا بوون و بەرهەمە نەمرەکانی خۆیان نووسی.

لە وڵاتانی باکوری ئەوروپادا هەرگیز یاسا و رێساکانی کلاسیکیان وەکو تەوق لە گەردن نەکردبوو، قۆناغی بەرایی رۆمانتیزم بایەخێکی تایبەتی هەیە. لەم وڵاتەدا بیر و باوەڕەکانی رۆسۆ کارێکی زۆریان کرد. لە دانیمارك دا شاعیرێك بەناوی (ئیوالد ١٧٤٣-١٧٨١) کە لە ماوەی تەمەنی کورتی تەژی رەنج و نائومێدی بوو، لە بەشێکی بەرهەمەکانیا ئیلهامی لە حیکایەت و نەقڵە کۆنەکانی ئەسکاندیناڤی وەرگرتووە و لە بەیتێکیدا بەناوی (ئادەم و حەواو)ە لاسایی (کلوپستك)ی کردۆتەوە. ئیوالد بە گەورەترین شاعیری وڵاتی خۆی زانراوەو گەلێك لە شاعیرانی ئەسکاندیناڤی ئیلهامیان لە بەرهەمەکانی ئەوەوە وەرگرتووە. "ماسیگیران" شاکاری شاعیری ناوبراوە، ئەم بەرهەمە ژیانی خەڵکانی کەنارەکانی دەریای (باڵتیك) نیشاندەدات.

لە سوێد-ش دا راپەڕینی بەرایی رۆمانتیزم بایەخی تایبەتی خۆی هەیە. شاعیرێکی خەراباتی مەی پەرست بەناوی بیلمان، هەندێ بەرهەمی بەرجەستەی داهێنا کە دەتوانرێ لەنێو ئەدەبیاتی جیهاندا بەبێ وێنە بزانرێ. بەیتنامەکانی فریدمان (سەعاتسازی ئەفسانەیی ستوکهۆڵم) کۆمەڵە دیمەنێکی تەوس ئامێز و ئاشقانەی ژیانی رەمەکی مەردمی پایتەختی سوێدی بەرجەستە کرد.

شاعیرێکی ئەرستۆکرات زادەش بەناوی (ئوکسینسنت یرنا) کە چەند جارێك پۆستی وەزیری وەرگرتبوو، لە دوو بەیتی بەناوبانگی خۆیدا بەناونیشانی (درەو کەران) و (شەو) شەیدایی خۆی بۆ سروشت نیشانداوە، لە راستیدا هەمان رێچکەو رێبازی ئوسیان و رۆسۆ و یانگ-ی گرتۆتەبەر. ئەو شاعیرە کە لەم وڵاتەدا زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر کلاسیکەکان (توریلد-١٧٥٩-١٨٠٨)بوو. ئەویش لەژێر کاریگەریی بەرهەمەکانی (رۆسۆ) و (کلوپستك)دا بوو. و پڕ بەدڵ دەیویست کە شیعر جگە لە وەسفی سروشت و دەربڕینی هەست و نەست چ شتێکی دیکە نەبێ. بەڵام لە بری ئەوەی زیاتر بایەخ بە نووسینی دەقی هونەری بدات پتر بایەخی بە مشت و مڕ و گەنگەشە و باس و خواسان دەدا و بەرهەمێکی بەناوی (رەخنە لە رەخنان) نووسی و باسی بایەخی بەرهەمی ئەدەبی کردبوو، لە بەرهەمێکی دیکەی خۆیدا بەرنامەیەکی بۆ شیعر و نووسەری دیاری کردبوو. هەڵبەتە کاری ئەم نووسەرانە و پەیڕەوانی ئەو نووسەرانە، زەمینەی بۆ سەرهەڵدانی (رۆمانتیزم) خۆش کرد و رۆمانتیزمی سویدی لەسەر بناغەی کاری ئەوان دامەزرا.

بزاڤی (بەرایی رۆمانتیزم) وێڕای ئەوەی کە لە ئینگلستان و ئەڵمان و وڵاتانی باکوری ئەووپا یەجگار بەهێز بوو، بەڵام لەو وڵاتانەدا کە زەوق و سەلیقەی کلاسیك ریشەی داکوتابوو، باوێکی ئەوتۆی نەبوو. لە فەرەنسادا تاقە نوێنەرێکی بەرجەستەی بەرچاو ژان ژاك رۆسۆیە. روحی هەستیار و پڕ جۆش و خرۆشی ئەو نەك هەر لە لاپەڕەکانی (دان پێدانان)دا، بەڵکو لە سەرانسەری بەرهەمەکانیدا رەنگ دەداتەوەو (هیلوئیزی نوێ) دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ بەرهەمە لیریکییەکانی دواتر. رۆسۆ لە هەموو گۆڕانکارییەکانی (بەرایی رۆمانتیزم)دا کاریگەرییەکی گەورەی هەبووەو دەبێ لە سەرانسەری ئەوروپادا بە مامۆستای بێ هەڤرکی ئەم قۆناغە بژمێردرێ. لێ ئەو نووسەرانەی کە پاش ئەو هاتوون زۆربەیان بچووك و بێ بایەخ بوونە و بەرهەمەکانیان شایانی باسکردن نین. لەم بوارەدا دەبێ ناوی (بیرناردین دوسن پیر-١٧٣٧-١٨١٤) ببرێ کە دەستی دایە سەفەرێکی دوور و درێژ و لە سایەی بیر و باوەڕەکانی (رۆسۆ)دا کۆمەڵێك بەرهەمی هێنایە ئاراوە. لەناو ئەو بەرهەمانەدا تەنیا یەکێکیان بەناوی (پل وویرژینی) بایەخی هەیە. ئەم کتێبە چیرۆکی ئەڤینێکی سادەو زۆر ناسکە. هەڵبەتە بە رۆمانێکی گرنگ ناژمێردرێ و تەنیا لە رووی وەسفی دیمەنێن دەڤەرە گەرمە سێرەکان و بەرجەستەکردنی بیروباوەڕەکانی رۆسۆ لە شێوەی چیرۆك دا، و وێنەگرتنی باوەڕ و هەستی پاك و ئەڤینداری لە باوەشی سروشت دا، بایەخدارە. لە ئیتاڵیاش دا، هەرچەندە هەندێ هەوڵ بەدی دەکرێ، لێ جگە لە رۆمانی (فوسکولو) هیچ بەرهەمێکی گرینگ لە قۆناغی بەر لە رۆمانتیزم نەهاتۆتە ئاراوە، بەتایبەتی لە واری شیعردا، وێڕای دەسەڵاتی ئەدەبیاتی ئینگلستان و ئەو وەرگێڕانانەی کە ئەنجام دەدران، فەرمانڕەوایی ئەدەبیاتی کلاسیك بە هەموو گوڕوتینی خۆیەوە بەردەوام بوو. لە ئەسپانیادا شاعیرێك بەناوی (میلیندز ڤالدیس ١٧٥٤-١٨١٧) لە دەورووبەری ساڵی ١٧٥٠دا بەرهەمێکی پڕ سۆز و گودازی بە لاسایی کردنەوەی ئەدەبیاتی ئینگلستان بڵاو کردەوە. لە وڵاتانی هۆڵەندا و پۆڵەندە و مەجەڕستاندا، فەرمانڕەوایی کلاسیزمی فەرەنسا تا کۆتایی سەدەی

هەژدە بەردەوام بوو. ئەم وڵاتانە راستەوخۆ لە کلاسیزمەوە چوونە قۆناغی رۆمانتیزم. ئەدەبیاتی روسیاش، وێڕای مقاوەمەتی چەند کەسێکی کۆنەپەرست، کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی فەرەنسییەوەو نووسەرێك بە نێوی (کارامزین ١٧٦٦-١٨٢٦) کە لە پەیڕەوانی (رۆسۆ) بوو، کە لە ساڵی ١٧٩٢دا کتێبێکی پڕ سۆز و ناسك و خەمئامێزی بەناوی (ناتالی ولزی کلۆڵ) بڵاو کردەوە کە نموونەیەك بوو لە وێنەگرتنی هونەرمەندانەی تەبیعەت و شێوازێکی گەرم و جوانی هەبوو. بە شێوەیەکی گشتی (بەرایی رۆمانتیزم) بە قۆناغێك دەگوترێ، کە سۆز و سۆزداری هاتە ناو دنیای ئەدەبیات و خۆی لە بەرهەمی نووسەراندا نیشاندا. لێ نووسەرەکان بەزۆری ئەو هەست و سۆزانەیان لە قاڵبە کۆنەکاندا دەخستە بەردەم خوێنەران، و دەبێ ئەوە بگوترێ کە قۆناغ و سەردەمی رۆمانتیزم کاتێ دەست پێدەکات کە نووسەرانی قەریحەدار و بوێر تەرزە گوزارشت و دەربڕینێکی تازە بۆ هەست و سۆزەکانی خۆیان دابهێنن. هەڵبەتە ئەم حاڵەتە تازەیەی سۆز و گوداز و خەیاڵپەروەرییە، بەرە بەرەو بەشێوەیەکی خاو گەییوەتە قۆناغی نەش و نماو خەملێنی خۆی و دەبێ (بەرایی رۆمانتیزم) بە قۆناغی سەرەتایی و (مناڵی)ی رۆمانتیزم دابنرێ.

## دەسپێکی سەردەمی تازە
## لە ئەدەبیاتی ئەوروپادا

دەبێ سەرەتا و دەسپێکی سەدەی نۆزدە بە سەرەتا و دەسپێکی سەردەمێکی تازەی ئەدەبیاتی ئەوروپا، کە تا ئەوڕۆکەش بەردەوامە، لە قەڵەم بدرێ. شۆڕشی گەورەی فەرەنسا گۆمەکەی شڵەقاند و دنیای هەژاند و ئەمەش سیرایەتی کرد بۆ وڵاتانی ئەوروپا و هێز و توانا پەنهانەکانی چینی هزرڤانان و رۆشنبیرانی بێدار کردەوە. بەهۆی کۆچ و کۆچبەرییەوە زەوق و ئەندێشە جۆراوجۆرەکان ئاوێتەی یەکدی بوون، لەم سەدەیەدا مرۆڤێکی تازە هاتە ئاراوە کە تەرزی بیرکردنەوەی بە هیچ جۆرێ لە مرۆڤی سەدەی هەڤدە نەدەچوو.

وەکو لە پێشدا بینیمان بزاڤی رینیسانس لەژێر کاریگەری ئەرستوکراتدا بوو و سەردەمی کلاسیك سەردەمی یەك حکومەتی مەرکەزی بوو، چینی ئەرستۆکرات زاڵ بوو. بەڵام ئەم سەردەمە تازەیە، کە دەبێ ناوی سەردەمی رۆمانتیکی لێبنرێ بە سەردەمی چینی بورژوازی دەژمێردرا. لەم سەردەمەدا ئەرستوکراتیەت هەموو بایەخ و دەسەڵاتێکی خۆی لەدەست دا. ساڵۆنە ئەدەبییە بەناوبانگەکان و بنکەو مەڵبەندە رۆشنبیرییەکان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان بەسەر چارەنووس و بەرهەمێن هونەرمەندانەوە نەما، بەڵکو رۆژنامەێن ئەدەبی بایەخی زیاتریان پەیدا کرد، بەتایبەتی لە سی ساڵی یەکەمی سەدەدا زۆر مانگنامەی ئەدەبی گرنگ لە ئینگلستان و فەرەنسا بڵاو کرانەوە. زۆر بەرهەمی ئەدەبی، چ شیعر و چ پەخشان لە پێشدا لە رۆژنامەکاندا بڵاو دەبوونەوەو دەبوونە مایەی شۆرەتی نووسەرەکانیان. نووسەران و شاعیران سەر بە چین و توێژی جیاوازی جەماوەری خەڵك بوون و قەڵەمڕەوی بەرهەمێن ئەدەبیش فراوان بوو. زۆر کتێبان دەربارەی مێژوو و سەیاحەت و سیاسەت و هونەر و زانست و کۆمەڵناسی نووسران. پایەی کۆمەڵایەتی

هونەرمەنـدانیش بـەرز بـووەوەو تەنانـەت زۆربـەیان دەیانویسـت کـاریّ بکـەن کـە چارەنووسـی چینەکەی خۆیان و تەنانەت هەموو خەڵکی بگۆڕن. جا لەم قۆناغ و سەردەمەدا بوو کە ئەدەبیاتی رۆمانتیك لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەوروپادا، یەك لەدوای یەك سەری هەڵدا.

## قوتابخانەی رۆمانتیك

وشـەی رۆمانتیـك کـە لـە سـەدەی هەڤدەدا، لـە ئینگلسـتان دەربـارەی دەربـڕینی شـاعیرانە بـەکار دەهـات، لـە سـاڵی ١٦٧٦دا هاتـە فەرەنسـاوە. تـا ماوەیـەکی زۆر بەرانبـەر بـە (خەیاڵئـەنگێز) و (ئەفسانەیی) بەکار دەبرا و تا ساڵی ١٧٧٥ بە واتاکەی ئەمڕۆی بەکار نەهاتووە. لەو کاتانەدا کلاسیکە شکست خواردووەکان بۆ گاڵتەکردن بە لایەنگرانی رۆمانتیزم ئەو زاراوەیەیان بکار دێنا. لێ نووسەرانی تازەش ئەو زاراوەیەیان پەسند کرد و بەوپەڕی شانازییەوە بەکاریان دەهێنا.

رۆمانتیزم کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا لە ئینگلستان هاتبووە ئاراوە، پاشان بۆ ئەڵمانیا تەشەنەی کرد و پاش ماوەیەك واتە لە ساڵی ١٨٣٠دا گەییە فەرەنسا و ئەسپانیا و روسیا و تا ساڵی ١٨٥٠ بەسەر ئەدەبیاتی ئەوروپاوە فەرمانڕەوا بوو. رۆمانتیزمی فەرەنسا، لە سایەی کاریگەری رۆمانتیزمی ئینگلستان و ئەڵمانیادا هاتە ئاراوە. واتە بۆ یەکەمجار (شاتوبریان) بەرهەمی شاعیرانی ئینگلیز و (مادام دوستال) بەرهەمی شاعیرانی ئەڵمانی وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی. لە گەرمەی دامەزرانی قوتابخانەی رۆمانتیکدا لە فەرەنسا لەلایەکەوە بەرهەمێن ریچارد سون و یانگ و والپیرسکۆت و لە لایەکی دیکەوە بەرهەمێن گۆتە و شیلەر و هەروەها (کۆمیدی ئیلاهی)ی دانتە و تەورات و ئینجیل باویان سەند و کارێکی زۆریان کردە سەر وارێن ئەدەبیات و هزر. رۆمانتیزمی فەرەنسی بۆ سەرنگون کردنی کلاسیزم سوودی لە هەر هەموو ئەوانە وەرگرت. لێ رۆمانتیزمی فەرەنسی ئەگەر چی لە هەوەڵەوە لەژێر کاریگەری ئەدەبیاتی بێگانەدا بوو، بەڵام زۆر زوو وەکو قوتابخانەیەکی دامەزراو دەنگی دایەوەو هێندە کاریگەر بوو کە هونەرمەندانی وەکو (لامارتین و ئالفرەدووینیی و ئەلکساندەردۆمای کوڕ و باوك و ڤیکتۆر هۆگۆ و ئالفرەدوموسیە و سەنت بیف و جورج ساند)ی، ئەگەرچی لەباری بیر کردنەوەوە زۆر لێکدی دوور و جیاواز بوون، بەشێوەیەکی سەیر بۆلای خۆی راکێشا. ئەم جۆش و خرۆش و دەنگدانەوەیە بەجۆرێك بوو کە لە ئاخر و ئۆخری سەردەمی رۆمانتیزمدا، ئەدەبیاتی ئینگلستان و ئەڵمانیش کە ئەو رەونەقەی جارانیان بەسەر چووبوو، کەوتنە سایەی کاریگەری ئەدەبیاتی فەرەنساوە.

هەرچەندە رۆمانتیزمی ئەڵمان و ئینگلستان پێش رۆمانتیزمی فەرەنسا سەری هەڵداوە، بەڵام چونکە ئێمە مەبەستمان نووسینەوەی مێژوو نییە و زیاتر دەخوازین بنەماکانی ئەو قوتابخانەیە راڤەو و شرۆڤە بکەین، وەکو چۆن دەربارەی قوتابخانەی کلاسیکش وامان کرد، لە هەوەڵەوە دێینە سەر رۆمانتیزمی فەرەنسا وەکو قوتابخانەیەکی دامەزراو، پاشان ئەدەبیاتی رۆمانتیکی ئینگلستان و ئەڵمان و وڵاتانی دیکەی ئەوروپا دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

## بنەماکانی قوتابخانەی رۆمانتیك

ئەگەر بمانەوێ لە باس و ناساندنی ئەم قوتابخانەیەدا، کۆمەڵێك یاسا و رێسا و بنەمای جێگیر بخەینە روو، ئەوا بێ چەند و چوون دووچاری کۆمەڵێك گیر و گرفتان دەبین. چونکە رۆمانتیزم، بە پێچەوانەی کلاسیزمەوە قوتابخانەیەکی یەجگار ئاڵۆز و بەپێچ و پەنایە. قوتابخانەی کلاسیك هەندێ یاسا و بنەمای دیاری کراوی هەبوو کە زۆربەی پێشەنگانی گەورەی کلاسیك دەربارەی ئەو یاسایانە هاونەزەر بوون. بەڵام رۆمانتیکەکان بە پێچەوانەوە، زۆربەیان دەربارەی قوتابخانەکەی خۆیان، راوبۆچوونی جیاوازیان هەیە، ئەو بنەمایانەی کە یەکی خستوون، زۆرجار نامەفهووم و ناکۆکن.

ا.و. شیلگیل-ی پێشەنگی رۆمانتیزمی ئەڵمانیا لە کتێبێکی دا بەناوی (سەردەمی ئەدەبیاتی نمایشی) پێی وایە کە ئەدەبیاتی رۆمانتیك. بریتییە لە (کۆکردنەوەی دژەکان) و تێکەڵکردنی ژانرە ئەدەبییە جیاوازەکان. ئەم نووسەرە لە کتێبەکەی خۆیدا دەڵێت: "زەوقی رۆمانتیك پابەندییەکی نزیکی بەردەوامی کاروبارێن زۆر دژ و ناکۆکە. لە شێوازی رۆمانتیکدا تەبیعەت و هونەر، شیعر و پەخشان، جدیات و هەزەلیات، بیرەوەری و پێشبینی، بیروبۆچوونی ئاڵۆز و هەستێن زندوو، ئەوەی ئاسمانی و ئەوەی زەمینییە، و ئەنجام ژیان و مەرگ تێکەڵ دەکات."

لێرەدا جارێ بەراوردێك لە نێوان ئەو دوو قوتابخانەیەدا دەکەین و پاشان دێینە سەر باسی بەرنامەی رۆمانتیکەکانی فەرەنسا.

١- کلاسیکەکان زیاتر ئایدیالستن، واتە لە هونەردا دەخوازن تەنیا جوانی و باشی شرۆڤە و بەرجەستە بکەن، بەڵام رۆمانتیکەکان هەوڵ دەدەن جگە لە جوانی، دزێوی و خراپیش نیشان بدەن، وەکو چۆن "درامای رۆمانتیك" تێکەڵەیەکە لە شکۆداری و نەگبەتی، گەورەیی و نزمی، غەم و شادی.

٢- کلاسیکەکان ئەقڵ و هۆش بە بناغەی شیعری کلاسیك دەزانن، کەچی رۆمانتیکەکان پتر پابەندی هەست و خەیاڵپەروەرین.

٣- کلاسیکەکان نموونە و ئیلهامی بەرهەمەکانیان لە هونەرمەندانی یۆنان و رۆمی کۆنەوە وەردەگرن، بەڵام رۆمانتیکەکان سوود و ئیلهام لە ئەدەبیاتی مەسیحی سەدەکانی ناڤین و رینیسانس و ئەفسانەێن میللی وڵاتانی خۆ وەردەگرن و هەروەها لاسایی ئەدەبیاتی هاوچەرخی میللەتانی دیکە دەکەنەوە، وەکو چۆن لە سەدەی هەڤدەدا بەرهەمەکانی ئەرستۆ بە پایەی هەموو هزرە فەلسەفییەکان هاتۆتە ژماردن، لە سەردەمی رۆمانتیکدا زیاتر پشت بە شەکسپیر دەبەسترێ.

٤- کلاسیکەکان زیاتر لایەنگری روونکاری و بنجبڕین و رۆمانتیکەکان پابەندی رازانەوەو تەم و مژن. رۆمانتیکەکان بایەخ بە وێنەی جیاوازی رووداوەکان و بەشتە دژەکان دەدەن، لە بری ئەوەی پەنا وەبەر زمانێکی شیعری یەك ئاهەنگ و یەك نەوا بەرن، کە (بوالو) زۆر بەرگری لێ

دەکات، حەز دەکەن شیعرێك بڵێن کە زیاتر پەخشانئامێز بێ و چ لە رووی ئاهەنگ و چ لە رووی نیوەرۆکەوە، وێنەیی (تصویری) و هەمەجۆر بێ.
٥- بەرنامەی رۆمانتیکەکان بەرنامەی خەباتە و رێچکەکەیان بەتەواوەتی نێگەتیڤە. بە باوەڕی وان ئەو بەرنامەی کارانەی کە لە ئەدەبیاتدا باو بووە، رێگەیان لە ئازادی هزر و دەربڕین گرتووە. لەبەر ئەمە رۆمانتیکەکان هەموو یاسا و رێسا و بنەماو دەستوورەکانی کلاسیکیان تێکشکاندووە و توڕداوە، واتە رۆمانتیزم وەکو ڤیکتۆر هۆگۆ لە پێشەکی شانۆنامەی (ئیرنانی)دا دەڵێت، بریتیە لە (ئازادیخوازی لە هونەر)دا.

## بەرنامەی رۆمانتیزم

بەمجۆرە سەبارەت بە رۆمانتیزم بەرنامەیەك هاتە ئاراوە کە لە خوارەوە کورتەیەکی بنەماو دەستووورە بنەڕەتییەکانی دەخەینە بەردەستی خوێنەران:
١- ئازادی: ساڵی ١٨٣٠ ساڵی شۆڕشی ئەدەبییە. لەم ساڵەدا (ڤیکتۆر هۆگۆ) و هاوڕێکانی، کە پێشتر کۆمەڵە یاسا و دەستورێکیان لەو بارەیەوە بڵاو کردبووەوە، رۆمانتیزمیان وەکو قوتابخانەی ئازادی هونەر و ئازادی تاك راگەیاند و ناساند. هونەرمەندی رۆمانتیك خۆزی و پێداویستییە روحییەکانی خۆی زۆر بەلاوە گرنگە و دەڵێت ئەوەی کە ئیلهام بە هونەرمەند دەبەخشێت و بە مانا و چەمکی ژیان دەژمێردرێ (خۆشەویستی و پەیوەندییە) دەبێ ئەم پەیوەندییە ئازاد بێ. ئەگەر هونەرمەند بەهۆی گوشاری کۆمەڵگە و یاساکانی رەوشت یان هەندێ خورافاتەوە بەربەرەکانی بکرێ و توانا و بەهرەکانی بە پەنهانی بمێننەوە هەقی خۆیەتی کە دەربارەی کۆمەڵگە و یاسا ئەخلاقییەکانی کۆمەڵگە داوەری بکات و حوکمی خۆی بدات و ژینگە و ئەخلاقێك فەراهەم بکات کە بۆ نەش و نمای ئەو لەبار بێ -ئەدەبیات نابێ یاسایەك بێ بۆ سنووردار کردنی خۆشەویستی و پەیوەندییەکان. ئەدەبیات بۆی هەیە هەر گۆشەیەکی ژیان، چ جوان و چ ناشیرین، چ بەرز و چ نزم، بکات بە بابەت و کەرەستەی خۆی. دەتوانێت سوود لە هەر سەردەمێکی مێژوویی و لە هەر جۆرە دیمەنێکی دنیا وەربگرێ.
٢- کەسایەتی: هونەرمەندی رۆمانتیك، دوابەدوای ئازادبوون لە کۆت و زنجیری یاساێن کلاسیك، فەرمانڕەوایی "من" لە هونەردا جێگیر دەکات و بەزەبری هونەر، خۆزیاکانی دڵ و رەنجەکانی روحی خۆی دەردەبڕێ. لێ نابێ ئەم رەفتارەی هونەرمەندی رۆمانتیك بە نیشانەی خۆهەڵکێشانی ئەوو دووره پەرێزی ئەو لە بەشەر بزانرێ. جاران هونەرمەندی کلاسیك بۆ وەسفی "مرۆڤێکی گشتی" قارەمانێکی لەنێو ئەفسانە و مەتەڵاندا هەڵدەبژارد، بەڵام هونەرمەندی رۆمانتیك خۆی لە جێی ئەم قارەمانە ئەفسانەییە دادەنێت و دەبێ بە نموونەیەکی مرۆڤانی.
٣- هەست و سۆزان: دەبێ ئەوە بزانرێ کە لە پاڵ ئەقڵ و تەبیعەتدا، دڵ و هەستیش دنیایەکی دیکە و پێداویستیانی دیکەی هەیە. گومان لەوەدا نییە کە لە روحی ئادەمیزادا هەست لە هزر و بیر دەسەڵاتدارترە و خۆزیاو ئارەزوو لە حەقیقەت کاریگەرترە. لەبەر ئەمە دەبێ هەست و هەوەسەکانی روح -هەڵبەتە تا بکرێ لە قەڵەمڕەو چوارچێوەی ئەخلاقدا- بخرێنە بەر باس.

ئالفرە دوموسە لە ساڵی ١٨٤٢دا دەیگوت: "پێویستە وڕێنە بگوترێ!" ئەوەی پێویستە بەیان بکرێ سۆز و گوداز و هەڵچوونی شاعیرە و ئەوەی پێویستە بەدەست بهێنرێ جۆش و خرۆش و هەڵچوونی خەڵکییە.
دڵ دەبێ بێ کۆت و زنجیران قسە بکات و بێ قەید و مەرج فەرمانڕەوایی بکات. شاعیر قژی ئاڵۆزکاوی بەدەستی با سپاردووە، شانێڵێکی رەشی بەشانیا داوە، لەژێر سێبەری دار بییەکەدا و لەبەر تریفەی مانگ و لەپاڵ بورجێکی وێران و بە دڵێکەوە کە بێگومان لە ئەنجامی ڤیانێکی ناکامەوە پاکی شکاوە دەچێتە خەڵوەتی خۆیەوەو غەرقی خەون و خەیاڵان دەبێ. ئەدەبیاتی رۆمانتیك چارەو سیمایەکی وا قەراردادی خستۆتە روو و جەماوەری خەڵکی پێ ئاشنا کردووە.
خەمی رۆمانتیك بە دیتنی تێپەڕبوونی بێرەحمانەی زەمان زیاد دەکات. ئەم خەمە بەزۆری زادەی ئەو تەما و خۆزیا وەدی نەهاتووانەی دڵێکە کە لە جیهانێکی بێ هەست و بێ ئیماندا گیرۆدە بووە.
٤- هەڵاتن و سەفەر: بێزاری لە ژینگە و زەمان و رۆژگار و هەڵاتن بەرەو فەزا یان رۆژگارانی دیکە، بانگەواز بۆ سەفەری مێژوویی یان جوگرافیایی، سەفەری واقیعی یان سەفەر بە باڵی خەیاڵ، خەسڵەت و تایبەتمەندییەکی دیکەی بەرهەمێن رۆمانتیکە.
**سەفەری جوگرافیایی:** نووسەری رۆمانتیك تەیری فیکر بۆ سەرزەمینانی دیکە و وڵاتانی دوورە دەست هەڵدەفڕێنێ. هەندێ جار خوێنەر لەگەڵ خۆیدا بۆ رۆژهەڵات دەبات و هەندێ جار لەگەڵ (ئاتولا)دا لە خەڵوەتگەیەکی جوانی قەڵەمڕەوانی نەناسراوی ئەمریکادا سەرگەردانی دەکات، جا لەم پێودانگەوەو بەردەوام جۆرە کەڵکەڵەیەکی هەڵاتن بەرەو وڵاتانی دوورە دەست لە بەرهەمێن رۆمانتیك دا بەدی دەکرێت.
**سەفەری مێژوویی:** "موسە" خەونی سەردەمی زێڕینی پریکلیس دەبینێ، جا نەك هەر ئەو بەڵکو هەموو رۆمانتیکەکان دەچنە سۆراخی سەدە پڕ هەست و شکۆکانی رینیسانس. بۆیە زەمانی رووداننی زۆربەی شانۆنامە رۆمانتیکییەکان هەمان سەردەم و قۆناغە: "هانری سێیەم"، "ئێرنانی"، "لۆرانزاچیو" و بیست شانۆنامەی دیکە کە لە قۆناغی رۆمانتیزمدا نووسراون و لە سەدەکانی ناڤیندا روو دەدا.
جگە لەم سەفەرە مێژوویی و جوگرافیانە، سەفەرێن واقیعیش لە بەرهەمی رۆمانتیکەکاندا رەنگیان داوەتەوە. (موسە) سەفەری ئیتالیا، (مریمە) سەفەری ئەسپانیا، (ئەلکساندەر دوما) سەفەری ئیتاڵیا و ئەسپانیا، (تیوفیل گوتیە) سەفەری ئەسپانیا و رۆژهەڵات و روسیا و ئیتاڵیا، (شاتوبریان) و (لامارتین) و (نیرڤال) و خەڵکی دی هەمووان سەفەری رۆژهەڵاتیان کردووەو بیرەوەری ئەم سەفەرانە لە بەرهەمەکانیاندا رەنگی داوەتەوە.
هەموو ئەم سەفەرە خەونئامێزانە لە پێناوی خۆدۆزینەوەی ژینگەی جوان و بەشکۆ و رەنگێن تازەو ئەو جوانییە ئایدیالییە بووە کە هونەرمەندی رۆمانتیك بەتاسەوە بووە بیگاتێ.
٥- دۆزینەوەو دیتن: سەرگەرمی و سەرقاڵی بەشکۆ و جوانی، هەرگیز رێگر نییە لەوەی کە هونەرمەندی رۆمانتیك لە بیری کەشف و دۆزینەوەی راز و نهێنیان دا بێ و بخوازێ خۆی لە

هەموو سرەکانی جیهان هەڵقورتێنیٚ. (سنت بوف)ی گەورە رەخنەگری سەدەی نۆزدە ئەم حاڵەتە ناودەنیٚ "ئارەزووی گەورە بۆ دۆزینەوەو کەشف کردنی نادیارەکان". هونەرمەندی رۆمانتیك خەیاڵ و هیواو خۆزیا و پەرجوو لە جێی حەقیقەت دادەنیٚ و زیاتر پابەندی تەسەور و وێنایە تا پابەندی تەقلید بیٚ. هونەری خۆی ئاوێتەی زێدەرۆیی دەکات، یانی ئەوەی کە هەیە نایڵیٚ، بەڵکو باسی ئەوە دەکات کە پێویستە هەبیٚ. رۆمانتیزم جۆرە "دەرون بینی"یەکی موبالەغە ئامێزە. و ئەم پێناسەیەی کە (لامارتین) بۆ شیعری کردووە، بە باشترین شێوە ئەم بابەتە دەردەبڕیٚ:

"بێگەردترین شتێك کە لە دڵی مرۆڤدایە و خودایی ترین هزرێك کە لە مێشکی مرۆڤدایە و ئاوێتە کردنی بەشکۆترین شتێك کە لە تەبیعەتدا هەیە، لەگەڵ خۆشترین دەنگدا دەکاتە شیعر".

٦- جادووی ووشە: (وشە) تەنیا دەربڕی یەك مەبەستی سادە نییە، بەڵکو خۆی لەخۆیدا بایەخ و بەهایەکی تایبەتی هەیە و دەبیٚ ئاگاداری چەمکی خەیاڵئەنگێز و بایەخی سەدا و ئاهەنگی ووشە بین. ئێستا دەبیٚ لە هەموو شتیٚ زیاتر لە پەیوەندی ووشە لەگەڵ یەکتر و ئەو جۆش و خرۆش و بیرەوەرییانەی کە هەر وشەیەك دەیوروژێنیٚ ورد ببینەوەو رابمێنین. لە ساڵی ١٨٢٠دا هێشتا (وشە) لە کۆیلەیەك زیاتر نەبوو. خەڵکی لە ساڵی ١٨٣٠دا ئازادیان کرد و لە ساڵانی دواتردا، پایەی فەرمانڕەوایی وەرگرت. (ڤیکتۆر هۆگۆ) لەم بارەیەوە کۆمەڵێك وتاری نووسیوەو دەڵێت: (وشە بریتییە لە قسەو قسەش خوایە.)

بەمجۆرە بایەخدان بە بەهای ووشەێن جیاواز، قاموسی رۆمانتیکەکانی دەوڵەمەندتر کرد و قاییل بوون بە کۆمەڵێك ووشەی سادەو دیاریکراو کە بەشێك بوو لە بنەمای کاری کلاسیکەکان، تەرك کرا.

بە گوێرەی پێناسەی کلاسیك، شیعر بریتییە لە هونەری هەڵبەستن. ئەمە لە کاتێکدایە کە زۆربەی نووسینە نەزمدارەکان ناکریٚ بە شیعر بزانرێن، بەڵام زۆر نووسینی پەخشان هەیە لە راستیدا شیعرەو نووسەرانی ئەو پەخشانانە دەبیٚ بە شاعیر بزانرێن، بەمجۆرە شیعر لە بری ئەوەی بە ژانرە نووسینێکی تایبەتی ناوبنریٚ، واچاکترە بە هەستێکی جوانیناسی و حاڵەتێکی روحی تایبەتی وەربگیریٚ. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی رۆمانتیزم جۆرە هەوادارییەکە لە مەسیحیەت. ئاین کە فەیلەسۆفانی سەدەی هەژدەیەم دژی وەستابوونەوە، لەناو رۆمانتیکەکاندا وەکو پێداویستیەکی روحی و دەرونی ژیایەوە. رۆمانتیکەکان کە لە رێگەی هەست و سۆزەوە بەرەو ئیمان دەچوون، لە روانگەی (هونەرییەوە) دەیانڕوانییە ئاین. (شاتۆبریان) مەسیحیەتی نەك وەکو دروست ترین ئاینان خۆشدەویست، بەڵکو وەکو شاعیرانەترین ئاین خۆشی دەویست، هەر لەو روانگەیەشەوە (شکۆی مەسیحیەت)ی نووسی. کڵێسای (گوتیك) نەوەك وەکو مەرکەزێك کە بەشەریەتی بەڕێوەدەبرد، بەڵکو وەکو شاکارێکی تەلارکاری کە دڵان دێنێتە جۆش و خرۆش، بەرجەستە کردووەو جا لە سایەی هەمان مەسیحیەتدا بووە کە شیعری رۆمانتیك بە پێچەوانەی شیعری کلاسیك، لایەنی "دەروونی و ناوەوەی گرتەخۆ. تەنانەت رۆمان کە پتر لە هەر ژانرێکی

ئەدەبی دیکە لایەنی "دەرەکی" هەیە، رێی لە خەیالاتی بەربلاو و هەستی توندی نووسەرانی رۆمانتیك پێ نەگیرا.
ڤیکتۆر هۆگۆ خۆی ناوناوە "بیرەوەری روحێك". واچاکە ئەم ناوە لە سەراپای بەرهەمێن رۆمانتیك بنەین.
لەم شیعرانەدا، زیاتر گەلای زەردی پایز بەرچاو دەکەوێ تا سەوزی بەهار، پتر سەدای غەمئامێزی زەردەپەڕی ئێوارە جیلوە دەکات تا ئاهەنگی پڕ چالاکی و جۆشی بەیانیان. لە جیاتی روناکی، سێبەر و تاریکی حوکمڕان و زاڵە.
ئەم خەم و خەیاڵە، وەکو نەخۆشییەکی نادیار، بە بەردەوامی لە شیعری رۆمانتیکەکاندا دەنگ دەداتەوە. هەڵبەتە رەگی ئەم دوو دڵی و نائومێدییەش دەچێتەوە سەر هەمان ئەو لایەنی هەستپەروەری و جوانی خوازییەی کە لە مەسیحیەتدا دەبینرێ.
ئەو مەسیحیەتەی کە لە جیاتی ئەوەی خەیاڵ و دوودڵی وەلاوە بنێ، زیاتری دەکات.

## نەخۆشی سەدە

پاش کاریگەری و بارگرژی ترساوەری شۆڕش و پاش ئەوەی حەماسەو سەرکەوتنە خوێناوییەکانی لەنێو بەدبەختی و نەگبەتییەکی گەورەدا دادەمرکێتەوەو شوێنی خۆی بۆ ئیمبراتۆری چۆڵ دەکات، شاعیری رۆمانتیك کە لە بەرانبەر ئەم دەورە غەریبەدا چارەنووسی خۆی دۆڕاندووە، پەنا بۆ دەروون و ناخی خۆی دەبات. لەم جیهانی ناخ و ناوەوەیەدا، یەکەم شتێك کە شاعیر رووبەرووی دەبێتەوە، وجوودێکە کە بەرەو فەنا دەڕوات و هیچ رێگەیەکی گەڕانەوە نییە. ئەم شاعیرە کە سوودی لە لایەنە ئەقلانی و رێنوێنیکارەکانی مەسیحیەت وەرنەگرتووە، هەست دەکات کە خەمێکی خەست رەگ و ریشە لە دڵیدا دەهاوێ. جا بۆ دڵدانەوەو تەسەلای خۆی، پێی وایە دەبێ هەموو ساتێك لە بیری باشترین تەرزی ژیانی مومکیندا بێ، بۆیە عەودالی ئەو فاکتەرە خەیاڵییانەیە کە ئەو جۆرە ژیانەی بۆ دابین بکات. لەبەر ئەمە رۆمانتیزم، بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە، عەودالی گەیشتن بە سەرزەمینانی ئایدیالییە.
نەخۆشی (ڕنە)ی رۆمانە بەناوبانگەکەی شاتوبریان، بێ دەرمانی روحێکە کە لە بۆشاییدا لەقەفرتێیەتی، نازانی چی دەوێ، جارێ دەیەوێ لە جەستەی خۆی بێتە دەرێ و هەڵێ، و گاڤێ دەخوازێ هەموو بوونەوەران لە خۆیدا بتوێنێتەوە. ئەم نەخۆشییە کە (نەخۆشیی سەدە)ی ناوە بە شێوەو قاڵبی جیاواز دەردەکەوێ. (ئوبرمان)ی قارەمانی سینانکور کە دووچاری خەیالات دەبێ و دەداتە کێوو بیابانان و (ئەدۆلف)ی قارەمانی بەنجامین کونستانت کە بە تەجرەبەیەکی تاڵ، چرۆی ژیانی خۆی دەژاکێنێ، و قارەمانانی دیکەی لەم بابەتە، لەم قافڵەی خەیالاتەدا زۆرن، کە بە هۆشیاری و ئاگاییەوە رەنج دەکێشن و لەزەت لە ئازاردانی خۆ دەبینن، و لامارتین-ش لە رەخی دەریاچە خەیاڵ ئەنکێزەکاندا دووچاری خەیالات دەبێ.

## زڤرین بۆ سەدەکانی ناڤین

وەکو لە سەرێرا ئاماژەمان کرد، رۆمانتیزم خۆی بە پابەند نازانێ کە پەیرەوی چەند بنەمایەکی دیاریکراوی حیسابکراو بکات، هەروەها سوور نییە لەسەر ئەوەی کە وەکو کلاسیزم لاسایی ئەدەبیاتی سەردەم و قۆناغێکی دیاریکراو بکاتەوە. بەلاَم لە هەمان کاتدا دەخوازێ تەبیعەت و سروشت، نەك بەو شێوەیەی کە نووسەرانی کلاسیك سنوورداریان کردووە، بەڵکو بە شێوە سەرەتایی و خۆڕسکەکەی خۆی وەسفی بکات.

لەبەر ئەمە روو دەکاتە ئەفسانەو سروود و حەماسە گومناو و کۆنەکان. سەدەکانی ناڤین بە شیعرە لیریکییەکانییەوە، بە سروود و گۆرانییە ئاشقانەکانییەوە، بە سوارچاکی و ئەفسانەکانییەوە، بە زیندان و ژێرزەمینەکانییەوە، بەکەشیشە گوناهکارەکانییەوە، بە کۆڕی عەیش و نۆشەوە، بە کۆشك و تەلارە پڕ رەمز و رازەکانییەوە، سەرنجی هونەرمەندانی رۆمانتیك رادەکێشێت و لە ناکاودا دێتە ناو ئەدەبیاتی رۆمانتیکەوە. هۆگۆ (هان دیسلاند) و (هۆنراوان) دەنووسێت و (نوتردامی قەمور) کە بەهێزترین بەرهەمی پەخشانی ئەوە بە شێوەی حەماسەی (گوتیك) دادەهێنێ. چەند کلاسیزم لە سەدەکانی ناڤین بێزارە، رۆمانتیزم ئەوەندە مەفتون و شەیدایەتی.

## لە جیهانی شانۆدا

مەیدانی کێشمانەکێشی نێوان کلاسیزم و رۆمانتیزم بواری شانۆ و شانۆکارییە. ڤیکتۆر هۆگۆ لەساڵی ١٨٢٧دا پێشەکییەکی بۆ درامای (کرمول) نووسی و ئەو ململانێیەی راگەیاند و دوابەدوای ئەوە، شەڕی واقیعی لەسەر نمایش و نواندنی درامایەکی دیکەی هۆگۆ بەناوی (ئێرنانی) دەستی پێکرد.

کلاسیکەکان حەقیقەتیان تەنیا لە یەك لاوە دەدایە بەر سەرنج و ئەگەر ئەم حەقیقەتە لەگەڵ نموونەیەکی دیاریکراوی جوانیدا نەگونجایە، بێ ئینسافانە توڕیان دەدا. رێیان نەدەدا ئەو عەیبانەی کە لە ژیاندا بەدی دەکران، یان شتە ناشیرینەکانی ژیان بێتە سەر شانۆ، بەلاَم (درامای رۆمانتیك) دەیویست وەکو تەبیعەت رەفتار بکات، دەرگای شانۆی بۆ هەموو شتەکانی ناو ژیان کردەوە.

لایەنی تاك و تاکگەرایی لە نك کلاسیزم هیچ جۆرە بایەخێکی نەبوو. ئەم قوتابخانەیە تەنیا گرنگی بە سیفەتە گشتییەکان دەدا. لە شانۆی سەدەی هەڤدەدا (حەسوودی) و (پیسکەیی) هەبوو، بەلاَم درامای سەدەی نۆزدەیەم (پیاوێکی حەسوود) یان (پیاوێکی پیسکە)ی بە هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە دەهێنایە سەر شانۆ.

قارەمانانی کلاسیك لە دنیایەکی ئایدیالیدا دەژین. سەر بە هیچ سەردەم و وولاَتێك نین، و هونەرمەندی کلاسیك خۆی لەوە دوور دەگرێ لە مۆرگ و شەقڵی سەردەمێك یان ژینگەیەکی تایبەتی بە قارەمانەکانی ببەخشێت. دیمەن و شانۆ تا بێ مۆرك تر بێ، بۆ هونەری موجەڕەد و

رووتی تراژیدی گونجاوتره، و ئەم قارەمانانە وەکو روحێن رەهان و کات و شوێن بەهیچ کلۆجێ کاریان تێ ناکەن. رۆمانتیزم لە بری سیما ئایدیالییەکانی کلاسیک، کەسانێك دادەنێ کە ژیانی فەردی و تایبەتییان هەیە و دەکەونە ژێر کاریگەری ژینگەو سەردەمی خۆیانەوە.

جا بۆیە هونەرمەندی رۆمانتیك، بەزەبری روونکردنەوەی تایبەتی و دیار قارەمانی خۆی دەناسێنێ و بەرجەستەی دەکات. (ڤیکتۆر هۆگۆ) لە کۆتایی پێشەکی شانۆنامەی (کرۆمویل)[٢]دا دەڵێت: "شانۆ و تەمەشاخانە، جامی جیهان نمایە کە هەرچی لە دنیا و مێژوو و ژیانی بەشەردا هەیە دەبێ لەوێدا رەنگبداتەوە... لێ بە زەبری عاسای جادوو ئامێزی هونەر... جا لەبەر رۆشنایی هەمان دارعاسای ئەفسوون ئامێزدایە کە خودی ڤیکتۆر هۆگۆ دەڕوانێتە هەر لایەك دزێوی و جوانی، (کازیمودو) و (ئەسمرالدا)– قارەمانانی نوتردامی قەموورن– وەکو رەمزی رۆمانتیزم لەپاڵ یەکدیدا دەبینێ. لە (ماریۆن دولۆرم)دا ئارەزووی سۆزانییەت و ئەڤینی پاك، لە (لوکریس بۆرژیا)دا تامەزرۆیی خۆینخۆری و مەحەبەتی دایکایەتی، لە (تریبولە)دا لیبۆکی خایەن و بابی میهرەبان دەخولقێنێ.

بەڵگەکانی پێشەکی (کرۆمویل) ئەگەر بە گوێرەی پێوەری ئەمڕۆ مشت و مڕ هەڵبگرێ و کەسانێك قەبوڵ یان رەفزی بکەن، ئەوا بۆ سەردەمی خۆی بەکارێکی گەورەی سەلماوی بێ چەند و چوون دەژمێردرا. بڵاو بوونەوەی ئەم پێشەکییە لە فەرەنسادا راپەڕینێکی بەرپا کرد کە هاوتای راپەڕینی (رینیسانس)بوو، و خوێنێکی تازەی خستە دەماری بزاڤی رۆشنبیری وەختەوە. پاش نمایش کردنی پڕ هەراو هەنگامەی (ئێرنانی)، شانۆنامەێن دیکەش خرانە سەرشانۆ. رۆژی ١٧٣١/٥/٣ درامای (ئەنتونی)ی ئەلکساندەر دۆمای باوك و لە رۆژی ١٨٣٥/٢/١٣ (شاترتون) ئالفریدوویني نماییش کران. ئەم درامایانە بە نموونەی زیندووی ئەو گوتانەی هۆگۆ دەژمێردران کە لە پێشەکی (کرۆمویل)دا گوتبوونی، و ئەو سەرکەوتنەی کە لە ئەنجامی نماییشی ئەو کارانەوە بەدەست هات وەکو فەتحی (ینا) و (ئەستەر لیتز) دەنگی دایەوەو لە بیری خەڵکیدا مایەوە.

## رۆمان و رۆمانتیك

وەکو لە فەسڵی رابردوودا بینیمان، نووسەرانی کلاسیك بەلای رۆماندا نەدەچوون و لە قۆناغی کلاسیك دا رۆمان بایەخێکی گرنگی نەبوو. بەڵام لە سەردەمی رۆمانتیك دا، ئەم بابەتە رێك پێچەوانە بووەوەو رۆمان لە چاو هەموو ژانرە ئەدەبییەکانی دیدا، بایەخێکی تایبەتی پەیدا کرد. نووسەری رۆمانتیك خۆی کرد بە بابەتی رۆمان و حاڵەتە کەسایەتی و رۆحییەکانی خۆی شرۆڤە کرد و بەمجۆرە بۆ یەکەمجار (رۆمانی شەخسی personal Roman) هاتە ئاراوە. کەڵکەڵەی شرۆڤە و وەسفی رووداوی سەرنج راکێشی رابردوو (رۆمانی مێژوویی) داهێنا و دەرکی پەیوەندێن ئاشقێنی و ژیاندۆستی بووە مایەی پەیدابوونی (رۆمانی ئەڤینی).

وەکو بینیمان درامای رۆمانتیك بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتن، ململانێیەکی سەختی لەگەڵ تراژیدیای کلاسیکدا کرد، بەڵام سەبارەت بە رۆمان پێویست بەو ململانێیە نەبوو. چونکە نە

کلاسیزم بایەخی بە رۆمان دەدا و نە سنور و لەمپەر و کۆسپ لە بەردەم رۆماننووساندا هەبوون تا خەبات لە پێناوی لابردنیاندا بکرێ.
ئەو رۆماننووسانەی کە لە سەردەمی رۆمانتیکدا هاتنە مەیدان، دەستیان دایە هەموو جۆرە رۆمانێك، بە ئارەزووی خۆ بابەتیان هەڵبژارد و رۆمانیان لە بارەیەوە نووسی. بەڵام شێوەو قاڵبی ئەم رۆمانانە بە هەموو فۆرمێ دادەڕێژرا، زیاتر بە مەبەستی رەنگدانەوەی روحی نووسەر بوو.
رۆمانی شیکاری و دەروونیش لەم بوارەدا کاریگەرییەکی گرنگی هەبوو. (رنە)ی شاتوبریان و (ئوبرمان)ی سینانکورد و (ئادولف)ی بەنجامین کونستانت کە زادەی (نەخۆشی سەدە)بوون، لە ریزی ئەم جۆرە رۆمانانە دادەنەن. دەتوانرێ بگوترێ کە شا رۆمانی ئەم رۆمانە سایکۆلۆژیانە (شەهوەت– volupte)ی سەنت بیفی کەڵە رەخنەگرە.
رۆمانتیزمی ڤیکتۆر هۆگۆ لە پەخشاندا بەهێزترە. لە (خەندەلێو)دا دزێوی دەرەوەو جوانی ناوەوە لە یەك شوێندا کۆ دەکاتەوە. لە (بێنەوایان)دا کێشمانەکێش لە گەڵ نەحسییەکانی یاسادا نیشاندەدا. لە (دواڕۆژی مەکحومێك)دا ئازار و پەژارەو نیگەرانی لە تەحەمول بەدەری روحێکی نائومێدی نەگبەت بەرجەستە دەکات و لە (کرێکارانی دەریادا) شەڕ دەگەڵ هێزێن هەو سارپچریوی تەبیعەتدا نیشان دەدا. هەموو ئەم رۆمانانە کە بە پەخشانێکی لیریکی و رەزمی و نمایشی نووسراون، زادەی خەیاڵی سەیر و نائاسایی هۆگۆن. بەرهەمەکانی (لامارتین) وەکو بارانی بەهارێکن کە دوای شەوێکی تۆق ئاڵۆز، لەگەڵ هەتاوێکی خۆشدا ببارێن. لە (روفائیل) و (گروزیلا)دا عەشق و مەحەبەتی خۆی شرۆڤە دەکات و لە (ژنویو) و (بەردتاشی سن پوان) خۆشەویستی خۆی بۆ تەبیعەت دەردەبڕێ.
(ئالفرەدوموسە) لە کتێبی (دانپێدانانەکانی یەکێك لە رۆڵەکانی زەمان)دا بەڵگەیەکی بنجبڕ دەربارەی (نەخۆشی سەدە) و ژیانی دەرونی بەدەستەوە دەدات.
هەموو تایبەتمەندییەکانی رۆمانتیزم لەو رۆمانانەدا کە باس کران بەدی دەکرێن، بەڵام زیندووترین نموونەی رۆمانی رۆمانتیك لە بەرهەمەکانی جۆرج ساندا دەبینرێ. ئەم خانمە هونەرمەندە کە سەربهووردی خۆی لە بەرهەمەکانیدا بەرجەستە کردووەو ئەوەی لە کتێبەکانیدا تۆماری کردووە لە ژیانی رۆژانەو واقعیشدا مومارەسەی کردووە، یەکێکە لە دیارترین نوێنەرانی رۆمانتیزم کە ئارەزووی بێ پایان و لە دامرکانەوەنەهاتووی روحی رۆمانتیك و خەیاڵاتی بەختەوەری و ئەڤینداری و جۆش و خرۆشی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە. جۆرج ساند رستەیەکی هەیە کە هەقە بە (دەستووری رۆمانتیزم) دابنرێ. رستەکەش ئەمەیە: "ئێمە نەوەیەکی بەدبەختین. بۆیە ناچارین کە بە درۆیەکانی هونەر، خۆمان لە حەقیقەتەکانی ژیان دوور بگرین."
رۆمانی (Elleetlul). بابەتی هەموو بەرهەمە رۆمانتیکەکانی جۆرج ساند پێکدێنێ. ئەو لە هەموو رۆمانەکانی خۆیدا لە (ئیندیانا)وە بیگرە تا (Jacques) و (lelia) ئاشقێنییەکانی خۆی لەگەڵ (ئالفرەدوموسە)دا شرۆڤە دەکات. نووسەری ئەم بەرهەمانە هەندێ جار یاخییە و هەندێ جار خۆی دەخاتە بەختی تەسلیم بوون و رەزامەندییەوە، بەردەوام نیگەرانە و نووسینەکانی ئەو زیاتر خەیاڵات و بیرەوەریین و لە شێوەی رۆماندا داڕێژراون.

وێڕای ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان رۆمانی (رۆمانتیک) و رۆمانی (ریالیست)دا هەیە، دەبێ رۆمانی (رۆمانتیک) بە پێشەکییەك بۆ رۆمانی (ریالیست) بێتە ژماردن. پەیوەندی بە هاوئاهەنگی لەگەڵ کات و شوێندا، ئاوڕدانەوە لە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵ، هەندێ لەو خاڵانەن کە پەیوەندی نێوان ئەم دوو جۆرە رۆمانە بەرهەم دێنن، و وەکو چۆن لە رۆمانێن کۆمەڵایەتی رۆمانتیك دا هەندێ نیشانەی سەرهەڵدانی ریالیزم دەبینرێ، هەندێ بەرهەمی گەورە نووسەرانی ریالیستی وەکو بالزاك و ستندال-ش لایەنی (رۆمانتیکیان) هەیە.

## ئاوابوونی رۆمانتیزم لە فەرەنسادا

ساڵی ١٨٣٠ کە بەساڵی لوتکەی رۆمانتیزمی فەرەنسا دەژمێردرێ دەبێ لە هەمان کاتدا بە سەرەتای ئاوا بوونی ئەم قوتابخانەیە بژمێردرێ. چونکە لە ئەنجامی ئەو ئاژاوە سیاسییانەی کە لەم ساڵەدا لە فەرەنسا روویدا، ئەو داوەی کە هەڵسوڕێنەرانی ئەم قوتابخانەیەی پێکەوە گرێ دەدا پچڕا و شیرازەی قوتابخانەی نێوبراو تێکچوو.

هەڵسوڕێنەرانی ئەم قوتابخانەیە پەرت و بڵاو بوونەوە، چونکە وەزع و حاڵێك هاتبووە ئاراوە کە وای دەخواست، لەو زەمانەدا زۆربەی هونەرمەندان راستەوخۆ کاریان دەکرد، لامارتین کە بە کەسایەتییەکی بەرجەستە و دیاری ئەم قوتابخانەیە دەژمێردرا خەریکی سیاسەت و کاری سیاسی بوو، کە لە ساڵی ١٨٣٤دا بە نوێنەری ئەنجوومەن هەڵبژێردرا بە تەواوەتی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم قوتابخانەیەدا بچڕی. ئالفرەدوموسە لە ساڵی ١٨٣٢دا کتێبێکی بەناوی (lettresde Dupulset contonet) بڵاو کردەوە کە جیابوونەوەی ئەو لە قوتابخانەی رۆمانتیك نیشاندەدات. هەروەها مەیخۆری و رابواردن بڕستی لێبڕی و بەر لە پیری کوشتی.

ئالفرەدوینیی لە ساڵی ١٨٣٧دا لەگەڵ ڤیکتۆر هۆگۆدا تێك چوو بیروباوەڕی گۆڕا.

لەم بەینەدا تەنیا ڤیکتۆر هۆگۆ تا ساڵی مردنی خۆی ١٨٨٥ لەسەر نووسین و شیعر گوتن بەردەوام بوو. ئەویش لە ساڵانی ١٨٤٣-١٨٥٤دا بەبۆنەی مەرگی کچەکەیەوە بێدەنگ بوو، لێ کە لە ساڵی ١٨٥٥دا دووبارە دەستی بە کاری ئەدەبی کردەوە، دەورووبەری چۆڵ بوو و هیچ کەسێکی لە دۆستان و هاوکارانی خۆی نەبینی. لە ساڵی ١٨٤٠دا (سەنت بوف)ی گەورە رەخنەگری بەناوبانگی رۆمانتیزم بەتەواوەتی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم قوتابخانەیەدا پچڕی، تەنانەت لە ئاخر و ئۆخری تەمەنی خۆیدا حاشای لە هاوکاری پێشووی خۆی لەگەڵ رۆمانتیکەکاندا کرد. دەبێ ئەوە بگوترێ کە لە ساڵی ١٨٤٠ بە دواوە دیوارەکانی کۆشکی رۆمانتیزم بەرەو وێرانی و داروخان چوون.

## ئەدەبیاتی رۆمانتیك
## لە ولاّتی دیکەدا

**لە ئینگلستاندا:**

(شاعیرانی دەریاچە) یان (لیکیستەکان) دەستەیەکی بچووك بوون لە شاعیرانی ئینگلیزی کە لە دەوروبەری دەریاچەکانی باکوری رۆژاوای ئینگلستان خڕ بوو بوونەوەو لە ساڵی ۱۷۹۸وە تا ساڵی ۱۸۱٥ خالیسەترین شیعری رۆمانتیکییان بەرهەم هێنا. بەناوبانگترین شاعیری نێو ئەم دەستەیە (ویلیام وردز ورپ ۱۷۷۰–۱۸٥۰) بوو کە (شاعیری تەبیعەت)ی پێ دەبێژن. وردز ورپ لە سەردەمی شۆڕشی گەورەدا سەفەرێکی درێژی بۆ فەرەنسا کرد و لە نزیکەوە ئاشنا و هۆگری شۆڕش بوو. هەڵبەتە ئەم پەیوەندییە زۆری نەبرد، لێ بووە مایەی ئەوەی کە شاعیری ئینگلیزی، پاش گەڕانەوە بۆ ولاّتی خۆی و ئاکنجی بوون لە کەناری دەریاچەکاندا – هەرچەندە کەسێکی موحافەزەکار بوو– ببێ بە دۆستی هەژاران و دۆستداری ئازادی. هەندێ لە شیعرەکانی کە تایبەتن بە وەسفی جووتیاران و بەشێوەیەکی سادەو لیریکی نووسراون، ناسکی و جەزبەیەکی تایبەتیان هەیە. شیعرە سادەو رەوانەکانی کە یەك پارچە هەستی پاك و لێکچوونی بەرز و بالاّن، نموونەیەکی بەرزی رۆمانتیزمی ئەوروپان.

شاعیرێکی دیکەی ئەو دەستەیە (سەموئیل تایلر کولریج ۱۷۷۲–۱۸۳٤)ە کە ژیانێکی بێ سەروبەری هەبوو. سەفەرێکی ئەڵمانیای کرد و لە نزیکەوە ئاشنای بیروبۆچوونی نووسەرانی ئەو ولاّتە بوو. زۆر خوتبەی ئەدەبی داو چەندین وتاری رەخنەوانی و فەلسەفی نووسی. ئەم پیاوە ئالوودەی ئەفیون بوو، و ئەفیون باشترین سالاّنی تەمەنی بەبادا دا. روحێکی لاواز و زەینێکی ئاڵۆزی خەوناوی هەبوو. لە شاعیری دا هونەرمەندێکی بێ چەند و چوون بوو. یەکێك لە بەیتەکانی ئەو کە ناوی (سەربهووردی دەریاوانی پیر)ـە شاکاری شیعرێن رازئامێز و پڕ کول و کۆڤانی رۆمانتیکە کە لە هەمان کاتدا مرۆڤدۆستیەکی قووڵی تێدا بەدی دەکرێت.

یەکێکی دی لە شاعیرانی رۆمانتیکی ئینگلیزی کە لە کاریگەرییەکی قووڵی لە ئەدەبیاتی رۆمانتیکی ئەوروپادا هەبووەو خەڵکێکی زۆر پەیرەوییان کردووە (لۆرد بایرون ۱۷۸۸–۱۸۲٤)ـە. ئەم شاعیرە ژیانێکی پڕ لە بەسەرهاتی هەبووەو لە گەنجیدا دەستی دایە گەڕان و سەفەران و لە یۆناندا شانبەشانی خۆیبوونخوازان جەنگیوەو لە تەمەنی ۳٦ ساڵیدا لە شەرگەدا کوژراوە. تەمەنی کورتی پڕە لە سەرەڕۆیی و بێباکی.

غروری جۆشدار و عەشقی ئازادی لە هەموو بەرهەمەکانیدا دەبینرێ. قارەمانە جۆراوجۆرەکانی ئەو لە راستیدا خۆین و سەرانسەری شیعرەکانی لێوانلێوی ئاشقێنی و ڤیانن.

کاریگەری و دەسەلاّتی بایرۆن لە ئەوروپادا گەلەك بەلەز و بێ وێنە بوو. بایرۆن بۆ خوێنەرانی بێ شوماری ولاّتانی جیاوازی ئەوروپا نموونەی رۆمانتیزمی پڕ جۆش و خەون ئامێز و رەشبین و نائومێد و لە هەمان کاتدا پڕ بریق و باق و درەخشان و یاخی و بێباك و سەرەرۆ و سەرسامی ئامێز بوو. لە سالاّنی ۱۸۱٥–۱۸٥۰دا هەموو لاوانی ئیحساساتی (هەستپەروەر) دووی بایرون

کەوتن. تەنانەت دەشێت بگوترێ کە کاریگەری ئەو لەسەر چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەی وڵاتانی جیاواز زۆر قووڵتر و پایەدارتر بووە لە کاریگەری (رۆسۆ).

هەڵبەتە دەبێ لەم وارەدا یادی (شیللی ١٧٩٢-١٨٢٢)ش بکرێتەوە. ئەم شاعیرەش کە بە گەنجی مرد، خودانی روحێکی تەژی ڤیان و ئارمانجان بوو، لە سروشت دا نقووم دەبوو و لەزەتی لێ دەبینی، بەڵام زیاتر تیرەی بەشەری خۆش دەویست و دڵسۆزی بۆ دەکرد، لایەنگری شۆڕش و کودەتا بوو لە هەموو وارەکانی مەزەب و ئەخلاق و سیاسەتدا، بەڵام ئەم خۆزیا و حەزانەی ئاوێتەی ئایدیالیزمێکی شاعیرانەی کاڵ دەکرد، ئارەزووی دەکرد کە لە سەر دار و پەردووێن کۆشکی ستەم، کوچك و سەرای ئاشتی و ڤیان و بەختەوەری رۆبنرێ. شیعری ڤیانی و ئاگرین و ئاشقانەی هەیە و وەکو شاعیرانی دیکەی رۆمانتیك باسی خۆی دەکات و دەرد و ئازار و رەنجی هەموو خەڵکیش دەردەبڕێ. (شیللی) کە بەهرەیەکی خۆڕسکی شاعیرانەی هەبوو خەیاڵێکی یەجگار بەهێزیشی هەبوو، و هەموو بیر و وێناکانی ئاوێتەی خەیاڵە. بەڵام ئەم خەیاڵە ناسکی و تازەیی تایبەتی خۆی هەیە.

والتر سکوت دیارترین و کاریگەرترین رۆماننووسی قۆناغی رۆمانتیکی ئینگلستانە کە لە رێگەی بەرهەمێن مینا (بوب روی Bob roy) و (ئیڤانهو)وە رۆمانی مێژوویی هێنایە ناو ئەدەبیاتەوە. هەڵبەتە شۆرەتی سکۆت زۆر زوو کاری کردە سەر نووسەرانی هەموو دنیاش.

لە فەرەنسادا ڤیکتۆر هۆگۆ (نوتردام دوپاری) و (مریمە) "رووداوەکانی سەڵتەنەتی شارلی نۆیەم"ی نووسی. لە روسیادا گوگول "تاراس بولبا"ی نووسی و لە ئەنجامدا نووسەرێکی پسپۆری وەکو (ئەلکساندەر دوما) پەیدا بوو کە لە رۆمانێن مێژوویی دوورو درێژی وەکو (سێ تفەنگدار) و (کۆنت منت کریستو)ی بەرهەم هێنا. ئەم رۆمانە مێژووییانە سەرنجی خەڵکی وڵاتانی جیاوازی بەلای داب و نەریت و خووخدەی میللیدا راکێشا. لێ رۆمانی مێژوویی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ئەو بایەخ و شۆرەتەی، کە پەیدای کردبوو، لەدەست دا، چونکە یا بوون بە رۆمانێن سەرگەرمکەری بازاڕی کە بەدەستی نووسەرانی بێ بایەخ دەنووسران یان لایەنی کەونارانasی و لێکۆڵینەوەو پەیگیری گرتە خۆ وەکو (سالامبو- ١٨٦٢)ی گۆستاف فلوبیر کە لایەنی زۆر ورد دەربارەی مێژووی (کارتاژ) دەخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەو نموونەیەکە لە هەوڵ و وردەکاری و بەهرەو هونەری ئەم کەڵەنووسەرە.

**لە ئەڵمانیادا:-**

یەکەمین قوتابخانەی رۆمانتیك-ی ئەڵمانیا لە شارانی (لنا) و (بەرلین) دامەزرا. ئەم قوتابخانەیە لەسەر دەستی برایانی شلگل دامەزرا واتە (ویلهلم شلگل ١٧٦٧-١٨٤٥) و (فردریك شلگل ١٧٧٢-١٨٢٩) ئەم جووتە برایە یاسا و رێساکانی رۆمانتیکیان شرۆڤە کرد و کورتە مێژووی قوتابخانەی نێوبراویان نووسییەوە. لەم سەردەمەدا گۆتە شیعر و رۆمان و شانۆنامەو بەرهەمە جیاوازەکانی خۆی یەك لە دووی یەك بڵاو کردەوەو نەك هەر لە ئەڵمانیادا بەڵکو لە سەرانسەری وڵاتانی جیهاندا دەنگی دایەوەو کاری خۆی کرد. شیللەر-ش بە هۆزان و شانۆنامەکانی خۆی کارێکی زۆری کردە سەر ئەدەبیاتی جیهان. دەبێ ئەو دوو نەفەرە بە دوو کۆڵەکەی سەرەکی

ڕۆمانتیزمی ئەڵمان دابنرێن. ڕەوتی ڕۆمانتیزمی ئەڵمان، بەتایبەتی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا گوڕوتینی گرت و جگە لە برایانی شلگل، (نوڤالیس ١٧٧٢-١٨٠١) لە واری شیعردا، (هوفمان ١٧٧٦-١٨٢٢) لە بواری چیرۆکی خەیاڵیدا و (هنریش فن کلایست ١٧٧٧-١٨١٠) لە دنیای شانۆدا پەیدا بوون.

ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی پاش شەڕێن خۆیبوون و کۆنگرەی ڤێنا بەتەواوەتی گۆڕا و شەقڵێکی ڕەشبینانەی گرتەخۆ، چونکە ئارەزووی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەت نەهاتبووە دی و خەڵکی ئەڵمانیا تووشی نائومێدییەکی توند بوون و خۆیان دایە دەست ڕەشبینییەوە، ئەم ڕەشبینییە جۆرە کاردانەوەیەکی توند بوو دژی خەیاڵپەروەری و خۆزیاکانی ڕۆمانتیك. لە ئەدەبیاتی ئەڵمانیدا ئەوەی توانیویەتی ئەم ڕەشبینییە قووڵە، بەتایبەتی لە بەرهەمە هەجوئامێزەکانی خۆیدا زۆر لێهاتووانە بنوێنێ، (هنریش هاینەیە ١٨٥٦-١٨٩٧). هەڵبەتە ئەم ڕەشبینییە بەرە بەرە ڕەوییەوەو قۆناغێکی دیکە لە ئەدەبیاتی ئەڵمانی دا هاتە ئاراوە کە ناویان نا قۆناغی گەشبینی.

**لە روسیادا:**

لە روسیادا یەکەمجار شاعیرێك بەناوی (ژوکوفسکی ١٧٨٦-١٨٥٢) بە چاولێکەری شاعیران (گری) و (ئوسیان) هەندێ بەرهەمی نووسی. بەڵام یەکەمین شاعیری ناوداری ڕۆمانتیکی روسی ئەلکساندەر پوشکین ١٧٩٩-١٨٣٧)بوو. پوشکین کە خودانی بەهرەیەکی نائاسایی و روحێکی یاخی بوو لە سەرەتادا کۆمەڵە شیعرێکی بێ پەراوو پڕ جەسارەتی ئەوتۆی نووسی کە بووە مایەی نەفی کردنی بۆ قەفقاز و کریمە. پوشکین لە تەمەنی ٣٨ساڵیدا لە دوئێلێك دا کوژرا. پوشکین هەوەڵجار وەکو ڤۆلتیر بەرهەمی (حەماسی-هیجایی) وەکو (روسلان و لودمیلا ١٨٢٠)ی نووسی. پاشان شەکسپیر و بایرۆنی خوێندنەوەو ئیلهامی لەم دوو شاعیرە ئینگلیزە وەرگرت. هەروەها دەڤەری قەفقاز و کریمە ئیلهامی بەرهەمێن مینا (زیندانی قەفقاز) و (فوارەی باخچەسەرا)ی پێ بەخشی. ئەو بەرهەمانە لێوان لێون لە جوانی و ناسکی شاعیرانە، لە (ئوجین ئونگین)دا کە شیعرێکی تازەیە لە حەوت هەزار بەیت داو بە شاکاری پوشکین دەژمێردرێ و دە دانە ساڵی پێوە بووەو هەموو ئەزموون و هونەری خۆی تیا بەکار هێناوە، بە ئاشکرا کاریگەری (دون ژوان)ی بایرۆنی پێوە دیارە.

بە شێوەیەکی گشتی پوشکین کە دامەزرێنەری شیعری تازەی روسییە، دەبێ بە یەکێك لە گەورەترین شاعیرانی ڕۆمانتیکی جیهان بژمێردرێ. بەتایبەتی کەنێرۆی خەیاڵ، جوانی دیمەنان و ئاهەنگی شیعری لە بەرهەمەکانیدا بێنەزیرە.

دووەمین شاعیری ڕۆمانتیکی روسی کە پێویستە لێرەدا ناوی ببرێ (لیرمانتوف ١٨١٤-١٨٤١)ـە. ئەم شاعیرە چونکە لە ٢٧ ساڵیدا لە دوئیلدا کوژراوە، تەمەنی لەوە کورتتر بووە کە بتوانێ شەقڵ و شێوازی تایبەتی و دیاریکراو بە بەرهەمەکانی ببەخشێت. بەڵام ئەو شیعر و نووسینانەی کە لە دووی ئەو بەجێماون ئەوە نیشاندەدەن کە ئەم شاعیرە روسییەش لە کاریگەری (بایرون) و (ئالفرەدوویینی) بەدەر نەبووە. بەتایبەتی لە (شەیتان ١٨٣٨)دا کاریگەری (ئەلوا)ی (وینیی)

بەتەواوەتی دیارە. هەروەها لە بەرهەمی (قارەمانی سەردەمی مە)دا خوێنەوارییەكی قوولْ بەدی دەكرێ.

## میتسكیویچ و رۆمانتیزمی پۆلاندی

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، لە سێبەری دەسەلاتی رۆمانتیزمی رۆژئاواییدا، توانای زەوقی پۆلاندی بۆ وەرگرتنی شیعری رەزمی، نیشتمانی پڕ جۆش ئاشكرا بوو كۆمەلە بەرهەمێك لە ژێر كاریگەری و لاسایی كردنەوەی بەرهەمێن گۆتەو شیلەر و بایرون لە ئەدەبیاتی پۆلاندیدا هاتە ئاراوە.

لێ شیعری راستەقینەی رۆمانتیكی پۆلاندی، شیعری قۆناغی كۆچبەرییە. خەم و پەژارەی دابەشكردنی ولات بەسەر سێ ولاتی بێگانەدا لەلایەك و سەرهەلدانی هزرێن ئازادیخوازانە و ئارەزووی شۆڕش و یاخی بوون، گیان و بایەخێكی نا ئاسایی بە شیعری ئەم قۆناغە بەخشی. شیعر دەورێكی گرنگی لە پەروەردەكردنی گیانی میللی دا بینی، بۆ میللەتی زۆر لێكراو بۆ بە ویژدانی بێداری ، نەوایەكی ئاسمانی و ئیلهامبەخشی بەخۆوە گرت و بوو بە دەربڕی حەز و ئارەزوو و ڤیان و ئیمان و ئومێدی میللەت.

لەم قۆناغەدا ستوان (نایب زابت) (ئادام میتسكیویچ ١٧٩٧-١٨٥٥) بەهۆی هزر و بیرە نەتەوەییەكانییەوە گیراو بۆ سیبریا نەفی كرا، پاشان لە ئەلمان و ئیتالیا و فەرەنسادا ژیا، لە نێوان سالانی ١٨٢٢-١٨٣٤دا بەهێزترین و كاریگەرترین شیعری رۆمانتیكی پۆلاندەی بەرهەم هێنا و لاوانی ولات تا رادەی پەرستن رێز و حورمەتیان دەگرت، بەرهەمە گەورەكەی ئەو كە ناوی (پێشینان)ە و هەم سێبەری شێوازی (ڤارتەر)ی گۆتەی بە سەرەوەیە و هەم لایەنی فانتازی ئەفسانەێن كۆنی پۆلاندی پێوە دیارە، لە ریزی بەرهەمە گرنگەكانی رۆمانتیكی ئەوروپا دادەنرێ. ئەم شاعیرە شیعری دیكەشی هەیە لەسەر شێوازی پوشكین و بایرون. بەلام بە هیچ كلۆجێ ناتوانرێ بەرهەمی میتسكیویچ بە لاسایی كردنەوەی خەلكانی دی بزانرێ و لە سەرانسەری بەرهەمەكانیدا تازەیی و داهێنانی تایبەتی بەدی دەكرێ.

میتسكیویچ یەكێكە لە ستایشكارانی غەم و پەژارە لە سەدەی نۆزدەدا. لەنێو ئەو شاعیرانەدا تاقە كەسێك بوو كە هەرگیز لە چەمكی قوولی ژیان و كاردا سلی نەكردۆتەوە، خەمناكترین بەرهەمی لە جۆش و خرۆش و كارو كۆشش و جەزبەی ژیان بەدەر نەبووە.

میتسكیویچ وەسفكاری خۆزیاو تامەزرۆیی و ئومێد و ناكامییەكانی زەمانی خۆی و میللەتی خۆی بوو. هونەرمەندێك بوو كە لەگەلْ سەدەكەی خۆیدا هەوراز و نشێوی زۆری بینی و هەمیشە لە هەولْ و كۆشش دابووەو قەت كۆلی نەداوە، پوشكین دەربارەی ئەو دەیگوت: "لە سەردەمانی ئایندەوە دەپەیڤێ، سەردەمانێ كە میللەتان كەرب و كینە فەرامۆش بكەن و یەك دلْ و یەك گیان وەكو یەك خانەوادەی گەورە رەفتار بكەن.

میتسكیویچ مژدەدەری مرۆڤایەتی و دادوەری و حەقیقەت و مژدەو مزگێنی ئایندە بوو."

**لە وڵاتانی دیدا:**

لـە سـاڵی ١٨٠٢دا سـتیفنس-ی فەیلەسـوفی ئـەڵمانی کـە چـووبووە "کوبنهـاگن" لـە دانیمـارك دا بانگەشـەی بـۆ بنـەماکانی رۆمـانتیکی ئـەڵمان دەکـرد. لـەو سـەروبەندەدا (ئوهلنشـلگر ١٧٧٩-١٨٥٠)ی شاعیر و نووسـەری دانیمـارکی دیـدارێکی شـانزە سـەعاتی لەگەڵدا کرد کە دەبـێ ئـەو دیـدارە بـە دەسـپێکی قوتابخانـەی رۆمـانتیکی دانیمـارك بێتـە ژمـاردن. هـەر لـە هـەمان سـاڵدا (ئوهلنشلگر) کتێبێکی بەناوی (لقە زێرینەکان) نووسی و لەو کتێبەدا خەڵکی دانیمارکی لەسەر ئەوە سەرزەنشت کردبوو کە ئەفسانەێن میللی خۆیان فەرامۆش کردووە. پاشان چوو بۆ ئەڵمان و سویسـرا و ماوەیـەك لەگـەڵ (مـەدام دیسـتال)دا مایـەوەو بـە کۆمـەکی ئـەدەبیاتی مەسـیحی سـەدەکانی نـاڤین چـەندین شـیعر و نمایشـنامەی رەزمـی و لیریکـی نووسـی کـە بەهرەیـەکی شاعیرانەی زۆریان تێدا بەدی دەکرێت.

ئەو شاعرە دانیمارکیانەی کە پاش (ئوهلنشلگر) هاتن هەمان رێچکەو رێبازی ئەویان گرتەبەر. ئـەدەبیاتی رۆمـانتیکی دانیمـارکی لـە بـری لایـەنی (فـەردی) هـەبێ پـتر لایـەنی ئەفسـانەیی و خواستنی هەبوو، پایان و کۆتایی ئەم قۆناغەی ئەدەبیاتی دانیمارکی رێك دەکەوێتە ناوەڕاستی سەدەوە.

رۆمـانتیزمی سـوێد-ش لـە سـایەی کاریگـەری (ئوهلنشـلگر) و رۆمـانتیزمی ئـەڵمانیادا بـە شـێوەیەکی کـوت و پـڕ لـە سـاڵی ١٨١٠دا دەسـتی پێکـرد. سـەرەتای رۆمـانتیزمی سـوێد لـە چوارچـێوەی دوو دەسـتەی هـەڤرك دا بـوو. دەسـتەی یەکـەم (فسـفورییەکان) بـوو کـە لاسـایی (شـلگل) و (نوڤـالیس)یـان دەکـردەوە، ئـەم نـاوە لـە گۆڤارەکەیانـەوە وەرگـیراوە کـە نـاوی (fosforos)بوو. دەستەی دووەم (گوتیکەکان)بوو کە دەگەڕانەوە سەر سەرچاوەی ئەفسانەکانی ئەسکەندیناوا و شیعری کۆن.

گەورەترین شاعیری رۆمانتیکی سوێدی (تیگنـر ١٧٨٢-١٨٤٦) بـوو کـە هـەوەڵجار معـەلیم بـوو و پاشان بوو بە کەشیش و ژیانێکی تایبەتی زۆر ئازاد و ئاشقانەی هەبوو.

ئـەم پیـاوە بـەلای گوتیکەکانـدا دایدەشـکان، بـەڵام حـەزی لـە توندڕەوی ئـەوان نـەدەکرد. دژی (فسـفورییەکان) بوو، چونکە رۆمـانتیزمی ئاڵۆز و هەسـتپەروەری ئـەوانی، کـە لایـەنی نەخۆشـی گرتبووە خۆ، بەتایبەتی لاسایی کردنـەوەی ئـەدەبیاتی ئـەڵمانی پەسـند نـەدەکرد. (تـەگنر) زیـاتر پەیڕەوی (گۆتە و بایرون ئوهلنشلگر)ـە شیعرەکانی بەهێز و ئاهەنگدارە و خەیاڵی زۆر بەربڵاوە.

لـە مەرجەرسـتاندا، بەرهەمـەکانی (کیشـفالودی ١٧٧٢-١٨٤٤) بـە دەسـتپێکی قۆنـاغی رۆمانتیـك دادەنرێن. ئەم شاعیر و نووسەرە کە لە پێشا ئەفسـەر بـوو لـە لایـەن فەرەنسییەکانەوە دەسـتگیر و زینـدانی کـرا، جگـە لـە شـیعری رۆمانتیـك، بـە نووسـینی (چیرۆکـی کـۆنی هنگـری) وەکـو (والـتر سکۆت)، وەکو نووسەرێکی میللی وڵاتی خۆی ناوبانگی دەرکرد.

لـێ گـەورەترین شـاعیری رۆمـانتیکی مەجـەڕ (شـاندور پیتـوفی ١٨٢٢-١٨٩٤)ـە کـە لـە هەوەڵـەوە ئەکتەر بوو و پاشـان لـە ڕای رزگـاری وڵاتەکەیـدا دژی روسـکەکان و نەمسـاوییەکان شـەڕی کـرد و مەردانە کوژرا. پیتـوفی هـەر بـە زکمـاك شـاعیرە و شـیعری گـەرم و گـوڕ و کاریگـەری هەیـە. بابـەتی

شیعره میللییەکانی خۆی لە سروود و گۆرانییە کۆنە میللییەکانەوە وەرگرتووە و نەفەسی (شەخسی) خۆی پێ بەخشیوە. لە هەمان کاتدا سوودی لە (هاینە) و (هۆگۆ)ش وەرگرتووە.

لە ئیتاڵیادا، لە نێوان سالآنی ١٨١٦-١٨٢٠دا گروپێك بەنێوی (گروپی رۆمانتیکی میلان) دامەزرا بەلآم هیچ شاعیرێکی بایەخدار لەنێو بەرپێوەبەرانی ئەو گروپەدا هەڵنەکەوت. تاقە نووسەری رۆمانتیکی ئیتاڵیا کە بەرهەمی بایەخداری لە پاش خۆی بەجێهێڵابێ و چووبێتە ریزی نووسەرانی ناوداری جیهانەوە (ئەلیساندرۆ مانزۆنی-١٧٨٥-١٨٧٣)ـە. مانزۆنی خاوەن هەستێکی بەرزی، ناسکی مرۆڤپەروەرە. ئەو چامەیەی کە بە بۆنەی مردنی ناپلیۆنەوە نووسیویەتی بەهێزترین شیعری ئەو بۆنەیە بوو، لە زەرفی ماوەیەکی کەمدا ٢٧ جار بۆ زمانانی جیاوازی دنیا وەرگێردرا، گۆتە تەرجەمەی ئەڵمانی کرد.

لە ئەسپانیادا رۆمانتیزم پاش نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم کاریگەری راستەقینەی خۆی نیشاندا، ئەم کاریگەرییە زیاتر لە بواری شانۆدا دیار بوو. ناودارترین نووسەران و شاعیرانی رۆمانتیکی ئەسپانیا بریتین لە: (خوزە دوسپرۆنسدا ١٨٠٩-١٨٤٢) و (زوریلا ١٨١٧-١٨٩٣) کە بەرهەمی ئەدەبی بەناوبانگیان لەپاش بەجێماوەو ئەدەبیاتی ئەسپانیایان دەوڵەمەند کردووە.

## لاپەڕەیەك لە پێشەکی درامای کرومڤیل
## کە ڤیکتۆر هۆگۆ بە خۆی بۆی نووسیوە

ڤیکتۆر هۆگۆ پێشەکییەکی بۆ درامای کرومڤیل نووسیوە کە بۆخۆی کتێبێکی بچووکەو گرنگی ئەم پێشەکییە زۆر لە ئەسڵی درامای (کرومڤیل) زیاترە.

پێویستە ئەم پێشەکییە بە پرۆگرامی قوتابخانەی رۆمانتیك بژمێردرێ. رۆمانتیزم وەکو قوتابخانەیەکی سەربەخۆ بەو پێشەکییە دەست پێدەکات و هەر ئەم پێشەکییە بووەتە مایەی ئەوە کە (هۆگۆ) بە پێشەنگ و پێشەوای رۆمانتیزم بژمێرن. جا لێرەدا لاپەڕەیەك لەو پێشەکییە دەخەینە روو.

## دەورانی سێ قۆناغەی مێژووی بەشەری

لەسەر رووی زەمیندا، بە بەردەوامی یەك جۆرە شارستانیەت یان بە شێوەیەکی سادەتر بیڵێین تەنیا یەك کۆمەڵگە نەبووە. بە شەرییەت وەکو هەر یەکێك لە ئێمە، گەورە بووە، تەرەقی کردووەو گەشەی سەندووە. سەردەمانێ منالْ بووە، سەرزەمانێ گەورە بووە و هەنووکە سەردەمی پیریی پڕ شکۆی بەچاوی خۆ دەبینین. بەر لەم عەسرەی کە گۆمەڵگەی ئەمڕۆکە ناوی (عەسری کۆن)ی لێناوە، سەردەمێکیش هەبووە کە پێشینان (قەڕنی ئەفسانە)یان پێگوتووە، لە کاتێکا ئەگەر ناوی (عەسری سەرەتایی) لێنرابا دروست تر بوو. ئەمە سێ قۆناغی دوابەدوای بەکە کە شارستانیەت لە هەوەڵەوە تا ئێستا بەخۆیەوەی دیتووە. جا مادامێکی شیعر بەردەوام لە کۆمەڵگەدا پەیدا دەبێ، ئێمەش بە گوێرەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەوە دیاری دەکەین، کە شیعر

**دەشـێت لــە هــەر قۆنــاغێکی ســێ قۆناغەکــەدا (عەســری ســەرەتایی، کــۆن و تــازە)دا چ تایبەتمەندییەکی هەبێ...**

**دەبــێ ئــەوە بڵـێم کـە شـیعریش سـێ قۆنـاغی هەیـە کـە هـەر قۆنـاغێکی زادەی سـەردەمێکی کۆمەڵایەتییە، شیعرێن لیریکی، حەماسە، درام. عەسری سەرەتایی دڵداری و لیریکییە، سەردەمی کۆن رەزمییە (حەماسی) و سەردەمی تازە دراماتیکییە.**

**شـیعرێن لیریکـی عەسـرێن سـەرەتایی نەغمـە و نـەوای ئەدەبیـەت سـاز دەکـات، حەماسـە، مێـژو بەرجەستەو شکۆدار دەکات، درام ژیان وێنە دەگرێت. سیفەتی یەکەمیان تەبیعی بوونە، سیفەتی دووەمیان سادەیی و سیفەتی سێیەمیان حەقیقی بوونە.**

**مێژوونووسان لە سەردەم و قۆناغی دووەمدا هاتوونەتە ئاراوەو رووداونووسـان و رەخنـەگران لـە سـەردەم و قۆنـاغی سێەمدا پەیـدا بـوون. قارەمانـانی شـیعرێن لیریکـی کەسـانی گـەورەو کەلـەش زەلامن، وەکو (ئادەم)، (قابیل) و (نووح). قارەمانـانی حەماسـەکان پاڵـەوانانی دێوسیفەتن وەکو (ئاشیل)، (ئاترە) و (ئۆریست). و قارەمانانی درام خەڵکانی ئاسایین. وەکو (هاملیت)، (ماکبپ) و (ئوتیللۆ). شیعری لیریکی ئایـدیال لـە بەرچاو دەگرێ، حەماسە شکۆ و گـەورەیی و درام واقیع. بەهەرحاڵ دەبێ ئەوە بگوترێ کە ئەم شیعرە سێ سەردەمییە، لـە سـێ سەرچاوەی گـەورەوە هـەڵ دەقووڵێ (تەورات)، (هۆمەر) و (شەکسپیر)...**

**پەراوێزەکان:**

**١- تەنانەت گۆتەی کەڵە شاعیری ئەڵمانی، کە بەرهەمەکانی وی لـە سـەرهەڵدان و پەیـدا بوون و خەملێنی قوتابخانەی رۆمانتیزمدا کاریگەری یەجگار زۆریـان هـەبووە، لـە کتێبی (ڤارتـەردا) کە گەورەترین بەرهەمی رۆمانتیکی ئەوە، بەشێك لە شیعرەکانی (ئوسیان)ی وەکو خۆی تەرجەمـە کردووەو لە کۆتایی کتێبەکەدا دایناوە. و مادام دوستال-ی رەواجدەر و هاندەری رۆمـانتیزم لـە فەرەنسادا، ئەم بەیتە چکۆلەیەی لە هەموو بەرهەمەکانی (هۆمەر) بە باڵاتر زانیوە.**

**٢- ڤیکتـۆر هۆگـۆ پێشـەکییەکی بـۆ شـانۆنامە بەناوبانگەکـەی خـۆی (کرۆمویـل) نووسـیوە کـە بەخۆی کتێبێکی بچووکە و زۆر لە خودی شانۆنامەکەش بەبایەخترە. پێوستە ئەم پێشـەکییە بـە پەیڕەو پرۆگرامی قوتابخانەی رۆمانتیك بژمێردرێ. بەم پێشەکییە قوتابخانەی رۆمانتیك دەستی پێکرد و ئەم پێشەکییە بووە مایەی ئەوە کە هۆگۆ بە پێشەنگی رۆمانتیزم بژمێرن.**

# ریالیزم
# Realisme

رۆمانتیزم لە لایەنێکەوە بە هەمان ڕێگەدا دەڕۆیی کە دەبوایە لە ئایندەدا، ریالیزم بە دڵنیاییەوە بە هەمان ڕێگەدا بڕوات، واتا لە جیاتی شەرح و شرۆڤەی دنیایەکی مجەڕەدی وەها کە شێوەو رەنگەکانی لە پشت پەردەیەك لە یاسا و ڕێسای سنووردار و داب و نەریتی ئەدەبییەوە تێکڕژابێ، دنیایەکی وێنە دەگرت لە شێوەو رەنگی واقیعی خۆی هەبوو، و ئیلهامی لە رابردووی مێژوویی یان قۆناغی هاوچەرخەوە وەردەگرت. بەڵام دوو کۆسپ لە ڕێگەی گەیشتن بەو مەبەستە هەبوو: یەکەم لایەنی دەروونی و ناوەوەی رۆمانتیزم و دەخالەتی هەستەکانی خودی نووسەر لە بەرجەستەکردنی دنیای دەرەکی، دووەم فەرمانڕەوایی خەیاڵ بەسەر واقیعدا. ریالیزم ئەم دوو لایەنەی قوتابخانەی رۆمانتیکی تێکشکاند و دووری خستەوە. واتا دەبێ ریالیزم بە سەرکەوتنی حەقیقەتی واقیع بەسەر خەیاڵ و هەڵچوونان بێتە ژماردن. بایەخی ئەم قوتابخانەیە زیاتر لەمەدایە کە قوتابخانە ئەدەبییە جۆراوجۆرەکانی دواتر نەیانتوانیوە لە قەدر و ئیحتوباری کەم بکەنەوەو بینای رۆمانی تازەو ئەدەبیاتی ئەمڕۆی جیهان لەسەر بناغەی ئەو رۆنراوە.

## ( رۆمانتیزمی کۆمەڵایەتی )

لە ساڵی ١٨١٥وە تا ساڵی ١٨٥٠ ژمارەیەکی زۆری فەیلەسوف و کۆمەڵناس و مێژوونووس و رەخنەگر لە دەوری نووسەرانی رۆمانتیك هەبوون کە زۆربەیان پشتیوانیان لە بیروبۆچوونی رۆمانتیکەکان دەکرد، بەڵام جارجارێ هەندێ بۆچوونیان دەردەبڕی کە بەتەواوەتی پێچەوانەو دژی بیر و باوەڕی رۆمانتیکەکان بوو. تەنانەت هەندێك لەوانە، بەتایبەتی رۆماننووسەکان، خۆیان لە رۆمانتیزم دوور دەگرت و بەجۆرێك دەیاننووسی وەك بڵێی خەبەریان لەو قوتابخانەیە نەبێ.

لەم ماوەیەدا رۆمانتیزمی هەستەوەری خۆبەخۆ تێکدەشکاو رۆمانتیزمی کۆمەڵایەتی رەواجی پەیدا دەکرد. چونکە پاشکەوتنی ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن، هەندێ لە نووسەران دەیانویست کارێك بکەن کە بتوانن سیستەمی کۆمەڵایەتی بگۆڕن. زۆربەی ئەم نووسەرانە رۆمانتیك بوون، لێ فەرقیان لەگەڵ رۆمانتیکە ئیحساساتییەکاندا ئەمە بوو کە فەزڵی (تاك) یان بەسەر (کۆمەڵ)دا نەدەدا. بەپێچەوانەوە هەموو ئەوانە یا سۆسیالیست بوون یا لایەنگری سۆسیالیزم بوون و باوەڕیان وابوو کە پاشاگەردانی کۆمەڵایەتی بەرەنجامی ئەوەیە کە کەمینەیەکی بچووك سەروەت و سامانی وڵات دەگرنە دەست و زوڵم لە زۆربەی جەماوەری خەڵك دەکەن. دەیانگوت لە کۆمەڵگەی باش و ڕێك و پێکدا، ئەرکی دەوڵەت ئەمەیە کە یەکسانی موڵکداری و سەروەت و

سامان بپارێزێ. لێ ئەم ژمارەیە بە زۆری رۆمانتیك بوون چونكە دەیانویست كۆمەڵگەی ئایندە نەك بە شێوەی زانستی و پراكتیكی، بەڵكو بە شێوەی خەیاڵی بونیاد بنەن.

بەڵام بابەتی ئەم نووسەرانە هەمیشە هەر لایەنی رۆمانتیكی نەبوو، و هەندێ جار لە برێ لایەنەوە، لایەنی ریالیستی-شی هەبوو. هەرچەندە ئەو سیستەمە كۆمەڵایەتیانەی كە هزرڤانانی ئەو زەمانە لە بەرهەمەكانی خۆیاندا وەسفیان دەكرد، زۆر لێكدی جیاواز بوون، لەگەڵ ئەمەشدا بەزۆری نوقستان یان خەیاڵی و ناعەمەلی بوون. ئەمە جگە لەوەی كە هیچ یەكێك لەو نووسەرانە ریالیست نەبوون، لێ لێكۆڵینەوە لە مەسەلەكانی ژیان و داوەری دەربارەی ژیان و ئاشنایەتی لەگەڵ تەرزی بیر كردنەوەی ئازادا دەبووە مایەی ئەمەی كە ئیدی نووسەران لە پشت پەردەی وەهم و خەیاڵاتەوە تەماشای دنیا نەكەن، بەڵكو هەوڵیان دەدا تا رووداوەكانی ژیان، پەیوەندی بە هەر چینێك و هەر ژینگەیەكەوە هەبێ وەكو خۆی شرۆڤە بكەن و نیشانی بدەن.

## ( كاریگەری بالزاك )

لەم سەروبەندەدا بالزاك بە نووسینی زنجیرە بەرهەمێكی خۆی بەناونیشانی (كۆمیدی مرۆڤانی) هەنگاوێكی تازەی لە بواری ئەدەبدا نا، و وێڕای ئەوەی كە نیازی دامەزراندنی قوتابخانەی نەبوو و تیۆری نووس نەبوو، بوو بە پێشەنگی بێ هەڤرکی نووسەرانی ریالیست. بالزاك-یش لە هەمان كۆمەڵگەدا دەژیا كە نووسەرانی رۆمانتیكی لە باوەشی خۆیدا پەروەردە كردبوو، بەڵام ئەم نووسەرە لە جیاتی ئەوەی كە خۆی تەسلیمی خەیاڵات و حەسرەت بكات و دووچاری نەخۆشی قەڕن ببێ و بۆ هەڵاتن لە ژینگەی خۆی دەستەوداوێنی پێشینان بكەوێ و پەنا وەبەر سەدەكانی ناڤین بەرێ، كۆمەڵگەی خۆی بە هەموو تایبەتمەندی و نهێنییەكانییەوە، و بە هەموو داب و نەریت و چاكی و خراپییەكانییەوە لە بەرهەمەكانی خۆیدا نیشان دا. ئەوەی كە تا ئەو رۆژە نووسەرانی رۆمانتیك لێی بێ ئاگا بوون، واتە كاریگەری و دەسەڵاتی پارەی لە كۆمەڵگەی ئەو زەمانەدا پێشان دا. لەو پێشەكییە سێ لاپەڕەییەدا كە بۆ چیرۆكی (كیژی چاو زێڕین)ی نووسیبوو، پاریسی بە هەموو چینە كۆمەڵایەتییە جیاوازەكانەوە نیشانداوەو دەڵێت:"ئەمانە یان زێڕیان گەرەكە یان كەیف و خۆشی!" هەروەها دەڵێت: "لە پاریسدا خۆشەویستی هەوەسێكە و كینە شتێكی بێ هودەیە. لەوێندەر مرۆڤ جگە لە ئەسكەناسی هەزار فرانكی كەس و كاری تری نییە و جگە لە بانقی رەهنی دۆستی نییە."

بالزاك دەیزانی كە ئەوەی نووسەران و شاعیرانی رۆمانتیك تا ئەو زەمانە گوتویانە چیتر بەكار نایەت. لە ساڵی ١٨٤٠دا لە پێشەكی "چەند دیمەنێكی ژیانی تایبەتی"دا روونی كردووەتەوە كە لە نووسینی رۆمانتیكاندا: "هەموو نێوەرۆكەكان تەواو بووەو هەموو شێوەو فۆرمەكان كۆن بووەو سواوە" و نیشانی داوە كە كاری رۆماننووس لەم قۆناغەدا شتێكی دیكەیە: دەبێ كۆمەڵگەی خۆی شی بكاتەوەو (نموونەكان)ی ناو ئەم كۆمەڵگەیە نیشان بدات، و گوتویەتی كە كاری نووسەر لە روویەكەوە لێكچوونێكی زۆری لەگەڵ كاری (مێژوونووس)هەیە و لە راستیدا نووسەر "مێژوونووسی داب و نەریت و ئەخلاق"ی خەڵك و كۆمەڵگەی خۆیەتی. ئەگەر دوو

جۆره گیانلەبەر لە دوو شوێنی جیاواز لە رووی ئاو و هەواوە وەربگرین ئەوا گیانلەبەری یەکێك لەو دوو شوێنە، لە ژێر کاریگەریی ئاوو هەوای ئەو شوێنەدا رەفتار و سیفەتی تایبەتی پەیدا دەکات. بەشەریش زادەی کۆمەڵگەی خۆیەتی و هەمان ئەو کارەی کە ئاوو هەوای جیاواز دەیکاتە سەر گیانلەبەران، کۆمەڵگەێن جیاوازیش دەیکاتە سەر تاکەکانی کۆمەڵگە. بەڵام چونکە بەشەر بە هەمان سادەیی گیانلەبەران نییە و ئەقڵ و هۆشی هەیە ئەم کاریگەرییانەش بەسەر ئەوەوە قوڵتر و ئاڵۆزترە، و نووسەر نیگارکێشێکە کە سیمای رۆحی تاکەکانی کۆمەڵگەێن جیاواز و چینێن جۆراوجۆری ئەم کۆمەڵگایانە دەگرێت. بالزاك لە پێشەکی (کۆمیدی مرۆڤانی)دا دەڵێت:

"بە رێکخستنی لیستی خەوش و چاکە، و بەدیاری کردنی ئەو شتانەی زادەی هەواو هەوەس و ڤیانانە و بە تۆژینەوەی تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکان و بە هەڵبژاردنی رووداوە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگە و بە رێکخستنی نموونان لە رێگەی سیفەت و تایبەتمەندیانی چوون یەکەوە، لەوەیە بگەمە نووسینی مێژوویەك کە مێژوونووسان لێی بێ ئاگا بوونە: "یانی مێژووی داب و ئەخلاقی کۆمەڵگە!"

لە روانگەی بالزاکەوە ژیان بریتییە لە "کۆمەڵێك رووداوو و مەسەلەێن بچووك" کە رۆماننووس دەبێ تا رادەی پێویست گەورەیان بکاتەوەو لەنێو ئەم رووداوانەدا ئەوانەیان هەڵبژێرێ کە دەشێت رەگەزی چیرۆکەکەی ئەو پێکبهێنن. هەروەها دەبێ قارەمانانێ بۆ چیرۆکەکەی خۆی هەڵبژێرێ کە بکرێ ببنە نموونە بۆ هاوتا و هاوشێوەکانی خۆیان. و هەر هەڵبژاردن و ئەفراندنی نموونەێن لەو جۆرەیە کە پێی دەگوترێ تیپیزاسیون. کەسایەتی لەو جۆرە فەرقی زۆرە لەگەڵ تاکی ئاساییدا، وەکو (سیزار بیروتو) یا (ڤەترین) کە لە کەسانی ئاسایی بالاترین. لێ بەلزاك "حەقیقەت لە تەبیعەتدا" لە "حەقیقەت لە ئەدەبیات"دا جیا دەکاتەوە. یەکەمیان هەندێ جار بە ئەندازەیەك زبرە کە ناکرێ بخرێتە ناو کارێکی ئەدەبییەوەو خوێنەر ناڕەحەت نەکات، کەواتە نووسەر بە ئەفراندنی "نموونە"ی دڵخوازی خۆی، دەبێ حەقیقەت لە چەند نموونەیەکی واقیعی و زیندووەوە وەربگرێ و بەگوێرەی زەوق و هونەری خۆی تێکی هەڵشێلێ و "نمونە"ی ئایدیاڵی خۆی لێ دروست بکات.

ئەمانە هەندێ لەو مەسەلانە بوون کە بالزاك لەبن دێڕی لاپەڕەکانی بەرهەمەکانی خۆیدا خستنییە روو و بەمجۆرە بینای رۆماننووسی نوێی لە ئەدەبیاتی ئەوروپادا دامەزراند. هەڵبەتە بالزاك ئەو دەرفەتەی بۆ هەڵنەکەوت کە بیر و باوەڕی خۆی بە شێوەی یاسا و رێسا و بنەمای قوتابخانەیەك رێك بخات و لەپاش خۆی بەجێی بێڵێ، بەڵام ئەو تۆژینەوانەی کە پاشان کران ئەوەیان سەلماند کە کارەکانی بالزاك لە کاری هەر کەسێکی دیکە کە یاسا و رێسا بۆ ئەدەبیات دابنێ زیاتر بووە.

## جەنگی ریالیزم

ئەوەی مایەی سەرنجە و پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکرێ ئەمەیە کە ریالیزم، لە هەوەڵەوە کاردانەوەیەك بوو کە دژی رێبازی "هونەر بۆ هونەر" هاتە ئاراوە. بەڵام جەنگی ریالیزم لە

هەوەڵەوە لە مەیدانی ئەدەبیاتدا دەستی پێنەکرد، بەڵکو ئەم جەنگە لە مەیدانی نیگارکێشیدا دەستی پێکرد. پێشەوای ریالیزم لە بواری نیگارکێشیدا (گۆستاف کوربیە ١٨١٩-١٨٧٧) بوو کە دەیگوت: "ئامانجی هونەر بۆ هونەر، بێهودە و پووچە." کوربیە کە لە پیشانگا رۆمانتیکییەکانی نیگارکێشیدا گاڵتەیان بە بەرهەمەکانی دەکرد، کەوتە بەرەڤانی لە خۆی و پیشانگایەکی بۆ بەرهەمەکانی خۆی کردەوەو بەمە دەستی بە ململانێ دەگەڵ هەڤڕەکەکانی خۆیدا کرد. ئەم ململانێ سەختە، کە لە ساڵی ١٨٤٨وە تا ساڵی ١٨٥٠ی خایاند بە سەرکەوتنی کوربیە شکایەوەو توانی رای گشتی بە قازانجی خۆی گەلاڵە بکات. ئەم سەرکەوتنە لە واری ئەدەبیاتیشدا کاری خۆی کرد و کۆمەکێکی گرینگی بە نووسەرانی ریالیست کرد.

ریالیزم وەکو قوتابخانەی ئەدەبی، بەر لە هەر شوێنێکی دیکە، لە فەرەنسادا هاتە ئاراوە، بەڵام دامەزرێنەرانی قوتابخانەی ئەدەبی ریالیزم ئەم نووسەرە گەورانەی کە ئەمڕۆکە ئێمە دەیانناسین نەبوون، بەڵکو کۆمەڵە نووسەرێکی مامناوەندی بوون کە ئێستا شۆرەتێکی ئەوتۆیان نییە. ئەم نووسەرانە بریتی بوون لە: شانفلوری و مورژیە و دورانتی.

ناوی ریالیزم و یاساکانی قوتابخانەی ریالیزم یەکەمجار شانفلوری، لە ساڵی ١٨٤٣دا لە یەکەمین نووسینەکانی خۆیدا هێناویەتە ئاراوە. لە (مانیفیستی ریالیزم)دا نووسیویەتی: "ناونیشانی ریالیست دەدرێتە پاڵ من، وەکو چۆن ناونیشانی رۆمانتیك دەدرێتە پاڵ نووسەران و شاعیرانی ساڵی ١٨٣٠". شانفلوری نکۆڵی لە هەموو شێوەو جۆرە نووسەرییەك کرد کە تا ئەو زەمانە هەبوو. زۆر بە توندی کەوتە سەرزەنشتی ئەوانەی کە رۆمانیان کردبوو بە جۆرە ئیدیعانامەیەك و لاف و گەزافنامە، هێرشێکی توندی کردە سەر نووسەرانی وەکو ئۆجین سو و ئالکساندەر دۆما کە پشتیان کردبووە رووداوەکانی ژیان و خۆیان تەسلیمی خەیاڵاتی بێ پایان دەکرد، هەموو ئەو رۆمانە، خەیاڵیانەشی رەت کردەوە کە بە شێوازی (جورج ساند) دەنووسران.

جا لەو بەینەدا تەنیا رێچکەی (بالزاك)ی بەگەندە کرد و دەیگوت: "زانین لە ڕای توانین! ئەمەیە باوەڕی من! توانای نیشاندانی داب و نەریت و رەوشت و باوەڕ و سیمای ئەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژین. خۆڵاسە، داهێنانی ئەدەبی زیندوو! "ئەمە مەبەست و ئامانجی منە" و لە سەری دەڕوات: "قوتابخانانی ئەدەبیم خۆش نەگەرەکە، ئاشقی شێوازان نیم و کلێشە و قەراردادی پێشوەختە و ئامادەم حەز لێ نییە، بۆ من زەحمەتە خۆم لەناو چوار دیواری کلێسای ریالیزمدا حەپس بکەم، من لە هونەردا جگە لە خلوسیەت و بێگەردی شتێکی دی ناناسم."

لە ساڵی ١٨٥٢دا بە شێوەیەکی بنجبڕتر بنەماکانی بیر و باوەڕەکانی خۆی خستە روو و گوتی کە رۆماننووس دەبێ لە پێشدا وەزع و حاڵی بێرونی تاکەکان بخوێنێتەوە، شتی زۆریان لێ بپرسێت و گوێ لە وەڵامەکانیان بگرێ، لە داب و نەریت و خوو خدەیان ورد بێتەوە، پرسیار و تاقیب لە دراوسێکانیان بکات، پاشان هەموو ئەم زانیاری و بەڵگانە بە سەلیقە و رێبازی خۆی کورت بکاتەوەو لە نووسینی چیرۆکدا سوودیان لێ وەربگرێ. بەمجۆرە کاری نووسەر شێوەی جۆرە لەزنووسین و وێنەگرییەکی هەمەلایەنە دەگرێتە خۆ. و لە هەر جۆرە خەیاڵ و فەنبازییەك دوور دەکەوێتەوە. شانفلوری و (دورانتی) هاوڕێ و موریدی کە دژی رۆمانتیزم هەستابوون،

هەندێ دیمەنێن ژیانی وردە بورژوایان و عەوامی خەڵکیان هەڵبژارد و لە بەرهەمەکانی خۆیاندا بەرجەستەیان کرد. لەناو ئەم نووسەرانەدا (دورانتی) زیاتر بایەخی بە ژیانی کۆمەڵایەتی و داب و نەریتی خەڵکی داوەو هەوڵی دەدا کە هونەرەکەی بۆ کۆمەڵگە بەسوود بێ. دورانتی گۆڤارێکیشی بەنێوی (ریالیزم) بڵاو کردەوە و لەوێدا زۆر بە توندی هێرشی کردووەتە سەر پارانسییەکان. دورانتی و هاوکارەکانی هێرشی توندیان دەکردە سەر رۆمانتیکەکان: "هۆگۆ" یان بە "دێو" و "موسیە" یان بە "سێبەری دون جوان" و "گوتیە" یان بە "پیرەمێری ساویلکە" ناو دەبرد. دەیانگوت: "**شاعیران نزمترین لێبۆکی دنیان**" ئەوەندە لەشیعر بێزار بوون کە دورانتی بە سوعبەتەوە رەشنووسی یاسایەکی چەند مادەیی نووسی کە بە پێی ئەو یاسایە هەرکەس شیعر بڵێ ئیعدام دەکرێت.

گۆڤاری ریالیزم دوای پێنج هەیڤان وەستا، بەڵام وەستانی گۆڤارەکە خەباتی ریالیستەکانی رانەگرت و دورانتی لە وتارێکیدا کە بە بۆنەی وەستانی گۆڤارەکەوە بڵاوی کردەوە، نووسی: "ریالیزم مرد، بژی ریالیزم!"

ئەم نووسەرانە جگە لەو یاسا و رێسایانەی کە بۆ ریالیزمیان دانا و جگە لەو تێوریانەی کە لەو بوارەدا نووسیان کەوتنە بیری ئەوەش کە بەرهەمێن ریالیستی بنووسن و ئەوە بوو هەندێ رۆمانانیان نووسی کە هیچیان بایەخ و ئیحتوباریان پەیدا نەکرد. بەتایبەتی شانفلوری کە سوور بوو لەسەر ئەوەی بەشوێن پێی پاکی بالزاك دا هەنگاو بنێ.. برونتیر رۆشنبیری ناوداری فەرەنسی باوەڕی وایە کە "ئەو پیاوێکی ئازا لێ ئۆمی بوو، لە ناخی دڵەوە ستایشی بالزاکی دەکرد، بەڵام ئەوەی کە توانیبووی لە کۆمیدی مرۆڤانییەوە فێری بێ، لاسایی کردنەوەیەکی تورەهات زیاتر نەبوو و ئەوەی بەلای ئەوەوە لە بەرهەمەکانی بالزاکدا گرنگ دەهاتە بەرچاو بوونی وردە بۆرژوایان و پیرە کچان بوو."

ئەوەی پێویستە دەربارەی ئەم نووسەرانە بگوترێ ئەمەیە کە ئەمانە نووسەرێن پلە یەك نەبوون، لێ بوونی هەردووکیان لەناو رەوتی گەشەکردن و پێشڤەچوونی رابوونی ئەدەبی ئەو سەردەمەدا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو و بێگومان بەبێ بوونی ئەوان راپەڕینی ریالیستی ئەو جۆش و خرۆش و گەرم و گوڕییەی بەخۆوە نەدەبینی و بەو خێراییە نەدەگەییە ئاستی کەماڵ.

## (بالزاك و ستاندال)

تا ئەو زەمانە بۆچوونی جیاواز دەربارەی بالزاك و ستاندال هەبوو. بالزاك دۆستی رۆمانتیکەکان بوو، لێ ستاندال حەزی لە رۆمانتیکەکان نەدەکرد و گاڵتەی پێ دەکردن، بەم حاڵەشەوە لە بەرهەمەکانی ستاندال دا خەیاڵاتێك دەبینرا کە لە خەیاڵاتی رۆمانتیکەکانەوە دوور نەبوو. ژمارەیەك بالزاك-یان بەگەورەترین نووسەری رۆمانتیك دەژمارد و نەیاندەتوانی بەرهەمەکانی ستاندال لە بەرهەمێن رۆمانتیکەکان دابڕن. بەڵام پاش جەنگی ریالیزم و ستایشی شانفلوری بۆ بالزاك، پسپۆڕ و شارەزایانی گەورەی وەکو (سەنت بوف) و (تن)ش ستایشی بەرهەمێن ستاندال و بالزاك-یان کردو کەوتنە راڤە و شرۆڤەی ریالیزمی ئەوان. خودی ئەم رەخنەوان و

رۆشنبیرانەش لە هەمبەر ئەو کەسانەدا کە بەرەڤانیان لە رۆمانتیك و کلاسیکەکان دەکرد، لایەنی واقیعیەتیان گرت و ریالیزم بەلای ئەوانەوەو بۆ ئەوان بوو بە قوتابخانەیەکی ئەدەبی هەڵبژاردە. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئەو جووتە لە ریالیزمەوە بەرەو ناتورالیزم دایانکێشابوو، بەڵام چونکە خودی ئەوان بابەتی باسکەی ئێمە نین بۆیە بەو ئاماژەیە واز دێنین.

## ( گۆڕانی ئەدەبیات )

هەڵبەتە ناکۆکییەك لە نێوان ریالیزم و رۆمانتیزم دا هەیە، دەبێ بەر لەوەی بکەوینە شرۆڤە و تۆژینەوەی هەر جۆرە مانا و چەمکێك، لە دیارترین وێنەێن ئەدەبیات دا بۆ ناکۆکییەکە بگەڕێین: دەرەجەبەندی ژانرە ئەدەبییەکان تێك دەڕێژێ و تەبیعەتی هەر یەکێکیان دەکەوێتە ژێر رەحمەتی گۆڕانکاری گرنگەوە و هەروەها شانبەشانی ئەدەبیات، ئەو رایەی دەربارەی نووسەر هەیە دەگۆڕێ.

لە هەر سەردەمێك دا یەکێك لە ژانرە ئەدەبییەکان زاڵ دەبێ و ڕەواج پەیدا دەکات و بە هەڵبژاردە دەژمێردرێ، رۆمانتیزم قۆناغ و سەردەمی شیعر بوو وەکو چۆن سەدەی هەڤدە سەدەی تراژیدیا بوو و سەدەی هەژدەیەم سەدەی پەخشانی فیکری بوو. بایەخی رۆمانی رۆمانتیك ئاشکرایە بەڵام ئەم رۆمانە چ رازگۆیی لیریکی بێ، چ رەمز یان داهێنانی دنیایەکی خەیاڵی بێ، لە هەموو حاڵێکدا پتر پەیوەستە بە جیهانی شیعرەوە.

کۆتایی رۆمانتیزم هاوزەمانە لەگەڵ ئاوابوون و نەمانی هێزێن شاعیرانەدا.

تیوفیل گوتیە لە ساڵی ١٨٦٧دا گوتویەتی: "زەوقی زەمان و رۆژگار رووی لە شیعر وەرگێڕاوە." دیارترین شاعیرانی عەسر، کەوتوونەتە دووی زەمینەێن ناشەخسی، گێڕانەوەکاری، شیتەڵکاری یان فەلسەفی. بەرهەمی روبەرت براونینگ جۆرە تەلارکارییەکی رۆشنبیرییە کە پەیوەندی زانستی بە هۆشیارییەوە نیشاندەدا. (ئینۆکاردین)ی تینی سۆن یەکپارچە گوزەشت و لێبوردەییە. شیعرێن شپیتلەری ئەڵمانی حیکایەتی رەزمییە. بەلای کاردوچیی ئیتاڵیاییەوە، سروشت واقیعێکی جوانە کە دەبێ شیبکرێتەوەو مێژوو بابەتێکی شاعیرانەی گرنگە و خەڵکی لە بری ئەوەی لایەنی فەلسەڤی بخەنە ئەستۆی شیعر، ئەرکی مەدەنی یان کۆمەڵایەتی لێ بار دەکەن. (ئەلکساندەر پوشکین) کاتێ باسی "هونەر بۆ گەل" دێتە ئاراوە بە ڕستە مەنشوورەکەی (نیکراسوف) وەڵام دەداتەوە: "تۆ دەتوانی شاعیر نەبی– بەڵام دەبێ هاوڵاتی بی" بەلای هەندێ لە هونەرمەندانی دیکەی ئەم قۆناغەوە، وەکو تیوفیل گوتیە و لایەنگرانی هونەر بۆ هونەر، شاعیری کارێکی سەنعەتکارانەیە و شیعر بەرهەمێکی جەواهێرسازییە. لەگەڵ ئەمەشدا ئامانجی هەموو ئەم کەین و بەینە مەوزوعیەت بەخشینە بە شیعر. بەڵام جیاکردنەوەی شیعر لە سۆز و گوداز و هەڵچوون و سەراب و تراویلکەی ناوەوە دەکاتە ئەوەی کە شیعر لەخۆی جیا بکەینەوە. چەند شاعیرێك لە شاعیرانی قۆناغی ریالیست هەرچەندێك گەورەبن، خەسڵەت و سیمای فێرکاری، گێڕانەوەکاری، یا ئەخلاقی شیعرەکانیان ئێمە لەوان جیا دەکاتەوەو دەشێت بگەینە

ئەم ئامانجگیرییەی کە شیعر لە قۆناغی نێوان رۆمانتیزم و سەمبولیزمدا، بۆ ماوەیەك لە خەودا بووە.
سەردەمی ریالیست سەردەمێکی رەخنەوانییە. بە چەکی هۆشیاریی رۆشنبینانە بەرانبەر فەرمانڕەوایی و زاڵی حەساسیەتی زەینی و هێزی خەیاڵ دەوەستێتەوە. نیتشە سەردەمەکەی خۆی ناودەنێ سەردەمی "ویستی بێ پایانی گەیشتن بە ئاگایی". تین-ی فەیلەسوفی فەرەنسی دژی (خەون و تەجرید) هەڵدەستێ، (رینان) نووسەر بەهاوتای فەیلەسوف و هزرڤان دەزانێ و دەڵێت: "کاتێ کە نووسەر بتوانێ ئەوەی بنجبڕە بنجبڕی بژمێرێ، لە گێن بەلەگێن بزانێ و ئەوەی کە مومکینە بە مومکینی بخوێنێتەوە، دەبێ ویژدانی رەحەت و ئاسوودە بێ." و دەبێ ئەوە بگوترێ کە زەمینەی بنەڕەتی ئەم قۆناغ و سەردەمە، ئەم فەیلەسوف و نووسەرانە بە زەبری بەرهەمی خۆیان لە بوارێن رەخنە، مێژوو و دۆز و مەسەلانی دیکەدا خۆشیان کردووە: ئەسڵی ئەنواعەکەی داروین، دەرسەکانی فەلسەفەی پۆزۆتیفزمی ئوگوست کونت، هەوەڵین بنەما-ی سپینسەر، پرت روبالی سنت بوف لە جوملەی ئەو بەرهەمانە بوون.
وێڕای ئەمەش لە سیستەمی داهێنانی ئەدەبی دا، پێشکەوتنی رۆمان حاشا هەڵنەگرە. قۆناغی رۆمانتیك چەند رۆماننووسێکی بەخۆوە بینی بوو، بەلام سالانی ١٨٥٠ تا ١٨٩٠ لە ئەدەبیاتی رۆژئاوادا، سەردەمی رۆمانە. چ لە رووی چۆنی و چ لە باری چەندییەوە رۆمان لە پلەی یەکەمی گرنگی و بایەخدا بوو.

## ( رۆمان و بێرونگەرایی )

ریالیزم بە پلەی یەکەم کەشف و دەربڕینی واقیعێکە کە رۆمانتیزم یان گوێی نەدەدایێ یان مەسخی دەکرد. جا لەم قۆناغی فەرمانڕەوایی زانست و فەلسەفەی پوزۆتیفزمەدا. رۆمان ناتوانێ بوونی خۆی بسەلمێنێ مەگەر بەوەی کە وەهم و خەیاڵ وەلاوە بنێ و پەنا وەبەر دیتن بەرێ. فلوبیر دەڵێت: "رۆمان دەبێ هەمان رێچکە و رێبازی زانست بۆخۆی هەڵبژێرێ." تین دەڵێت: "ئەمڕۆکە رۆمان و رەخنە یان رەخنە و رۆمان زۆر لێکدییەوە دوور نین. هەردووکیان بریتین لە لێکۆڵینەوەیەك یان خوێندنەوەیەك دەربارەی مرۆڤ." هەموو ئەو شتانەی کە لە رۆمانتیزم دا، شتی ناواقیعی لە جێی واقیعی دادەنا: "وەکو میتافیزیقا، فانتازیا، خەون، ئەفسانە، جیهانی فریشتە، جادوو تاپۆیان" بۆیان نییە بێنە ناو قەڵەمڕەوی ریالیزمەوە.
هەڵبەتە بایەخدان بەسەرزەمینانی دیکەو زەمان و رۆژگارانی دیکە (سەفەر لە شوێن و سەفەر لە کات)دا کە لە تایبەتمەندییەکانی رۆمانتیزم بوو، هیچیان (شوێن و کات) لە ئەدەبیاتی ریالیستی دا نەسڕاونەتەوە. لێ سەفەری واقیعی و دیتنی ئەو سەرزەمینانە شوێنی ئەو سەرزەمینە دوورە دەستەخەیاڵییانەی گرتووەتەوە: فلوبیر بەر لە نووسینی (سالامبو) بۆ (تونس) سەفەر دەکات. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی سەفەر لەناو یەك وڵاتدا ئاسانترە لە سەفەر بۆ وڵاتانی دوورە دەست، رۆمانێن نووسەرانی ریالیست زیاتر شەرح و راڤەی شار و گەڕەکەکانی وڵاتی خۆیان دەگرێتەوە. (بۆ نموونە، نۆرماندی لە بەرهەمەکانی فلوبیر و موپاسان، بری لە بەرهەمەکانی جورج ساند،

ستۆكهۆلم له بەرهەمەكانی سترینبرگ، سیسیل لە بەرهەمەكانی ورگا، رۆمانی لە بەرهەمەكانی ئەمنیسكودا شوێنی گرنگیان گرتووه.) هەروەها مێژووش سەرچاوەو ئیلهامبەخشی زۆر بەرهەمی ریالیستییه. له (سالامبۆ)ی فلوبیرەوە بیگره تا دەگاتە رۆمانەكانی (هنریك سینكویچ) كه پۆلەندای نێوان سالانی ١٦٤٨-١٦٧٢ سەر لەنوێ دروست دەكاتەوه. بەلام رۆماننووسی ریالیست، مێژووش وەكو سەرچاوەیەكی هوشیاریی ورد وەردەگرێ نەك سەرچاوەیەك بۆ خەیالریسی. جا لەبەر ئەوه ئەو رابردووەی كه لە بەرهەمێن ریالیستیدا دەخرێتە روو زیاتر رابردووی نزیكی كۆمەلگەیەكە كه خودی نووسەر سەر بەو كۆمەلگەیەیه. شانفلوری لە سالی ١٨٧٢دا بەمجۆره پێناسەی ریالیزم دەكات: "مرۆڤی ئەمرۆ، لە شارستانیەتی تازەدا." و موپاسان له سالی ١٨٨٧دا وێنەیەكی دیكەی ئەو پێناسەیەمان دەداتێ:"دۆزینەوەو پیشاندانی مرۆڤی هاوچەرخ وەكو چۆن هەیە." بە كورتی و كوردی بلیمەتی نووسەری ریالیست لە خەیالریسی و داهێناندا نییه، بەلكو له سەرنجدان و دیتندایه.

ناتوانرێ رۆمانتیزم و ریالیزم وەكو دوو قوتابخانەی (ناواقیعی) و (واقیعی) لە بەرامبەر یەكتردا دابنرێ. رۆمانتیزم جیهانی هەست پێكراوی كەشف كردووه و لە راستیدا سەرەتایەكە بۆ ریالیزم. بەلام رۆمانتیزم كاتێ سەروساخت لەگەل واقیعدا پەیدا دەكات بە پەلە و زەینیانە مامەلەی لە تەكدا دەكات. ریالیزم بە هەمان شێوە جێی رۆمانتیزم دەگرێتەوە كه شیكاری و شرۆڤە جێی لێكدان (تركیب) دەگرێتەوە و دۆزینەوە و تاقیبی ورد جێی ئیلهامی سەرانسەری دەگرێتەوە. ریالیزم لایەنگری شیتەلكردنەوەی وردە بەشەكانە، كاتێ بالزاك دەنووسێت: "تەنیا شیتەلكردنەوەی جوزئیات دەتوانێ بایەخی پێویست بەو بەرهەمانە ببەخشێت كه بە درشتی رۆمان خوێنراونەتەوه." و كاتێ ستاندال باسی "رووداوی بچووكی واقیعی) دەكات، لە راستیدا هەردووكیان هەوالی ریالیزم رادەگەیەنن. (واترلۆ)ی هۆگۆ لە (بێنەوایان)دا رۆمانتیكە و (واترلۆ)ی ستاندال له (دێری پارم)دا ریالیستییه.

ئەم لایەنگرییە لە ئاگایی بابەتی و ورد كە بەسەر ریالیزمی رۆژئاواییدا زالە زادەی هەلومەرجێكی هزری و كۆمەلایەتی تایبەتییه. سەردەم، سەردەمی زانست و هونەره. هەموو هزرڤانانی مەزنی زەمان هەولدەدەن بگەنە رێبازێكی ئاگایی و رێبازێكی پراكتیكی ورد: ناسین و كەشفكردنی دنیا بۆ گۆرینی دنیایه. هەلبەته بۆ ئەم ناسین و كەشف و كەشفكاری و ئاگاداری و زانیاریانە بە هیچ جۆرێ جایز نییە پەنا وەبەر خەیالریسی و جیهانی خەونان ببرێ. زانستەكان، میتۆدی وردی خۆیان هەس. ئەو یاسایانەی كە لە واری واقیع دا وەدەست هاتوون وەكو سوودمەند بوون، گۆران، هەلبژاردنی سروشتی و خەباتی چینایەتی- لە هەمان كاتدا كە ئیمكانی كاركردن دەربارەی دنیا بە ئێمە دەدەن، رێگەشمان نادەن لە دەرێی ئەواندا هەنگاو بنەین، ناچاری جۆرە قبولكردنێكی قوولمان دەكەن. ئەمەش دروست نییە كە بلێین سەردەمی ریالیست پاش قۆناغی رۆمانتیك، رەشبینییەكی تێك شكاوە كە لە دوای قۆناغێكی ئومێد و ئیمانەوه هاتووه.

(تیبوده)ی ڕەخنەگر و فەیلەسوفی فەرەنسی، ڕۆمانی ریالیستی بە دامرکانەوەی هەڵچوونێك لە قەڵەم دەدا. ریالیزم بە ئەنجامی جۆرە شتێك دەژمێرن کە لە دوای ساڵی ١٨٤٨ و نەمانی خەونە گەرمەکانەوە هاتۆتە دی. هەڵبەتە گومان لەمەدا نییە کە جۆرە ڕەشبینییەکی ریالیستی هەیە. (رنان) دەڵێت کە حەقیقەت خەمناکە و (نیتشە) حەقیقەت بە مەرگبار دادەنێ. ڕۆمانتیزمی فەرەنسە بە (سەرهەڵدانی مەسیحیەت)ی شاتۆبریان دەست پێدەکات کە دەربڕی باوەڕە، لێ وەلامی ریالیزم بۆ ئەم قۆناغە کتێبی (مێژووی سەرچاوەکانی مەسیحیەت)ی رنانە کە بەرهەمێکی ڕەخنەییە و لەسەر بناغەی گومان و دوودڵی ڕۆنراوە. لە بەرانبەر گەشبینی سیاسی ڤیکتۆر هۆگۆ و لامارتین دا، نەهلیزمی کۆمەلایەتی فلۆبێر و نووسەرانی دی دێتە ئاراوە. لێ دەشێت پێچەوانەش ڕاست بێ. ئایا ڕۆمانتیزم لە زۆر بواردا ڕەنگدانەوەی نائومێدی ڕەنجان و تۆران نییە؟ لە ڕوانگەی دۆستۆفسکییەوە مرۆڤی ڕۆمانتیك کەسێکە کە پەی بە پوچی بەهاکانی سەدەی هەژدەیەم بردبێ، ئەو بەهایانەی کە لەو سەدەیەدا دژی بەها کلاسیکەکان وەستابوونەوە. بە بۆچوونی دۆستۆفسکی پەیامی سەدەی ئەو ئەمەیە کە بە باوەڕ و ئیمانێکی (مەزەبی و کۆمەلایەتی) نۆسازەوە ڕووبەڕووی ئەو خەمە فەردییە ببێتەوە کە بایرون و لرمانتۆف نوێنەرایەتیان دەکرد.

هەڵبەتە ئەدەبیاتی ریالیستی کۆمەڵگەی هاوچەرخ و پێکهاتەی دۆزەکانی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات بە بابەتی خۆی: یانی ئەو کۆمەڵگەیە هەیە و بەرهەمی ئەدەبی ناچار دەکات کە بکەوێتە نیشاندان و شیکردنەوەی. ئەدەبیاتی ڕۆمانتیك ئەدەبیاتی ئەرستوکراتی و فەردی بوو، خوێنەری تایبەتی و دیاری کراوی نەبوو. لێ لە ناوەندی سەدەی نۆزدەدا کۆمەڵگەیەکی هەمەجۆر دروست بوو. بورژوازی بە شێوەیەکی بنجبڕ شوێنی ئەرستوکراتیەتی گرتەوەو جڵەوی بەڕێوەبردنی ڕاپەڕینی پیشەسازی گرتە دەست و هەر ئەم چینە بوو کە کتێبی دەکڕی و دەیخوێندەوەو سەرکەوتنی شانۆنامەکانی لە هۆڵی شانۆکاندا زامن دەکرد. دنیای هاوچەرخ بواری بەرهەمێن ئەدەبی بوو، هەڵبەتە ئەم بەرهەمانە خاڵە لاواز و سەلبییەکانی هەمان کۆمەڵگەیان دەخستە ڕوو و بەها کۆن و سواوەکانیان دەدایە بەر ڕەخنە و ڕەخنەکاری. بەرجەستەترین بەرهەمی ئەدەبی ڕەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ناڕەزایی بوون. ڕق و کینە لە بورژوازی بەلای (فلوبێر) و برایانی (گونکور)ەوە نیشانەی زیندوویەتیە. ئیبسن، ستریندبرگ، تورکینیف و تۆڵستۆی لە بەرهەمەکانیاندا بورژوازی سەردەمی خۆیان مەحکوم و تاوانبار دەکەن. یان باشتر وایە بڵێین کە خودی بورژوازی خاڵە لاوازەکانی خۆی ئاشکرا دەکات. کتێبی (سەرمایە) یان سەربوڕێن ڕاوچییەك) لە لایەن کرێکاران و زەحمەتکێشانەوە نەنووسراوە. ئەدەبیاتی کۆمەلایەتی، ریفۆرمخوازی یان شۆڕشگێڕی، بەری کاری نووسەرانی بورژوازییە. هەروەها (ڕۆمانێن عامیانە) کە لە ئاخر و ئۆخری دەورانی ڕۆمانتیکدا سەری هەڵداوە: وەکو هەندێ کاری (ئوجین سو)، (هۆگۆ)، (دیکنز)، (بالزاك) باسی خەڵکی دەکەن و خەڵکی دەدوێنن، هەروەها باسی خەڵکی کوچە و بازاڕ و جەرگەی کۆمەڵگەی لەندەن و پاریس بۆ بورژوازی

سەردەمی خۆیان دەکەن و لە راستیدا بە کەشف کردن و ناساندنی بەدبەختی و رۆژڕەشی ئەو رۆژگارە، بورژوازی دەخەنە خانەی مەسئولیەتەکانی خۆیەوە.

## فلوبیر و ریالیزم

گەورەتری نووسەری ریالیست لەم قۆناغەدا گوستاف فلوبیرە، مادام بوڤاری کە شاکاری ئەوە، بە کتێبی موقەدەسی ریالیزم دەژمێردرێ. بابەتی ئەم کتێبە چیرۆکێکە کە بەڕاستی لە فەرەنسادا روویداوە و قارەمانانی ناو چیرۆکەکە خەڵکانی ئاسایین و هیچ جۆرە خەیاڵێك دەستی لە خوڵقاندنیاندا نەبووە. لە دەسپێکی یەکەمین لاپەڕەکانی کتێبەکەوە توانای نووسەر لە بوارەکانی دیتن و تۆمار کردنی راستییەکانی ژیاندا بەرچاو دەکەوێ. لە "مادام بوڤاری)دا هیچ شتێکی خەیاڵی و نائاسایی نابینرێ.

فلوبیر ژیانێکی واقیعی بە قارەمانەکانی بەخشیوەو پاشان تاکو مردن پەیگیری کردوون. بەڵام ئەویش وەکو بالزاك هەرگیز بیروباوەڕی خۆی لە شێوەی یاسا و رێسای بنجبڕدا نیشان نەداوەو نەسەپاندووە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە هیچ نووسەرێك بە ئەندازەی ئەو دەربارەی هەلومەرجەکانی داهێنانی رۆمان بیری نەکردۆتەوەو مێشکی خۆی نەگوشیوە. نامەکانی ئەو کە یەجگار فرەو هەمەجۆرن پڕن لە باری سەرنج و تێبینیان چ دەربارەی هەلومەرجەکانی کارە داهێنراوەکانی خۆی و پێدا چوونەوەو دووبارە نووسینەوەیان و چ دەربارەی هەلومەرجە گشتیەکانی هونەری رۆماننووسین.

فلوبیر وەکو کاردانەوە لە هەمبەر ئەو رەوتانەی کە پاشساڵی ١٨٥٠ لە ئەدەبیاتدا پەیدا بوو بوون، ئەو بۆچوونە رەتدەکاتەوە کە رۆمان دەبێ ئامانجێکی ئەخلاقی روونی هەبێ یان لە فکرۆکەیەکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی و یان مەزەبییەوە هەڵقوڵابێ. وەکو چۆن (بودلیر) و (پارناسینەکان) گوتویانە، رۆمان وەکو ژانرێکی ئەدەبی، رێك وەکو شێوەکاری، مۆسیقاو یان شیعر سەر بە جیهانی هونەرە. جا بۆیە، دەبێ یەکەمین خەمی رۆماننووس چۆنیەتی نیشاندان بێ. فلوبیر دەڵێت: رەخنە لە نووسەرانی خاوەن شێوازی چاك دەگرن کە فیکری ئەسڵی و ئامانجی ئەخلاقیان فەرامۆش کردووە، وەکو بڵێی ئامانجی پزیشك شەفابەخشین، ئارمانجی نیگارکێش وێنەگرتن و ئامانجی بولبول خوێندن نەبێ و بەو پێودانگە ئامانجی هونەریش بەر لە هەر شتێکی دی جوانی نەبێ...

رۆماننووسێك کە رۆمان دەخاتە خزمەتی تێزێکەوە، نەك هەر خیانەت لە پەیامی هونەرمەند دەکات، بەڵکو پایەی هونەر دێنێتە خوارەوەو دەیکات بە شتێکی سواوی بازاڕی و بیەوێ و نەیەوێ لە جیاتی ئەوەی هونەر ئامانجی خۆی بێ دەیکات بە ئەوزار: ئەوزارێکی پڕ سوود بۆ هەدەف و ئارمانێك کە بە زۆری قازانجێکی تێدایە:

وەکیل مەئابی لە هەموو شوێنێ رەگی داکوتاوە، کەڵکەڵەی وتاربێژی، قسەکردن و بەرەڤانی، خواوەندی هونەر دەبێ بە سەکۆیەك بۆ سەرکەوتنی هەزاران حەسوودی و.. ئاە ئەی ئولەمپ-ی داماو، ئەوانە ئامادەن لوتکەی تۆ بگۆڕن و بیکەن بە مەزرای پەتاتە.

ئایا مەبەستی فلۆبیر ئەمەیە کە رۆمان دەبێ لە هەر جۆرە ئایدیالێکی ئەخلاقی دووربێ؟ نە، بە هیچ جۆرێ نا، چونکە ئەگەر نووسەر جوانیی هونەری بەدەست بێنێ، لە هەمان رێگەوە دەگاتە جوانی ئەخلاقیش و بەمجۆرە سوودمەند و کاریگەر دەبێ:

کەواتە هونەرش وەکو تەبیعەت بە زەبری بەرزی و شکۆی خۆرسکی خۆی، دەبێت بە کارێکی ئەخلاقی و سوودمەند. کەماڵخوازی و کەماڵ وەکو خۆرێکە کە هەموو لەوتاوییەکانی زەوی رادەکێشێت و وشکی دەکاتەوە.

جگە لەمانە، جوانی خەیاڵ، لە جوانی فۆرم و قاڵب جیا نابێتەوە (بوفون) بۆ یەکەمجار ئەو خاڵەی بەوپەڕی روونی دەربڕیوەو گوتویەتی: "شێواز بریتییە لەو نەزم و بزاڤەی کە مرۆڤ بە بیر و بە خەیاڵەکانی خۆی دەبەخشێت." ئەوەی خەڵکی بە گوێرەی عادەت دەیکەن بە دوو بەشی (فۆرم) و (ناوەرۆك)ەوە لە راستیدا یەك شتن و (فۆرم) و (ناوەرۆك) دوو روانگەی جیاواز و چۆنایەتی یەك کرۆك و جەوهەرن:

شاعیری فۆرمالیست! بۆچی پەیتا پەیتا دەڵێت کە من بریق و باق و زێڕ و زیوم خۆشگەرەکە؟ ئەمانە ووشەی قەبە و قەڵەوو پووك و پووچن و قازانجپەروەران بەسەر هونەرمەندانی واقیعی دا پەخشی دەکەنەوە. من تا ئەو زەمانەی کە کەسێك پەیدا نەبێ و نەتوانێ بە رستەیەك فۆرم و ناوەرۆك لێکدی جودا بکاتەوەو بە جیا جیاو یەك بە یەك نیشانمی بدات، من هەر لە سەر ئەم باوەڕەی خۆم دەمێنمەوە کە ئەم دوو وشەیە بێ مانان. هیچ بیرێکی جوان بەبێ فۆرمی جوان و هیچ فۆرمێکی جوان بەبێ بیری جوان بوونی نییە و نابێ.

بەم شێوەیە لە روانگەی فلوبیرەوە، رۆماننووس بە پلەی یەکەم، هونەرمەندێکە کە ئامانج و مەبەستی داهێنانی بەرهەمێکی هونەری تەواوە. لێ ئەم ئایدیالە بەدەست نایەت مەگەر نووسەر وەکو چۆن کە دەربارەی پرسێن جیاواز بیرۆکە پەراگەندەکانی لە مێشکی خۆی دوور دەخاتەوە، بەو ئاوایە کاردانەوە ئیحساساتیەکان و هەڵچوونە شەخسەکانیش لە خۆی بتارێنێ. رۆماننووس دەبێ بەرهەمی (غەیرە شەخسی) بەرهەم بێنێ. لەم گۆشە نیگایەوە هیچ کەسێك بە ئەندازەی رۆماننووس لە شاعیری لیریکی جیاواز نییە. تۆ حەیفت دێ کە سروودی خۆت گوتووە. ئەم کارە رەنگە تاقە جارێك، و لە یەك هاواردا، ئەنجامبەخش بێ، لێ هەر هەوێنێکی لیریکی کە بۆ نموونە بایرون هەیبێ، شەکسپیر بە شێوازی غەیرە شەخسی پەڕجووئاسا تێك و پێکی دەشکێنێ و دەیخاتە لاوە... هونەرمەند دەبێ کارێك بکات کە خەڵکی دواڕۆژ گومان بکەن کە ئەو نەژیاوە.

ئەوانەی سۆز و گودازی خۆیان لە بەرهەمەکانیاندا بەرجەستە دەکەن، شایستەی ناوی هونەرمەندی واقیعی نین و لەم رووەوە لە روانینی فلوبیرەوە بچووك دەبنەوە:

هەموو ئەوانەی کە باسی ڤیانی نەبەکامی خۆیان، باسی گۆڕی داك و بابیان، باسی یادگاری ئازیزانیان بۆ ئێوە دەکەن، منداڵیان ماچ دەکەن و لەبەر تریفەی مانگ دا دەگەرێن، بە دیتنی مناڵان سۆزیان دەجووڵێ و دەکەونە ورێنە، لە شانۆدا دەبوورێنەوە و لە بەرامبەر ئۆقیانووسدا دەکەونە رامان و تێفکرین هەموو لە یەك قوماشن! لیبۆکن! لیبۆك! بۆ وەدەست هێنانی شتێك بەسەر دڵی خۆیاندا تەقڵە لێدەدەن.

ئەم رستەیە دەقاودەق ئاراستەی لایەنی شەخسی و تایبەتی رۆمانتیزمە. هونەر بەلای فلوبیرەوە زۆر نزیکی زانستە و چۆن دانا بێ لایەنانە مامەڵە لەگەڵ ئەو تەبیعەتەدا دەکات کە دەیخاتە بەر وردەبینی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەوە رۆماننووسیش دەبێ بەرامبەر بەو بەشەریەتەی کە وێنەی دەگرێ تەواو بێ لایەن بێ و رێگەی سۆز و گوداز نەدات. رۆماننووس، بۆ ئەوەی ئەم وێنەگرتنەی دروست و واقیعی بێ، دەبێ دادپەروەر بێ و سەبارەت بە کاراکتەرانی هەمان بێ لایەنی قازی هەبێ سەبارەت بە لایەنەکانی دەعوا:

ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە کە عەدالەت بێنینە ناو هونەرەوە؟ لەو حاڵەتەدایە کە بێلایەنی وێنەگرتن، گەورەیی قانوون و وردی زانست پەیدا دەکات "١" (لە نامەیەکی فلوبیر بۆ جۆرج ساند لە ١٨٦٨/٨/١٠ وەرگیراوە)

وەکو چۆن قازی دەبێ لە هەر جۆرە بەرژەوەندییەك دابڕێ.

رۆماننووسیش دەبێ سەبارەت بەو ژیانەی کە وێنەی دەگرێ بێ لایەن بێ. چونکە ژیان بابەتی کاری رۆماننووسە. کەواتە رۆماننووس دەبێ خۆی لەوە دووربگرێ بکەوێتە بەینی چەکوش و سندانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. چونکە بەو خۆپاریزی و دابڕانە رێژەییە دەتوانێ واقیعی دەرەکی وردتر و دروستتر وێنە بگرێ و نیشان بدات. لە ١٥/دیسامبەر/١٨٥٠دا نووسیویەتی کە:

مرۆڤ کاتێ ئاوێتەی ژیان دەبێ، وەکو پێویست ژیان نابینێ. ئەو ئایدیالخوازییەی کە هونەرمەند هەیەتی بۆ ئەو حوکمی قانونی هەیە و ئەمەش رێگەی دەدات کە تایبەتمەندییە گشتییەکانی (نموونە)یەك بە کاراکتەرانی بدات. لە راستیدا جوانی رۆمان لەوەدا نییە کە تایبەت مەندی ریزپەڕ یان بێ وێنەی تاکێك شرۆڤە بکرێ، بەڵکو دەبێ هەر کاراکتەرێکی رۆمان مرۆڤێك بێ بە هەموو بوونێکی مرۆڤانییەوەو نموونەی گروپە بەشەرێك بێ بەتایبەتمەندییە گشتییەکانیانەوە:

هونەر بۆ وێنەگرتن و نیشاندانی ریزپەڕان (استپناو) نەهاتۆتە ئاراوە... رەنگە ئەو کەسەی مامەڵە لەتەك تۆدا دەکات، زۆر لە جەنابی (گۆستاف فلوبیر) لە بەردڵان تر بێ، چونکە حاڵەتێکی گشتی تر و لە ئەنجامدا (نموونەیی)تری هەیە. یەکێك لە لەمپەرە بنەڕەتییەکانی ئەم راستگۆییە (ئیلهامە). فلوبیر تانە و تەشەر نەماوە لەم حاڵەتە ناپایەدار و لەم هێزە رازئامێزەی نەدابێ کە لە نکاودا یەخانگیری نووسەر دەبێ و بەشێوەیەکی کاتی جڵەوی لە دەست دەردێنێ:

پێویستە سڵ لە ئیلهام و هەر شتێکی تری لە بابەتی ئیلهام بکرێتەوە. چونکە ئەمە جۆرە تەرەفداری و جۆشێکی دەستکردە کە مرۆڤ بە ئانقەست لەخۆیدا دەیخولقێنێ و خۆبەخۆ دەرناکەوێت ئەمە جگە لەوەی کە مرۆڤ بە (ئیلهام) نازێ. (پیگاز) (رەمزی ئیلهامە لە ئەفسانەکانی یۆنان دا و لە شێوەی ئەسپی باڵداردایە) زۆرجار لە بڕی ئەوەی لە چوار ناڵە بدات بە رەوتە دەڕوات. هەموو بەهرەی مرۆڤ لەمەدایە کە رەفتاری ئەو بەو شێوەیەی کە دەیەوێ نیشان بدات* (* لە نامەیەکی فلوبیر بۆ لویز کولە، لە ١٣/دیسامبەر/١٨٤٦ وەرگیراوە.)

بە باوەڕی فلوپیر، ئیلهام کە لە هەموو هونەرەکاندا موزیرە، ئەوا لە هونەری رۆماننووسیندا زیانەکەی دووچەندانەیە. چونکە جگە لەوەی کە نایەڵێ نووسەر وشیارانە سوود لە هەموو توانا

هونەرییەکانی خۆی وەربگرێ، ئەو سەبر و حەوسەڵە و هەوڵدانانەشی لەلا نایەڵێ کە پێویستە بۆ فەراهەم کردنی کەرەستەی پێویست بۆ بەرهەمەکەی، واتا بەهرەی دیتن و خوێندنەوی هونەری لەلا دەکوژێت. چونکە رۆمان، بەگوێرەی بۆچوونی فلوپیر، تەنیا کارێکی هونەری نییە، بەڵکو لە هەمان کاتدا کارێکی ریالیستییە. چونکە تاقیبی ورد و سەبوورانەی ئەمری واقیع، وردە کارییەکانی ژیانی رۆژانەو نموونەیی و جم و جۆڵ و رەفتارێن نهێنی ئامێز لەگەڵ درەوشانەوە ناگەهانییەکانی خەیاڵ و سەرمەستی تیژتێپەڕدا ئەوەندە سازگارە مەگەر کاری قورس و وردی هونەرمەندی مۆسیقازان لە رەچاوکردنی وەستان و دەنگ دا ئەوەندە زەحمەت و قورس و دژوار بێ.

موپاسان لە پێشەکی (پییر و ژن- ١٨٨٨)دا پەند و ئامۆژگارییەکانی فلوپیر بەزمانی ئەوەوە واهی دەگێڕێتەوە: ئەوەی کە مرۆڤ دەخوازێ دەریبڕێ، دەبێ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و زۆر بە وردی بیخاتە بەر وردەبینی سەرنجەوە، تا بتوانێ لایەنێکی لێ بدۆزێتەوەو کەشف بکات کە پێشتر لە لایەن هیچ کەسێکەوە نەگوترابێ. هەرشتێك بگری لایەنێکی پەنهان و دەرنەبڕدراوی هەیە. چونکە ئێمە بەوە راهاتووین تەنها بۆ ئەو شتەی لە بەردەمماندایە سوود لە چاوانمان وەربگرین. بچووکترین شتان لایەنی پەنهان و کەشفنەکراوی خۆیان هەیە... لە سەرمانە ئەو لایەنانە بدۆزینەوە... تەنیا بەمە کاری مرۆڤ جوانی و رەسەنایەتی پەیدا دەکات.

کەواتە رۆماننووس دەبێ بە بەردەوامی بڕوانێتە واقیع و لێی ورد بێتەوە تا تایبەتمەندێین تازەی لێوە هەڵێنجێ و کەشف بکات: ئەو تایبەتمانندییانەی کە چاوانی بێ بەهرەتر و بێ دیقەتتر ناتوانن بیدینن. بەرە بەرە بەوە ڕادێ کە (ئادەمیزادانی دەوروبەری خۆی بە شێوەی کتێب بدینێ) و بە جۆرە تەقەلایەکی زەینی کە بەزۆری بە ئێش و ژانە "خۆی بە ناخی قارەمانانی رۆماندا دەکات نەك قارەمانەکان بەرەو خۆی رابکێشێت."

بە رامان لەو فرمۆڵەی سەرێ، پیاو پەی بەوە دەبات کە چۆن دوو فاکتەری گرنگی شێوازی فلۆپیر، واتە کاریگەری پەزێری و دیتن، بە شێوەیەکی ناسك دەچنەوە سەر یەك و پەیوەندی پەیدا دەکەن.

لێ ئەو زیانەی کە سەرۆ (ئیلهام) بە سێیەم فاکتەری شێوازی فلۆپیری، واتە (بە فۆرمی) دەگەیەنێ، لە دوو فاکتەرەکەی دیکە کەمتر نییە. لە راستیدا هونەری پەخشاننووس گەلەك دژوارترە لە هونەری شاعیر. چونکە شاعیر پشت بە کۆمەڵێك (یاسای جێگیر) و (هەندێ رێنمایی پراکتیکی دەبەستێ کە زانست و هونەری پیشەکەی ئەو پێك دێنێ) بەڵام: "لە کاری پەخشاندا پێویستی بە هەست کردن هەیە، هەست کردنێکی قووڵ بە جۆرە کێشێکی جیوەیی، بەدەر لە هەر یاسا و رێسایەکی بنجڕ و جێگیر، پێویست بە کۆمەڵێك تایبەتمەندی و خەسڵەتی زکماك و توانای ژیری، و هەستی هونەرمەندانەی زۆر ناسك و ڕسکاو هەیە تا بتوانرێ لە هەر ساتێکدا جووڵە، رەنگ و ئاهەنگی شێوازی نووسین بە گوێرەی ئەو بابەتەی دەبێ بێتە دەربڕین، بگۆڕدرێ* (لە پێشەکی پییرو ژن، وەرگیراوە کە بە زمانی فلوپیرەوە گێڕدراوەتەوە.).

جگە لەو دژوارییانەی کە پەیوەستن بە (شێوان)ەوە، کۆمەڵە دژوارییەکی دیکەش هەن کە پەیوەندییان بەکاری (پێکهاتەی کەلامەوە) هەیە و زۆریش گرنگن. سەبارەت بە بەشە جیاوازەکانی بەرهەمێك، روونی و هاوئاهەنگی بەرهەمەکە، گواستنەوە لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی دیکە و ئەو شتانە، بۆ رۆماننووسی پابەندی هونەر زۆر گیروگرفتی فراوان دەنێتەوەو خودی فلۆبیر زۆری ئەزیەت بەم بابەتەوە دیتووە.

هەڵبەتە شێوازی فلوبیر بەسەرمەشق بۆ هەموو بەرهەمێن ریالیستی نایەتە هەژماردن چونکە فۆرم گەرایی توندڕەوانەی شێوازی فلوبیر دەمانباتە سەر رۆمانێك کە بریتییە لە فۆرمی رووت و ناوەڕۆکە مادییەکەی کە لە رێگەی دیتنەوە بەدەست دێ، یان بە تەواوەتی رەنگ دەبوێرێ یان دەبێتە بیانویەك بۆ (شێوان) بەماناو چەمکە فراوانەکەی ووشە، واتا هاوئاهەنگی ووشە و بونیادی رستە و دەستەواژەکان: واتا هەمان "کتێبێك لەسەر هیچ" کە فلوبیر لە کاتی دیتنی گەمەی روناکی لەسەر یەکێك لە دیوارەکانی (ئاکروپل) بیری لێ دەکردەوە: رۆمانێکی تەواو موجەڕەد کە هەموو جوانییەکی بریتییە لە پەیوەندی رەنگ و هێڵەکان و بونیادی رستەکان هەموو بوونی پێك دێنێ. بەڵام لەودیوی ئەم خەونەوە کە دەشێت نەیەتە دی، فلوبیر هەوڵی داوە ئایدیالێکی تازە پێشنیاز بکات و ئەویش ئەو یەکێتی و ئارەزووەیە کە تا زەمانی ئەو بە دژی یەك دەژمێردران: وردی و دەوڵەمەندی واقیع گەرایی و زەوقی هونەری خالیسە.

## قوتابخانەیەکی بابەتی و ناشەخسی

لە فەسڵی پێشوودا گوتمان رۆمانتیزم قوتابخانەیەکی زەینی یان خودییە، یانی نووسەر خۆی لە رەوتی نووسینەکەی هەڵدەقورتێنێ و لایەنی شەخسی و تایبەتی بە بەرهەمەکەی دەبەخشێ. بەڵام ریالیزم وەکو لەم نووسینەدا باس کراوە، قوتابخانەیەکی بابەتی یان بێرونییە و نووسەری ریالیست لە کاتی داهێنانی بەرهەمدا زیاتر تەماشاڤانە و بیروهزر و هەستەکانی خۆی لەناو بەرهەمەکەیدا دەرناخات. ریالیزم دەخوازێت هەموو واقیع کەشف بکات، بەڵام ئەم هەستە لەلای خوێنەر بخوڵقێنێ کە ئەمە واقیعە و بەو جۆرە دەردەکەوێ. جا بۆ ئەم مەبەستە پەنا وەبەر هونەری غەیرە شەخسی دەبات. رۆماننووس خۆی لە رازگۆییە سۆزدارییەکان و لە فەلسەفەڕێسی دەپارێزێ. تەنانەت وەکو نووسەری بەرهەمەکەش خۆی لەوە دوور دەگرێ کە لە بەرهەمەکەدا خۆی بنوێنێ. بەم جۆرە لە رۆمانی ریالیستیدا تەنانەت ئەو رێبازەش کە بالزاك لە بەرهەمەکانیا دەیگرتە بەر تەرك کراوە. رۆماننووس ئیدی هەقی ئەوەی نییە دەنگی خۆی تێکەڵ بە دەنگی قارەمانانی ناو بەرهەمەکەی بکات، قەزاوەتیان دەربارە بکات یان چارەنووسیان پێشبینی بکات. ئەو زانیارییە کە ئەو دەربارەی هەر یەکێك لە قارەمانەکانی هەیەتی، رێك بەو ئەندازەیەیە کە قارەمانەکانی تری رۆمان دەتوانن هەیانبێ. جا بۆیە هەرگیز خۆی وەکو بینەری چاك و شارەزا نانوێنێ.. گفتوگۆی نێوان کاراکتەرەکان بەرە بەرە شرۆڤەی رووداوەکە دەکەن و ئەو دیمەن و رووداوەش کە شەرح دەکرێ لە هەمان ساتی گێڕانەوەکەدا روودەدا.

لـیّ ئـەم خاڵـەش ئاشـكرایە كـە نووسـەر نـاتوانیّ بەتـەواوەتی بـوونی خـۆی لـە بەرهەمەكـەدا بشارێتەوە. هەرچەندە بە زمانی قارەمانەكەوە، بیرووبۆچوونی خۆی دەڵێت و لـە دروست كردنـی دیمەنەكاندا بەرجەستەی دەكات بەڵام چ گومانێك لـەوەدا نییـە كـە ئـەو بیروبۆچوونانە هـی ئـەون. وەكو چۆن مەتریالیزمی (ماڵباتی روگون ماكار) رەنگدانـەوەی هـزرێن ئـەمیل زۆلایـە، (حەتمیـەتی مێژوو) لە جەنگ و ئاشتیدا نیشاندەری هزرێن تۆلستۆیە و وێرای ئەوەی كە ئەم دوو بەرهەمە بـە شـێوازی ناتورالیسـتی نووسـراون و لایـەنی شەخسـی و دەروونییـان نییـە، لـیّ هـزرێن نووسەرەكانیان لە میانەی بەرهەمەكانەوە رێك بە ئەندازەی گەشبینی خێرخوازانەو میهرەبانانەی ڤیكتۆر هۆگۆ لە كتێبی (بێنەوایان)دا ئاشكرایە.

## ( قارەمانان و بابەتی بەرهەمی ریالیستی )

نووسـەری ریالیسـتی بـە هـیچ كلۆجیّ بـە پێویسـتی نـازانیّ كـە تـاكێكی دیـار و نائاسـایی و یـان سـەیر، كـە جیـاواز بـیّ لـە خـەڵكانی ئاسـایی، بكـات بـە قارەمـانی چیرۆك. قارەمـانی خـۆی لـەنێو خەڵكییـەوەو لـە هـەر ژینگەیـەك كـە خـۆی بیـەویّ هەڵدەبـژێرێت و ئـەم تاكـە لـە هـەمان كاتـدا هـەم نوێنەری هاونەوعەكانی خۆیەتی و هەم وابەستەی ئەو كۆمەڵگەیەیە كە تیایدا دەژی، لەوەیـە ئـەم تاكە نموونەی بەرجەستە و كاریگەری كۆمەڵە خەڵكێك بیّ، لیّ تاكێكی دیار و نائاسایی نییە. بۆ نموونە كاتیّ نووسەری ریالیست دەیەویّ جەنگ بكات بە بابەتی كتێبی خۆی، هیچ گومانی تێدا نییە كە بێتە سەر هەڵبژاردنی قارەمان، ئەفسەری بچووك یان سەربازی پیّ چاكترە لـە فەرمانـدەی لەشكر، چونكە ئەو سەربازە زۆر لە مەیدانی جەنگ نزیكترە و كاریگەری ئەو ژینگەیە لەسـەر ئـەو زۆر زیـاترە تـا لەسـەر فەرمانـدە. و هـۆی لایـەنگری زەقـی ریالیسـتان لـە خـەڵكانی (بچـووك و بـیّ بایەخ)ش هەر ئەوەیە.

نووسەری ریالیست سەبارەت بە بابەتی بەرهەمەكەشی، بە هیچ كلۆجیّ خۆی بەناچار نازانیّ كە وەكو رۆمانتیكەكان عەشق بكات بە بابـەتی رۆمـان. چونكە لـە روانگـەی نووسـەری ریالیستەوە ئەشـقیش دیاردەیەكـە وەكـو هـەموو دیـاردە كۆمەڵایەتییـەكانی دیكـە و لـە هـیچ دیاردەیـەكی دی زیـاتر نییـە. بۆیـە ئاسـاییە نووسـەری ریالیست كتێبیّ بنووسێت كە تاقە ووشـەیەكی لـەبارەی ئەشقەوە تیا نەبیّ و لە بری ئەوە باسی هەندیّ پرس و مەسـەلەێن دیكـە بكـات كـە بایـەخیان زۆر لـە ئەشـق زیـاترە. هـەروەها رووداوێـن بـە رێكـەوت و دوور لـە واقیـع و نـەگونجاو لـە بەرهـەمێن ریالیستیدا بەدی ناكرێن، بۆ وێنە هیچ كەسێك بە تاقە ئامۆژگارییەك رەفتـار و تەبیعـەتی نـاگۆڕیّ یان هیچ كەسێك لە سوێی عەشقی كەسێكی دی نامریّ. یەكێتیی دەستكردیان تێدا نییـە، بەڵكو رووداوەكانیان زنجیرە رووداوێكی ئاسایی و زۆرجار كۆمەڵـە حەقیقـەتێكی ئاڵۆزە كە دوابـەدوای یـەك روو دەدەن، لـیّ نووسـەری ریالیسـت هـەوڵ دەدا بـە كۆمـەكی گاریگـەری ژینگـە و كۆمەڵگـە دیـوی دەرەوەو نـاوەوەی قارەمانـەكانی خـۆی، و پەیوەندییـە سروشـتییەكانی نـوێی رووداوەكـان نیشان بدات.

## دیمەنسازی لە ریالیزم و رۆمانتیزمدا

دیمەن سازی و شرۆڤە و بەرجەستە کردنی ئەو ژینگەیەی کە رووداوی تێدا روودەدات لە بەرهەمی رۆمانتیکەوە بۆ بەرهەمی ریالیستی جیاوازە.

نووسەری رۆمانتیك کاتیٚ کە دەیەویٚ دیمەنی چیرۆکەکەی نیشانبدات هەقی بەسەر واقیعەوە نییە بەڵکو ئەو دیمەنە بەگوێرەی ئەو وەزعە دەخوڵقێنیٚ کە بە چیرۆکەکەی خۆیی داوە. و کارێك دەکات کە ئەو دیمەنەش کار لە خوێنەری هەستیار بکات و کاریگەری نووسینەکەی ئەو زیاتر بکات. لیٚ نووسەری ریالیست کە دیمەنان شەرح دەکات بە هیچ کلۆجیٚ ئەو مەبەستەی نییە، بەڵکو دیمەنەکان بەم مەبەستە شەرح و شرۆڤە دەکات کە خوێنەر لە ریٚگەی ناسینی دیمەنەکانەوە پتر ئاشنای قارەمانەکان و باری دەروونی و روحی قارەمانەکان بیٚ. واتە تەنیا ئەو کاتانە دەکەوێتە وەسفی دیمەنەکان کە پێویستی پێی بیٚ. بۆ نموونە بالزاك لە هەوڵی کتێبی (بابا گوریو)دا بۆیە هەموو هۆدەکانی ئوتێلەکەی (مادام ڤوکر) بەو وردییە وەسف دەکات تا ئەوە نیشان بدات ئەو باوکەی بە سۆزەوە هەموو سەروەت و سامانەکەی خۆی بە کیژەکەی بەخشی بوو، لە چ شوێنێکدا دەژیا و ئەو شوێنە دەیتوانی چ کاریگەرییەکی بەسەر باری دەروونی ئەو پیرەمێردەوە هەبیٚ. یان گوستاف فلوبیر لە رۆمانی (مادام بوڤاری)دا بەو مەبەستە ئەو هەموو وەسف و شەرحە دووروودرێژەی شارۆچکەی (یانڤیلی...) دەکات تا ئەوە نیشان بدات کە مەدام بوڤاری چەندیٚ لەوێندەر دووچاری دڵتەنگی و بێتاقەتی دەبوو. دەنا ئەگەر ئەم بەشە بەزیاد بزانریٚ و لە رۆمانەکە لابریٚ، ئەوا ئەو خوێنەرەی ئەم روونکردنەوەو شەرحە دووروودرێژەی نەخوێندبێتەوە، ناتوانیٚ پەی بەوە بەریٚ کە بۆچی (ئیما) لە کاتی پیاسە و گەڕاندا، دەکەوتە باوەشی رودلف، لە ئەنجامدا ئەم کارەی ئەو بە نائاسایی و غەیرە واقیعی تەسەور دەکات و بایەخ و بەهای ریالیستی رۆمانەکەی بۆ دەرناکەویٚ. ئەم هەولٚ و تەقەللایانە بۆ گونجاندنی قارەمانەکان و دیمەنەکانی رۆمانەکەیە لەگەڵ واقیعدا کە تەنانەت خودی نووسەرە گەورەکانیش دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە، تا ئەو رادەیەی کە کاتیٚ (ژۆل ساندو) دەربارەی مەرگی خوشکەکەی خۆی لەگەڵ بالزاك دا قسە دەکات، نووسەری گەورە لە نکاودا خۆی لە قسە نیوەچڵەکانی دۆستەکەی هەڵدەقورتێنیٚ و دەڵێت: "هەموو ئەم شتانە دەگوزەریٚ... دەبیٚ واقیعی بین. بەڕاست بڵێ بزانم دەبیٚ ئوژنی گراندە بدریٚ بە چ پیاوێك؟"

## ریالیزم لە وولاتەکانی دیکەدا

بەشێوەیەکی گشتی لە سالانی ١٨٥٠-١٨٩٠دا مقۆ مقۆو رەوت و رێبازێك کە زیاتر کاردانەوە بوو بەرامبەر بە رۆمانتیزم، لە ئەدەبیاتی هەموو وولاتانی رۆژئاوادا سەری هەڵدا، ئەم رەوت و رێبازە ماکی شەپۆلی ریالیزمی لەگەڵ خۆدا هەڵگرتبوو کە پاشان (ناتورالیزم)شی بەدوودا هات.

## ( له ئینگلیستاندا )

ئەم ساڵانە لە ئینگلیستاندا دەورانی فەرمانڕەوایی و زاڵی هێزی زانستی و پێشڕەوانەی (ستیوارت میل و داروین و سینسەر)ە کە لە دنیای ئەدەبدا رۆشنبینی ئاگایانەی تاکری لە بەرانبەر وەهم و خەیاڵاتی بایرون دا دادەنێ و بەڵگەنووسی چارلز رید و ویلکی کالینز و بەرهەمی مرۆڤپەروەری جۆرج ئیلیوت دەخاتە جێگەی خەیاڵاتی سۆزئامێزی والترسکوت و دواجار شیعری هزرێنراوو فەلسەفی براونینگ دەخاتە جێگەی غەزەلیاتی پەتی شیللی و کیتس. بەڵام ریالیزمی ئینگلیزی بەجۆرێ نییە کە دەقاودەق بە پاشکۆی ریالیزمی فەرەنسی بژمێردرێ، لە ئینگلیستاندا ریالیزم هاوزەمان بوو لەگەڵ قۆناغی فەرمانڕەوایی شابانۆ (ڤیکتۆریا)دا و ئەم قۆناغە کە بە (قۆناغی ڤیکتۆریا) ناو دەبرێ، یەکێکە لە قۆناغە پڕ بەخششەکانی ئەدەبیاتی ئینگلستان. هەڵبەتە دەبێ ئاماژە بۆ ئەم خاڵە بکرێ کە ریالیزم لە ئینگلستاندا جۆرە دابێکی بەردەوامە (دانیال دیڤو بە ئەندازەی تاکری ریالیست بوو) و هەروەها چونکە رۆمانتیزمی ئینگلیزی بە ئەندازەی رۆمانتیزمی فەرەنسا توند و پڕ جۆش و خرۆش نەبوو، کاردانەوەیەکی توندیشی لێ نەکەوتەوە و ریالیزمی ئینگلیزی بە شێوەیەکی میانڕەوانە دەستی پێکرد و لە دەربڕینی واقیعەکانی ژیاندا پەنای وەبەر تەنز و گاڵتە و گەپ دەبرد. لەلایەکی ترەوە قەراردادە کۆمەڵایەتییەکان کە لە ئینگلستاندا مایەی رێزە نەیهێشت کە ئازادییە ئەخلاقییە تایبەتییەکانی ناتۆرالیسم بێتە ناو ئەدەبیاتی ئینگلیزەوە.

لە ساڵی ١٨٣٥دا ریالیزمێکی پوختە و سەربەخۆ لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا، بەتایبەتی لەواری رۆماننووسیدا هاتە ئاراوە. دیارترین نوێنەری ئەدەبیاتی ئینگلیزی ئەم قۆناغە (چارلز دیکنز-١٨١٢-١٨٧٠)بوو کە هەجوی رۆمانتیزمی دەکرد، بەڵام لەباری مرۆڤدۆستییەوە هەر پابەندی رۆمانتیزم بوو. دیکنز سەر بە چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگە بوو و ناچار بوو لە منداڵییەوە بۆ وەدەستهێنانی بژێوی کار بکات. تا ساڵی ١٨٧٠ چواردە رۆمانی نووسی و بە شێوازە تەنزئامێزەکەی خۆی بەوپەڕی توانایەوە ژیانی چینەکانی خوارەوەی وڵاتی خۆی گرتووە. هیچ نووسەرێك نەیتوانیوە وەکو ئەو ئەو سیما کاریگەر و زندووانە وێنە بگرێ. ریالیزمی دیکنز لەسەر بناغەی مرۆڤایەتی و بەشەردۆستی رۆنراوە. دیکنز بێ نەواو دڵسافان و مناڵانی خۆش دەویست. بەر لەو هیچ نووسەرێکی دیکە نەیتوانی بوو بەو توانا و بەهرەیەوە مناڵانی بچووك بنێتە ناو بەرهەمی خۆیەوەو نەمری پێ ببەخشێت. کەسێك کە رۆمانەکانی دیکنز بخوێنێتەوە لە لاپەڕەیەکدا پڕ بە دڵ پێدەکەنێ و لە لاپەڕەیەکی دی دا بەکوڵ دەگری یان بەڕادەیەك هەڵدەچێ کە لەرزی لێدێ. بەرهەمەکانی دیکنز بەتایبەت لە ئەڵمانیادا زۆر بە گەرمی پێشوازی کران و نووسەرانی گەورەی ئەو وڵاتە کەوتنە ژێر کاریگەرییانەوە. ریالیزمی ئاوێتە بە رەشبینی، لە رێگەی ئەدەبیاتی فەرەنسییەوە لە ئاخر و ئۆخری قەڕن دا لەم وڵاتە پەیدا بوو. هەندێ بەرهەم لە ئینگلستاندا بڵاو بووەوە کە بێ پەرواتر بوو و جۆرە کاردانەوەیەکی سەبارەت بە داب و نەریتە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتی ڤیکتۆریا تێدا بەدی دەکرا. یەکێك لە نووسەرانی ئەم قۆناغە (جسینگ ١٨٥٧-١٩٠٣)بوو کە بە درێژایی تەمەنی خۆی هەر هەژار و داماو بووە. راستە

ئەم نووسەرە لاسایی دیکنزی دەکردەوە بەڵام بەرهەمەکانی لە بەرهەمەکانی دیکنز رەشبینانەتر بوو. هەروەها (هنری جیمز١٨٤٣–١٩١٦) یەکێکی تر بوو لەو نووسەرانە، هەرچەندە ئەمریکایی بوو بەڵام لە ئینگلستان دەژیا. بەرهەمەکانی (فلوبیر و تورگینیف)ی دەخوێندەوەو هەوڵی دەدا ئەوان بکات بەسەر مەشقی خۆی. لە رۆمانە زۆرەکانی خۆیدا لە هەوەڵەوە ماوەیەك کەوتە شەرحی جیاوازییەکانی نێوان ئینگلیزەکان و ئەمریکاییەکان. پاشان تا ڕادەیەك بایدایەوە سەر وێنەگرتن و شیکردنەوەی کۆمەڵگەی ئینگلیزی. (جیمز) تەماشاڤانێکی بێ هەستە، ئاسۆی بینینی سنووردار و تەنگە، بەڵام رۆمانەکانی لەباری رێکخستنی بابەت و شێوازی نووسینەوە بایەخی خۆیان هەس.

لە ساڵی ١٨٧٥ بەدواوە لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا کۆمەڵێك رێچکە و رێبازی تازە هاتە ئاراوە. مەردیت بە دەرونزانی روحانی، ساموئیل بوتلەر بەیاخی بوون لە میکانیزم، چیستەرتۆن بە باوەڕی بتەوی ئاینییەوە، روبرت لویس ستیڤنسن بە سەرەڕۆیی و هەڵاتن بۆ وڵاتانی دیکە نوێنەر و رابەری ئەو رێچکە و رێبازە جۆراوجۆرانە بوون.

## لە ئەڵمانیادا

ئەدەبیاتی ئەڵمان پاش مەرگی گۆتە و دوای ئەوەی لە لوتکەی شکۆفایی و گەشەی رۆمانتیزمەوە هاتە خوارێ بۆ ماوەیەك وا دەهاتە بەرچاو کە هەموو گوڕوتینێکی خۆی لەدەست دابێ. هیچ بەرهەمێکی بەرجەستە نەهاتە ئاراوە، بەتایبەتی کە ریالیزم وەکو قوتابخانەیەکی سەربەخۆ سەری هەڵنەدا. بەپێچەوانەی نووسەرانی ریالیستی فەرەنسییەوە کە بە هەرا و هەنگامەیەکی زۆرەوە هاتبوونە مەیدان و دژایەتی رۆمانتیزمیان دەکرد، نووسەرانی ئەڵمان بەتایبەتی ئەوانەی کە نەفەسێکی ریالیستیان تێدا بوو، هەوڵیان دەدا کە لایەنە رۆمانتیکییەکان و تەنانەت کلاسیکییەکانیش لە بەرهەمی خۆیاندا بپارێزن. جا بۆیە بەرهەمێن وەکو (ئیمینزە)ی (تیودور شتورم ١٨١٧–١٨٨٨) کە لەم قۆناغەدا هاتۆتە ئاراوە، زیاتر شەقڵ و مۆرکی رۆمانتیکی پێوەیە و هەر ئەمەش جۆرە تایبەتمەندییەکی سەیری پێ بەخشیوە.

(گوتفرید کیلەر ١٨١٠–١٨٩٠) کە خەڵکی زوریخ بوو، هەرچەندە لە شاکاری (هنری کەسك)دا دژی رەشبینی رۆمانتیك دەوەستێ و باسی زەرورەتی گونجان لەگەڵ ژیاندا دەکات، بەڵام رۆمانتیزم یەکێکە لە سەرچاوەکانی بەرهەمەکانی. رۆمانە گوندییەکانی (کیلەر) شەقڵی سویسرای پێوەیە. بەتایبەتی تراژیدیایەکی ریالیستی هەیە بەناوی (رومیو جولیت لە گوندی)دا کە بە یەکێك لە شاکارەکانی رۆمانی گوندی دەژمێردرێ.

لە بورای شیعری ئەڵمانیش دا، لە ماوەی نێوان هنریش هاینە و ستیڤان گیورگی دا هیچ بەرهەمێکی شیعری مەزن بەرچاو ناکەوێ. دەتوانرێ دهمیل بە شیعرە میللییەکانی و هۆڵتز بە شیعرە مۆدێرنزمیەکانییەوە بە شاعیرانی ریالیست بژمێردرێن. بەڵام ئەمانە شاعیری گەورە نین. شانۆی ئەڵمان پاش قۆناغێکی دوور و درێژ و بێ بەرهەمی (نیورۆمانتیزم) لە سایەی سترینبرگ

و ئیبسن و شانۆی ئازادی ئانتوان دا، زنجیره بەرهەمێکی گرینگی ناتورالیستی هێنایه ئاراوه که دیارترین نموونەیان بەرهەمەکانی (هاویتمان)ە (وەکو شانۆنامەی "جۆلایان").

## له ئەمریکادا

رۆمانتیزمی ئەمریکاش وەکو رۆمانتیزمی ئینگلیز پڕه له رەگەزێن ریالیستی. و ریالیزمی ئەمریکایی له راستیدا به درێژەی ئاسایی رۆمانتیزم دەژمێردرێ و هیچ جۆره دابڕانێکیان له نێواندا نییه. رێبازی بینین و تەنزی واشینگتون ئیرونیگ، بنجڕی سەختگیرانەی ئەمرسۆن، وردی شیتەڵکاری کوپەر، زەبت و رەبتی دەربڕینی ئیدگار پۆ، و دروستی بەرجەستەکاری ناتانیل هوترون، و تورو، رەنگ و سیمایەکی تایبەتی به رۆمانتیزمی ئەمریکایی دەدات. کەچی (والت ویتمن)ی شاعیری رۆمانتیزم بەزەبری فەساحەت و زمان پاراوی و جۆش و خرۆشی خۆی له راستیدا رۆمانتیك ترین شاعیری ئەدەبیاتی ئەمریکایه.

بەڵام ئەوەی دەبێ له موتالا و خوێندنەوەو شیکردنەوەی ئەدەبیاتی ئەمریکادا لەبەرچاو بگیرێ ئەمەیه که ئەدەبیاتی ئەمریکا پەیوەندییەکی نزیکی به ژیانی کۆمەڵگەی ئەمریکاییەوه هەیه. هەندێ کەس گوتویانه که رۆمانتیزم له ئەمریکادا له قۆناغی خۆشگوزەرانیدا گەشه دەکات و ریالیزم له قۆناغێن قەیران و ئاستەنگاندا سەر هەڵدەدا. بۆ نموونه لوتکه و هەرەتی رۆمانی ریالیستی ئەمریکا له نێوان سالانی ١٨٨٠-١٩١٠ دابووه، هەروەها مێژووی پەیدا بوون و سەرهەڵدانی نیو ریالیزم له ئەدەبیاتی ئەمریکادا دەگەڕێتەوه بۆ ساڵی ١٩٢٩، واته بۆ پاش قەیرانی ئابوری و تێشکانی (ڤاڵ ستریت).

له ساڵی ١٨٧٧دا له کاتێکا مانگرتنه توند و تیژەکان شارانی (پیتسبورگ) و (شیکاگۆ)یان غەرقی خوێن و ئاگر کردبوو، مەزراداران بەهۆی سفتەبازی خودان بانکەکانەوه له قوڕی رەش نیشتبوون. کۆچبەران له خەمی کار پەیدا کردندا بوون، ناڕەزایی له گەندەڵی سیاسەتوانان گەیی بووه لوتکه. له ساڵی ١٨٩١دا ئەنارشیتان بێ ئەوەی تاوانیان له هەراکەی (های مارك)دا ساغ بکرێتەوه له قەناره دران. ئەم هەرایه له نکاودا پیاوێکی وەئاگا هێنایەوه، ئەم پیاوه بابایەکی پوستونی ئایدیالیست بوو، و ژیانێکی رەبەنانەی بەسەر دەبرد، کۆمەڵێك شیعر و رۆمانی به شێوازی باوی دەورانی ڤیکتۆریا نووسیبوو، گۆڤاری زۆر موحافەزەکاری (ئەتلەنتیك مونسلی) بەڕێوه دەبرد. ئەم نووسەره که (ولیام دین هوفلز)ی ناو بوو، له کاتێکا تەمەنی له پەنجا ساڵی تێپەڕی بوو، له ئەنجامی هەرای ناوبراودا وەئاگا هاتەوەو هەڵوێستی خۆی گۆڕی، کورسی مامۆستایەتی زانکۆی هارڤۆردی رەت کردەوه، بۆستونی بەجێ هێشت و چوو بۆ نیویورك و خووی دایه رادیکالیزم. ئەمه له باری ئەدەبییەوه بەمانای قەبوڵکردنی ریالیزم بوو. (هوفلز) ئیدی له رۆمانێکی دا خۆیدا کەوته وێنەگرتنی سیمای ئەمریکای تازەی سەرمایەداری و پیشەسازی. له رۆمانتیکیدا کەشیشێك دەبینین که دەست به پایەی کەشیشی خۆی هەڵدەگرێ و دەچێته ریزی کرێکارانی چنینەوه. (هوفلز) هەرزوو لەگەڵ ئەو گروپه لاوه رادیکالیستانه کەوت که ئەدەبیاتی ئەمریکایان بەرەو ناتورالیزم برد.

هەڵبەتە ئەم ناتورالیزمە وەکو ناتورالیزمی فەرەنسا قوتابخانەیەکی ئەدەبی نەبوو، بەڵکو تەڤگەرێکی هەمەلایەنە بوو کە لە تورەیی و ناڕەزایی جووتیاران و کەرب و کینەی خەڵکی شارستانی دەستبەتاڵ و بێ کارەوە. دژ بە دەوڵەمەندانی تازە پێگەیشتوو، هەڵقولابوو. ئەم نووسەرانە لە بەرهەمەکانی خۆیاندا لاسایی رۆماننووسانی فەرەنسایی وەکو (فلوبیر و موپاسان، برایانی کنگور و ئەمیل زولا)یان دەکردەوە. نووسەری ریالیست و ناتورالیست لە ئەدەبیاتی ئەمریکادا سیماو کەسایەتی تایبەتی خۆی هەس: بەزۆری بابایەکی هەژاری سەر بە کەمینەیەکی میللی یان نەژادییە و کارو پیشەی زۆری جەربانددووە و سەرەنجام لە رێگەی رۆژنامەگەرییەوە هاتۆتە ناو جیهانی ئەدەبەوە. کە دەبینی تورە و نائومێدە لەبەر ئەوەیە کە نوێنەری یاخی گەری و بەدبەختیە. ئەو چوار پێنج نووسەرە گەورەیەی کە بە نوێنەری بەرجەستەی ئەدەبیاتی ئەمریکای ئەم قۆناغ و سەردەمە دەژمێردرێن، هەموویان ژیانیان دژوار و ناخۆش بووە. ستیڤن کرین لە ٢٩ساڵیدا مرد، فرانك نوریس لە ٣٢ساڵی و جاك لوندون لە چل ساڵیدا خۆی کوشت. هیچ یەکێك لەوانە دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەرەخسا کە بگەنە لوتکەی هونەری خۆیان. لە بەرهەمەکانی (ستیڤن کرین) جگە لە (نیشانەی سوری دلێری) کە بە شاکاری ئەو دەژمێردرێ و بۆ نووسینی ئیلهامی لە جەنگە نێوخۆییەکانەوە وەرگرتووە، دەبێ ئاماژە بۆ کارێکی دیکەی ستیڤن بەنێوی (ماگی، کیژە بەرەڵلاکەی نێو شەقامان)ش بکرێ. ئەم کتێبە بریتییە لە بەسەرهاتی کیژێکی بەرەڵلای ئیرلەندی کە لە ئەنجامدا خۆی دەکوژێت.

(فرانگ نوریس)، لە هەوەڵێن بەرهەمەکانیدا، ناتورالیزمی خۆی ئاوێتەی جۆرە ماکێکی رۆمانتیکی کردووە. و زیاتر کاریگەری ستیڤن-ی پێوە دیارە. کارە هەرە گرینگەکەی ئەو لە بواری ناتورالیستیدا رۆمانێکە بەنێوی MC Teague) ئەمە بەسەرهات و ماجەرای کرێکارێکی کانە لە سان فرانسیسکو کە زیاتر بەرهەمە بەنێوبانگەکەی زۆلا (Assommoir) وەبیر دێنێتەوە. (نوریس) لە بەرهەمی (Octopus)دا کە تەواوی نەکردووە، بەتەواوەتی لەژێر کاریگەری زۆلادایە.

لە نێو ئەم سێ نووسەردا (جاك لوندون) لە هەموان زیاتر لە ئەوروپا و (لە ولاتی ئێمەش)دا ناسراوە، و بەرهەمە زۆر و هەمەجۆرەکانی، وەکو: (مارتین ئەدن، دەنگی هۆڤی، کەڵبە چەرموو...) بە بەردەوامی لە ئەوروپا و بەزمانانی جیاواز چاپ دەکرێنەوە. جاك لوندون لاوێتی پڕ لە سەرکێشی خۆی لە باکووری بەفرپۆش و لە (کلوندایك) و لە بەندەرەکانی سان فرانسیسکو دا بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٨٩٤دا لەگەڵ (سوپای بێکاران)دا بەرەو واشنگتون رێپەیماییان کرد و پۆلیس پاش ئەوەی رێی پێ گرتن و بلاوەی پێ کردن، ژمارەیەکی بە بیانووی پایەماڵکردنی چیمەنەکانی سەنا، لێگرتن. هەموو ئەم بەسەرهات و رووداوانە لە بەرهەمە جۆراوجۆرە یاخی ئامێزەکانی ئەودا بەرجەستە کراون.

بەلام تاکە نووسەرێك کە شێوەو فۆرمی بنجبڕی بە ریالیزمی ئەمریکایی دا (تیودور درایزەر ١٨٧١-١٩٤٥) بوو. ئەم نووسەرە لە بەرهەمەکانی خۆیدا، کە بەناوبانگترینیان بریتییە لە:

(سیستەر كزی) و (كارەساتی ئەمریكایی)، كارەسات و بەڵاكانی ژێرەوەی كۆمەڵگەی ئەمریكای پێشكەوتووی پیشەسازی دەردێنێ و دەیخاتە بەرچاوی جەماوەری خەڵكی.
هەرچەندە كە درایزەر پیاوێكی ئەوەندە خوێنەوار نەبوو و شێوازێكی پوختەی نەبوو، بە گوتەی یەكێك لە توێژەرانی بەرهەمەكانی ئەوەی دەنووسی كە پێویست بوو بینووسێت و نەیدەتوانی نەنووسێت. لە بەرهەمەكانی درایزەر و هەروەها لە بەرهەمە ریالیستییەكانی نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەمی ئەمریكادا شتێك هەس كە هەمیشە بەردەوامە و یەكێك لە تایبەتمەندی و هەڵاوێردەكانی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئەمریكا: (تیودور روزفیلت) سەركۆماری ئەمریكا گوتبووی كە: "هەرگیز وەچە نووسەرێك ئەم هەموو جنێوەی بە وڵاتی خۆی نەداوە."
روزفیلت، ئەو نووسەرانەی ناونابوو (حەیابەران). بەڵام واقیع لە سەرووی ئەو قسانەوە بوو. چونكە هەر لە زەمانی سەرهەڵدانی نەسل و نەوەی حەیابەرانەوە جۆرە ئەدەبیاتێكی ئیعترازی و بەدگۆیی سەبارەت بە لاف و گەزافی میللی و (رەوشی ژیانی ئەمریكایی) لە ئەدەبیاتی ئەمریكادا گەشەی كردووەو بە ئارامی بەردەوام بووەو لە ئەنجامدا شەپۆلی جیهانگیری (هیپی) لێكەوتووەتەوە كە ژمارەیەكی زۆری هەرزەكارانی بەلای خۆدا راكێشاوە. بەردەوامبوونی ئەم هەرا و ئاژاوەگەرییە تا رادەیەكی زۆر دەنگدانەوە و رەنگدانەوە و دەربڕی پرەنسیپی رەخنەئامێزی ئەدەبیاتی ئەمریكایە و ئەوە نیشاندەدات كە ئازادی دەربڕین لە وڵاتە یەكگرتووەكاندا هەمیشە زەمینە بۆ تاك فەراهەم دەكات كە لە بەرانبەر پایەخوازی میللی و رەوتی باوی ژیانی كۆمەڵگەی ئەمریكایی دا بەرەڤانی لەخۆی بكات.
ئەم رەخنە گرتنە لە دیاردەكانی كۆمەڵگەی ئەمریكایی لە بەرهەمەكانی (شیروود ئاندرسون ١٨٧٦-١٩٤١) و (سینكلر لویس ١٨٨٥-١٩٥١)شدا هەر بەردەوام بووە.
بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە سیما تازەكانی ریالیزمی ئەمریكا ئاشنا ببین ئەوا دەبێ لە بەرهەمی نووسەرانی پاش ساڵی ١٩٣٠دا بۆی بگەڕێین، واتە لای جون شتاینبك، هەمینگوای، ویلیام فۆكنەر، ئارسكین كالدویل و جان دۆس و... بۆی بگەڕێین كە ئەمە بۆ خۆی باسێكی سەربەخۆ هەڵدەگرێ و ئەم وتارە كورتە لە عۆیەی نایەت.

## لە روسیادا

لە ساڵی ١٨٥٢ لە روسیادا (بەسەرهاتەكانی راوچییەك)ی توركینیف و (منداڵ)ی لیۆن تۆڵستۆی بڵاو بوونەوە. رۆمان جێگەی شیعری گرتەوە، واتە ئەو هونەرەی لە خزمەتی جەماوەری خەڵكدا بوو، جێگەی هونەری خالیسەی پوشكینی گرتەوە. بەڵام وێڕای ئەمەش دەبێ ئەوە بگوترێ كە رۆمانتیزمی روسی لە جۆرە ریالیزمێك بەدەر نەبوو، واتە ماكێكی ریالیزمی تێدا بوو. شیعری پوشكین جۆرە ریالیزمێكی لیریكی بوو و ئەو بەخۆی دەیگوت: "شیعر تا بەرەو ئاڵمان بچێتە سەرێ ساردتر دەبێ." و بەرەڤانی لە هەندێ بەهایان دەكرد كە تەواو لە رۆمانتیكەوە دوور بوو. وەكو: بایەخدانی تەواو بە فۆرم و ناوەڕۆك و هاتنە دەرەوە لە دەروونی خۆت. كاتێ دۆستوفسكی دەڵێت (هەموومان لە پاڵتۆكەی گوگوڵەوە هاتووینەتە دەرێ) و پوشكین بە گوگوڵ

دەڵێت کە بلیمەتی ئەو لەوەدایە (بیهودەیی ژیان دەگۆڕێ بۆ هەست...و بێ مانایی و سواوی ژیانی مرۆڤی ئاسایی و هەموو ئەو وردە شتانەی کە ئێمە نایانبینین بەرجەستە دەکات...) لە راستیدا رێنوێنیمان دەکەن کە هەموو ئەدەبیاتی روس بە دیدی ریالستی بخوێنینەوە. لێ ریالیزمی روسی تەواو جیاوازە لە ریالیزمی فەرەنسی. ریالیزمی روسی پیسترین لایەنێن ژیان دەخاتە بەر وردەبینی شیکردنەوە و تۆژینەوە و چیخۆف وتەنی بابەتی ریالیزمی روسی خەڵکانێکە کە جگە لە "خواردن، خواردنەوە، خەوتن و مردن" چ کارێکی دی ناکەن. بەڵام ریالیزمی فەرەنسی بریتییە لە ویستنی هوشیارانەی رۆشنبینی و هوشیاریی بابەتی یان روو بەروو بوونەوەی قەراردادەکان لە واری ئەخلاق و هونەردا. چیخۆف هاواری باوەڕی لەدەست چوو دەکات و ماکسیم گۆرکی هاواری شۆڕش دەکات. ریالیزمی رووسی لە دوو خەسڵەتی سەرەکی و بنەڕەتی ریالیزمی فەرەنسی غافڵە: یەکەم رۆشنبینی کە شەقڵی وەسیلەی هوشیاری بە هەر شتێك دەدات، دووەم هونەر، کە چەمکی شتێکی هونەری بە هەر واقیع و رووداوێك دەدات. ریالیزمی هونەری لە جیاتی ئەوە یا دەربەندی تەواوەتی داب و نەریتە یان دەربەندی پرسیاری روحانی و مەعنەوییە. هەڵبەتە گومان لەمەدا نییە کە رۆماننووسانی گەورەی کۆتایی سەدەی نۆزدەم گرنگترین خەسڵەتێن ریالیزمیان لە سەرانسەری جیهاندا چەسپاند و بوون بە خەسڵەتی جیهانی رۆمان، دۆستۆفسکی و چیخۆف توانایەکی یەجگار گەورەیان لە نیشاندانی جوزئیاتدا هەیە و تۆلستۆی جۆش و خرۆش و هەڵچوونی دەرونی لە رێگەی شیکردنەوەی رەفتارانەوە بەرجەستە دەکات و توانا و بەهرەی بەرجەستە کردنی حسی ئەو بێ نەزیرە. بەڵام رۆمانی روسی، لە هەموو ئەمانە زیاتر (پرسیارە لە خوا). دۆستوفسکی کە باسی (جن زەدە)کانی خۆی دەکات، دەڵێت: "من ویستم پرسیارێك بکەم و ئەوسا بە شێوەیەکی تا بکرێ روون و رەوان لە قاڵبی رۆماندا وەڵامی بدەمەوە: چۆن دەشێت لە کۆمەڵگەی سەیر و سەمەرەی سەردەمی ئێمەدا نەك هەر یەك نیچایف، بەڵکو نیچایفان پەیدا بن؟ (نیچایف شۆڕشگێڕێکی نەهلیستی روس بوو (١٨٤٧-١٨٨٢) کە ژیانی ئەو هەوێن و سەرچاوەی دۆستۆفسکی بووە لە نووسینی جن زەدەکان دا.)

و کاتێ تۆڵستۆی ئەوە رادەگەیەنێ کە )عەسری رۆمان بەسەر چووە) لەبەر ئەوەیە کە گومانی لەوەیە رۆمان وەکو قاڵبێك بۆ ئەو پرسیارە ئەخلاقییە بشێت یان دەرەقەتی بێت..

پێویستە ریالیزمی رووسی بەسەر سێ قۆناغدا دابەش بکرێ:

١- ریالیزمی سەرەتا

٢- ریالیزمی رەخنەیی

٣- ریالیزمی سوسیالیستی.

## ریالیزمی سەرەتا:

ئەم قۆناغە دەبێ بە قۆناغی شکۆی ئەدەبیاتی روسیا بژمێردرێ. ئەدەبیاتی رووسیا لە هیچ قۆناغێکدا وەکو ئەم قۆناغە خاوەنی کەڵەنووسەران و شاکارێن گرانبەها نەبووە.لە ساڵی ١٨٤٠وە تا ساڵی ١٨٨٠ شاکارێن ئەدەبی ئەوتۆ لە ئەدەبیاتی روسیادا هاتە ئاراوە کە وڵاتی روسیای گەیاندە لوتکەی شۆرەت و ناوبانگ. وەکو پێشتر ئاماژە کرا ریالیزمی روسی هەوەڵجار بە کورتە چیرۆکی (پاڵتۆ)ی (گوگول ١٨٠٩-١٩٥٢) دەستی پێکرد. ئەم نووسەرە شێوازێکی تەوسئامێزی هەبوو لە جیاتی وێنەی قارەمانانی واقیعی، وێنەیەکی پێکەنیناوییانی دەگرت. بەرهەمەکانی گۆگۆڵ هەجونامەیەکە دژی رەوش و بارودۆخی کۆمەڵایەتی روسیای تزاری . گەورەترین بەرهەمی گۆگۆڵ "روحە مردووەکان"ە کە تەواو نەکراوە. پاش گۆگۆڵ، (گونچاروف ١٨٢٣-١٨٩١) رۆمانی (ئەبلۆموف)ی نووسی و توانی بۆ یەکەمجار بە شێوازی بالزاك، باشترین نموونەی روس بئافەرێنێ.

نووسەرێکی دیکەی گەورەی ئەم قۆناغە (تورگینیف ١٨١٨-١٨٨٣)بوو کە ماوەیەکی زۆری لە پاریس دا گوزەراند و دۆستایەتی نزیکی لەگەڵ (فلوبیر، ئالفونس دودە، زولا)دا هەبوو. لە سەرەتاوە بە چەند کۆمیدیایەکی بچووکی رۆمانتیکی لەسەر شێوازی ئالفرد موسیە دەستی پێکرد. پاشان (بەسەرهاتەکانی راوچی)ی نووسی و دواتر بە رۆمانێن گەورەی (رودین) و (باوکان و فەزرەندان) و بەرهەمەکانی تری خۆی شیکردنەوەیەکی هونەریانەی توێژ و چینە جیاوازەکانی گەلانی روسیای ئەنجامدا. بەرهەمەکانی جوان و ئاهەنگدار و ریتمدارن و رەشبینییەکی قووڵیان پێوە دیارە. نووسەرانێکی زۆری ئینگلیزی و دانیمارکی و نەرویجی تا ماوەیەکی باش کەوتنە ژێر کاریگەری تورگینیف و لاسایی ئەویان دەکردەوە.

پێویستە (لیون تۆڵستۆی ١٨٢٨-١٩١٠) بە گەورەترین نوێنەری ریالیزمی سەرەتای روسیا بژمێردرێ. تۆڵستۆی نووسەری گوندییانی روسییە. تەنانەت لە ساڵی ١٨٧٩دا تۆڵستۆی بەخۆی لێبرا کە ژیانی گوندیاتی هەڵبژێرێ و بە رەنجی شانی خۆی بژی. تۆڵستۆی توانی لە رێگەی داهێنانی کۆمەڵێك نموونەی واقیعی لە خەڵکی وڵاتێکدا کە تەمەنێکی زۆری تیا بەسەر برد، و لە رێگەی دۆزینەوەو شیکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی ژیان و ئازارێن کۆمەڵایەتی ئەو خەڵکەوە ببێ بە نووسەرێکی ریالیستی. بەڵام ریالیزمی ئەو سادە و روون و بەرنامەدار نییە. تۆلستۆی لە سەرانسەری ژیانی دا هەر لە ژێر کاریگەری جان جاك روسودا بووە و لە بندێری شیرەت و ئامۆژگاریانی ئەخلاقی و لە دوو تویێی ئینجیل دا بۆ چارەسەری گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان گەڕاوە. بەڵام ئەم شتانە ناتوانن لە بەهای ریالیزمی تۆلستۆی کەم بکەنەوەو رۆمانی (جەنگ و ئاشتی) کە پڕە لە نموونەێن بەرجەستەی چینە جیاوازەکانی خەڵکی روسیە و تەژی شیکردنەوەو راڤەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی ئەو خەڵکەیە بە شاکاری بەرهەمێن ریالیستی روسیا دەژمێردرێ.

تۆلستۆی نووسەرێکی یەجگار چالاك و بەتوانایە و ژینگەی پڕ لە سەرکوتکاری سەردەمی تزاری نەیتوانیوە چۆکی پێ دابدات. بەڵام دەبێ هاوزەمان لەگەڵ ئەودا ناوی (دۆستۆفسکی ١٨٢١-

١٨٨١)ش ببرێ کە بەهرە و توانایەکی یەجگار گەورەی لە بواری شیکردنەوەی دەروونیدا هەبوو، بە نوێنەری رەشبینی و نائومێدی ئەم قۆناغە دەژمێردرێ و لایەنە نەخۆشین و سازگارەکانی دەروونی ئادەمیزادی شرۆڤە و وەسف کردووە. قارەمانەکانی هەم جەلادن و هەم قوربانی بەزۆری لە بەردەم خەڵکانی دیدا دان بە رابوردووی خۆیاندا دەنەن. و بەخۆیشی نووسەرێکە کە بەردەوام لە هەڵچوون و داچوون و ژان و ئازاردا ژیاوە.

نووسەرانێك لە پاش دۆستوفسکییەوە هاتن کە رەوشی ژینگە و ئەو گوشارە روحییەی لە سەریان بوو وای لێکردن پەیڕەوی دۆستوفسکی بکەن. جا ئەم ئەدەبیاتە بە ژان و ژار و پڕ لە رەشبینییە بەردەوام بوو تا (ماکسیم گورگی ١٨٦٨–١٩٣٦) بە نەفەسێکی تازەترەوە پەیدا بوو و (ریالیزمی رەخنەیی) دامەزراند.

## ریالیزمی رەخنەیی

گۆرگی کە تەمەنی هەرزەکاری بە سەرگەردانی و وێڵی و رۆژە رەشی بردبووە سەر، لە سەرەتادا شێوازێکی تایبەت بەخۆی نەبوو، و بە هەندێ نووسینی کورتی رۆمانتیك ئامێزەوە هاتە ناو جیهانی ئەدەبەوە. بەڵام هەستی مرۆڤپەروەری و ژیاندۆستی ئەو لەگەڵ بیروبۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانیدا یەکیان گرت و گیانێکی تازەی بە بەرهەمەکانی بەخشی کە لە ژیانی خۆی و هاوسنفەکانی خۆیەوە هەڵی هێنجابوون. گۆرگی زۆر دڵی بە ئاینده خۆش بوو، باوەڕی تەواوی بە هێز و نێروی مەردوم هەبوو، ئەمەش کردییە کارێك کە ریالیزمی گورگی بە شێوەیەکی تازە بێتە مەیدان و بکەوێتە خزمەتی مەبەست و ئارمانجە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوەوە. بەمجۆرە گورگی بە نووسینی ژمارەیەکی زۆری چیرۆکان کە زیاتر لە ژیانی خۆیەوە هەڵیدەهێنجان، و هەروەها لە رێگەی رۆمانێن گەورەی وەکو (فاماگاردیف) و (دایك) بناغەی قۆناغێکی ریالیزمی دامەزراند کە پێی دەگوترێ (ریالیزمی رەخنەیی).

لەم قۆناغەدا قارەمانانی نووسەر لە ژینگەی خۆیان لە پێشترن و لە پێناوی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی باشتردا دەخەبتن یانی ئەم قارەمانانە لە وەزع و حاڵی باو رازی نین و کار بۆ گۆڕینی دەکەن. قۆناغی نووسەرایەتی گۆرگی سالانێك بەر لە شۆڕش دەستی پێ کرد و نزیکەی بیست ساڵ دوای شۆڕش بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەمەشدا ئەدەبیاتی قۆناغی دواتر، واتە (ریالیزمی کۆمەڵایەتی)ش لە سەر دەستی گۆرگی داڕێژرا.

## ریالیزمی سۆسیالیستی

لە ساڵی ١٩٢١وە زۆربەی هەرەزۆری ئەدەبیاتی سۆڤیەتی لە بازنەی شەرح و شرۆڤەی سەربوری شۆڕش و خەباتی خەڵکیدا دەسوڕایەوە. ئەم بەرهەمانە شێوازێکی تایبەتییان نەبوو، بە شێوەیەکی گشتی زادەی سۆز و گوداز بوون و بە جۆرێکی شپرزە دەنووسران. لە ساڵی ١٩٢٤وە (ریالیزمی کۆمەڵایەتی) بە شێوەیەکی تازە دەستی پێکرد و نووسەران پەیان بە گرنگی (کار)

لەناو کۆمەڵگەی خۆیاندا بردوو ئیدی ئەو ڕێگەیەیان گرتە بەر کە لە بەردەمیاندا بوو. لەم ساڵەدا (گلادکوف ١٨٨٣-) ڕۆمانێکی بەناوی (چیمەنتۆ)بڵاو کردەوەو شورەتێکی زۆری پەیدا کرد. ئەم بەرهەمە زۆر دیمەنی جوانی ژیانی پیشەسازی پاش ساڵی ١٩٢٧ی گرتبووە خۆ. هەڵبەتە دەبێ ئەوە بگوترێ کە ئەم نووسەرە تا ڕادەیەك قەرزارباری گۆرگی بوو. لە ساڵی ١٩٣٠دا (پیلنیاك ١٨٩٤-) بەرهەمێکی بەناوی (ڤۆلگا دەڕژێتە دەریای خەزەر)ەوە بڵاو کردەوە کە باشترین ڕۆمان بوو دەربارەی (بەرنامەی پێنج ساڵە). هەروەها لە هەمان ساڵدا بوو کە (دنی ئارام)ی شاکاری شولوخۆف بڵاو بووەوە. ئیدی لەو زەمانەوە نووسەرانی دیکەش هەوڵ دەدەن کە بە بەرهەمەکانی خۆیان ئەم قۆناغە تازەیەی ریالیزم دەوڵەمەند بکەن. ئیلیا ئەهرنبورگ چەند ساڵێك لەمەوبەر لە نامیلکەیەکی خۆیدا دەربارەی (کاری نووسەر) دەڵێت: "بابەتی کار، بابەتێکی گەلەك گرنگە. ئەمە جگە لەوەی کە بابەتێکی نوێیە: لە کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، وەکو جۆرە نەگبەتی و بەدبەختییەك تەمەشای کار دەکەن و هزرڤانان پێ لە سنوری ئومێدی کەم کردنەوەی سەعاتانی کار هێوەترنانەن. لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ستایشتی کار دەکەن و وەکو ڕەگەزێکی داهێنان سەیری دەکەن. ناکرێ تەسەوری ئەوە بکرێ ڕۆمانێك دەربارەی ژیانی ئێمە بێ و قارەمانەکانی هیچ کارێك نەکەن یان کار وەکو شتێکی بێ کەڵکی بوونیان تەماشا بکەن."

(ئەریك هارتلی) بەمجۆرە پێناسەی (ریالیزمی سۆسیالیستی) کردووە: " ریالیزمی سۆسیالیستی لەسەر ئەو پرەنسیپە ڕۆنراوە کە کار توانایەکی داهێنەرانەی هەیە و هونەر نیشاندان و ڕەنگدانەوەی ئەو ڕەگەزەی (داهێنان) کارە. ئەم دووانە بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندی و بەرژەوەندییە گرینگە کۆمەڵایەتییەکان عەکس دەکەنەوەو لە هەمان کاتدا کاری تێ دەکەن.

## لە وڵاتانی دیکەدا

ئەدەبیاتی ریالیستی زۆر لەگەڵ روح و تەبیعەتی ئیتالیاییدا نەدەگونجا، بۆیە ئەدەبیاتی ئیتالیا لەم قۆناغەدا بایەخێکی ئەوتۆی پەیدا نەکرد و ئەو چەند نووسەرە گەورەیەش کە لەو وڵاتەدا بوون، بەرهەمەکانیان پتر لایەنی میللیان لەخۆ گرتبوو. ریالیزم دواتر لەو وڵاتەدا لە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی فەرەنسادا پەیدا بوو، بەڵام سەرڤە سەرڤە و زوو گوزەر بوو. ئەدەبیاتی ئەسپانیاش یەجگار پابەندی ڕۆمانتیزم بوو و خۆی لە ڕۆمانتیزمدا دەبینییەوە، بۆیە تا ماوەیەکی زۆر دەستبەرداری ڕۆمانتیزم نەبوو. لە ئاخروئۆخری سەدەدا چەند نووسەرێك کەوتنە کەڵکەڵەی لاسایی کردنەوەی (بالزاك) و (دیکنز) و هەندێ کاریان بەرهەم هێنا. یەکێك لەوانە (پیرز گالدوس ١٨٤٥-١٩١٠)بوو کە لە ڕۆمانەکانیدا ژیانی خەڵکی مەدریدی وێنە گرتووە. زۆربەی بەرهەمەکانی کە بۆ سەلماندنی ئایدولوجیا و تیورییەك تەرخان دەکران، لە باری سایکولوژییەوە نادروست بوون. ئەدەبیاتی پرتوغال، لە ساڵی ١٨٦٠وە تا ١٨٧٠ کەوتە ژێر کاریگەری ریالیزمەوە. بناغەرێژی ریالیزمی پرتوغال (ئیسادوکیروز١٨٤٥-١٩٠٠) بوو کە پەیڕەوی بالزاك و فلوبیری دەکرد. نووسەرێکی باڵادەست و ریالیستێکی بە تەنز و تەوس بوو.

دوای ئەو دەبێ ناوی (تەکسیر دوکیروز١٨٤٩-١٩١٩) ببرێ کە (کومیدی بورژاو) و (کومیدی وەرزێر)ی لە چەندین بەرگدا نووسیوە.
دەسەڵات و کاریگەری بالزاك و فلوبیر لە هیچ وڵاتێکا وەکو یوگسلافیا کاریگەر نەبووە. (ئیگناتوڤیچ ١٨٢٣-١٨٨٤) کە خەڵکی سربستانە لە رۆمانە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیدا تەواو لاسایی بالزاك-ی کردۆتەوە. و(ماتاڤللی ١٨٥٢-١٩٠٩) کە ئەویش سربستانی بوو یەجگار بەبەهرە و توانادار بوو لە شیکردنەوەی ریالیستیانەی داب و نەریت و ئەخلاقیاتی خەڵکی وڵاتەکەی خۆیدا. ریالیزمی پاك و پوختەی ئەو تازەیی و ناسکییەکی تایبەتی بە بەرهەمەکانی دەبەخشی. لە پۆڵاندەدا کە شۆڕشی ١٨٦٣ شکستی هێنا، خەڵکی پشتیان کردە رۆمانتیزم و روویان کردە ریالیزم و دەیانویست حەقیقەتی رووداوەکان وەکو خۆی بدینن و شی بکەنەوە. لە مەجەریستانیش دا هەمان ئارەزوو پاش ساڵی ١٨٤٨ و ١٨٧٤ پەیدا بوو.
هونەری شانۆ لەم قۆناغەدا، و لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپایی دا بایەخ و گرینگی خۆی هەیە. لە روسیادا (ئوستروٚفسکی ١٨١٤-١٨٨٧) کە دامەزرێنەری شانۆی ریالیستی روسیا بوو، پتر لە سی (٣٠) شانۆنامەی جیاوازی دەربارەی داب و نەریت و ئەخلاقیاتی خەڵکی بڵاو کردەوە کە زۆربەیان کۆمیدیایی بوون. ئەم شانۆنامانە تاکو زەمانی چیخۆف، لە برەودا بوون و لەسەر تەختەی شانۆکانی روسیادا نمایش دەکران. ستروفسکی لە شانۆنامەکانیدا، وەکو "گورگ و مەڕ" و (خۆمانە)و...هتد. بازرگانانی ئەو سەردەم و قۆناغەی بە پولپەرستی و چاوچنۆکی و رژدی و پاشکەوتووی خۆیانەوە نیشاندەدا. قارەمانانی شانۆنامەکانی ئەو دەستەمۆی خەیاڵ و خەیاڵپڵاوییەکانی نووسەرن و یان بەرەو کەماڵی چاکی یان کەماڵی خراپی ئاراستە کراون. شانۆی رۆمانی هەر لە سەرەتاو هەوەڵی نەش و نما و گەشەکردنی خۆیدا بوو بە خاوەنی نووسەرێکی گەورەی وەکو: (کاراجیال ١٨٥٢-١٩١٢) بە نەوایەکی تەوس ئامێز و گوزارشتێکی پڕ بەهرەوە دنیای کاسبکاران و بازرگانان و دەلالانی وێنە گرت. نووسینەکانی کاراجیال زۆر قوڵن و زۆر رستە و دەستەواژەی ناو بەرهەمەکانی کەوتوونەتە سەر زاری خەڵکی رۆمانی و وەکو پەند دەگوترێنەوە. لە وڵاتانی ئەسکەندیناوادا، بیروبۆچوون و روانگەی ریالستەکانی فەرەنسا بوو بە ئەوزارێك بەدەستی نووسەرانەوە بۆ هێرش کردنە سەر کڵێسا و باس کردن و شیکردنەوەی مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان و ئازادی ژنان. یەکەمین شانۆنامەی ریالیستی لە وڵاتانی ئەسکەندیناوا، شانۆنامەی (تێشکان ١٨٧٥) بوو ئەم بەرهەمە لە نووسینی (بیورنسن ١٨٣٢-١٩١٠)ی نەرویجی بوو کە زۆر رۆمان و نمایشنامەی هەیە و بە نووسەری پلە یەکی وڵاتەکەی خۆی دەژمێردرێ. بەر لەو (ئبسن ١٨٢٨-١٩٠٦) لە رێگەی شانۆنامە و چیرۆکەکانییەوە شۆرەتی جیهانی پەیدا کردبوو، بەڵام ریالیزمی زەق لە بەرهەمەکانیدا بەدی نەدەکرا. لە سوێدا (ستریندبیرگ ١٨٤٩-١٩١٢) وەکو رۆماننووس و شانۆنامەنووس و شاعیر بە گەورەترین نووسەری سوێد دەژمێردرێ و ریالیزم لە بەرهەمەکانی ئەودا روونتر و دیارترە تا لە بەرهەمێن ئەو دوو نووسەرە نەرویجییە کە لە سەرێ ڕا ناومان بردن. رۆمانێکی بەناوبانگی هەس بەنێوی

**(هۆدەی سوور) لەم رۆمانەدا کۆڕی بازرگانانی ستۆکهۆڵم-ی بە ئاوایەکی تەوس ئامێزی وەکو (دیکنز) نیشانداوە.**

# ناتوراليزم
# Naturalisme

"ناتوراليزم"، به چەمكی فەلسەفی بەو زنجیرە رێچكەو رەوشە فەلسەفییە دەگوترێ كە باوەڕی بە توانای رەهای تەبیعەت هەیەو هەرگیز سروشتو تەبیعەت بە ئالەتو ئەوزاری دەستی سیستەمێكی بالآتر نازانێ.

لە روانگەی ئەدەبییەوە -ئەگەر تایبەتمەندییەكانی ئەو قوتابخانە ئەدەبییەی كە بەم ناوەوە ناسراوەو ئێستا خەریكی باس كردنیین وەلاوە بنەین- ئەوا زیاتر بەلاسایی كردنەوەی وردی موو بە مووی تەبیعەت دەگوترێ. ئەم جۆرە ناتوراليزمە جۆرە ناتوراليزمێكی سەرەتایی و (كلاسیكە) كە بە پاشماوەو پاشكۆی ریالیزم دەژمێردرێ، ئەگەر بمانەوێ (گوستاف فلوبێر) بە نووسەرێكی (ناتوراليزم) بژمێرین دەبێ بیدەینە پاڵ ئەم قۆناغەی ناتوراليزم.

بەڵام ناتوراليزم، وەكو (قوتابخانەیەكی ئەدەبی) چوار چێوەیەكی زۆر تەنگتری هەیەو بەو قوتابخانەیە دەگوترێ كە ئەمیل زولا ١٨٤٠- ١٩٠٢و هەڤاڵەكانی بونیاتیان ناو نزیكەی دەساڵ ١٨٨٠- ١٨٩٠ بەسەر ئەدەبیاتی ئەوروپاوە فەرمانڕەوا بوو، پاش ئەوەش هەر چەند وەكو قوتابخانەیەكی سیستەماتیك نەمایەوە بەڵام سێبەری بەسەر گەلێك لە نووسەرانی سەدەی بیستەمەوە دیارەو دەتوانرێ بگوترێ كە ژمارەیەك لە نووسەرانی هاوچەرخی ئەوروپاو ئەمریكا سوودیان لەم پێشەنگانەی ناتوراليزم وەرگرتووەو لاساییان كردونەتەوە.

## راپەڕینێكی سیاسیو ئابووری

ئەو گوتارانەی كە ئەمیل زولا لە ساڵی ١٨٦٥دا لە رۆژنامەی (Salutpublic)دا بڵاوی دەكردنەوە نوقڵانەی لەدایكبوونی ناتوراليزمی رادەگەیاند، زۆلا لەو وتارانەیدا وەكو ناوی قوتابخانەیەك سوودی لەو وشەیە وەرنەگرتبوو، بەڵام ئەو رێسایانەی، كە پاش ئەوە، دەیویست بۆ هونەرەكەی خۆی هەڵبژێرێ بە زەقی دەری دەبڕی.

زولا كە لاوێكی شارستانی بوو و لە ساڵی ١٨٥٨دا لە شاری "ئاكس"ەوە بۆ پاریس هاتبوو، لە ژینگەی تایبەتی (سیاسیو ئابووری) ئاخرو ئۆخری قۆناغی ئیمپراتۆری دووەمەوە (ناپلیۆنی سێیەم) ئەزموونێكی زۆری بەدەست هێنابوو، بەگەڵ شەپۆلی ئارەزوو كەڵكەڵەكانی نەوەی خۆی (واتە ئەو لاوانەی كە لە ساڵی ١٨٦٠دا بیست ساڵان بوون) كەوتبوو و لەهەموو ئەو گەنجانە پتر توانی بووی ئەو خولیاو كەڵكەڵانە بە جدییەتو بە باوەڕی بتەوەوەو لە شێوەی تیۆریدا دەربڕێ. نا توراليزمی زولا هەمیشە نیشانانی شۆڕشێكی دووانی (سیاسیو ئابووری) پێوەبوو هەروەها جۆرە گۆڕانێكی زەینی، كە زادەی ساڵانی ١٨٦٠- ١٨٦٤ بوو، لەخۆگرتبوو، جا لەم رووەوە لەگەڵ (ناتوراليزمی) كەسانێكدا كە خرابوونە ریزی ناتوراليستانەوە، جیاواز بوو،

ئەمەش خۆی لە خۆیدا یەكێكە لە نیشانەكانی ئەو بەدحاڵی بوونەی كە پاشان كەوتە نێوانیانەوە.
(ناتورالیزم) بەلای زۆلاوە "فورمۆلێك" یان خۆی گوتەنی (ئەوزاری سەدە) بوو بۆ بەكارهێنانی تۆژینەوەو تیۆری هاوچەرخانی یەكێك لەوانە: ئۆگوست كونت-ی دامەزرێنەری رێبازی فەلسەفەی Positivismeو، هیپولیت تن-ی بانگەشەكاری ئەم رێبازە فەلسەفییە لە بواری هونەرو ئەدەبیاتدا. "تن" لە ساڵی ١٨٦٢ نووسیویەتی و دەڵێت:
"نەوەی ئێمە، وەكو نەوەكانی پێشوو، دووچاری (نەخۆشی قەڕن) بوو بوو(٠٠٠)، لە داوەرییەكانماندا دەربارەی ئادەمیزاد، ئیلهام بەخشانو شاعیرانمان وەكو مامۆستاو پێشرەوانی خۆمان هەڵبژاردووەو وەكو ئەوان هەندێ لە خەونێن جوانی خەیاڵی خۆمان و تەڵقیناتی كارگەری دڵی خۆمان دەكەین بە بریكاری حەقیقەت. ئێمە باوەڕمان بە وابەستەگی پێشگوییە مەزەبییەكان و نادروستی پێشگوییە ئەدەبییەكانەكان هێناوە.(....)و لە ئەنجامدا زانست خەریكە نزیك دەبێتەوەو لە ئادەمیزاد نزیك دەبێتەوە (...) جا لەم برەوەی زانستداو لەم دەركردنی شتانەدا، هونەرێكی تازە، ئەخلاقێكی تازە، سیاسەتێكی تازەو ئاینێكی تازە هەیەو لە رۆژگاری ئەمڕۆدا ئەركی ئێمەیە كە بە دوای ئەو شتانەدا بگەڕێین.".
ئەم گەڕانە، گەڕانێك بوو كە زۆلا دەستی پێكردو ئەوزارو ئالەتی دەستی ئەو "ناتورالیزم" بوو.

## گۆڕانێكی هزری
## هاوزەمان لەگەڵ گۆڕانی
## ئابووری و سیاسیدا

بەلای مێژوونووسانی هاوچەرخەوە، ساڵانی ١٨٥٩- ١٨٦٠، ساڵانێكی یەجگار گرنگ بوون لە ژیانی رامیاری فەرەنسییەكانداو لە راستیدا ساڵانی خەلەسینی فەرەنسییەكان بوو لە سستی و خاوی و راپەڕینی تازەی كۆماریخوازەكان بوو. ئەم بێدارییە لە راستیدا كاری كردە سەر تەرزی كاری رژێم (ئیمپراتۆریەتی دووەم)و ماهیەتی كاری رژێمو، ساڵی ١٨٦٠ لە رووی گۆڕانی بیروباوەڕو سیستەمەوە هێڵێكە كە دوو لایەنی دژی یەك لێكدی جیا دەكاتەوە. چونكە وەكو دەزانین رژێمی ئیمپراتۆریەتی دووەم لە رووی ئابوورییەوە قۆناغی بوژانەوەو گەشەكردن بوو و، تۆڕی سكەی قیتارو تۆڕی بانك و بانكداری و دامەزرانی شاری گەورە لە فەرەنسادا هەمووی میرات و پاشماوەی ئەو قۆناغەیە.
ئەم گۆڕانكارییە دوولایەنەیە، كارێكی زۆر گەورەی كردە سەر بونیادی كۆمەڵایەتی و ئایدولۆژی وڵات، بە تایبەتی لاوانی دژ بە ئیمپراتۆریەتی دووەم. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بگوترێ كە زۆلا هەر كە گەییە پاریس، واتە لە شوباتی ١٨٥٨دا، بەگەڵ ئەو لاوانە كەوتبوو.
ئەگەر سەرنجی ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە بدەین كە لەگەڵ یەكەمین هەنگاوی ئازادی بەخشی رژێمدا، ژمارەیان دوو هێندەی جاران زیادی كردبوو، بە تۆزێك سەرسامییەوە دەبینین ئەو

بیروبۆچوونانەی بڵاویان دەکردەوە زۆر لەو بیروبۆچوونانەی زۆلا دەچوون کە لە هەردوو وتاری (رقەکانی من)و (ناتورالیزم لە شانۆ)دا دەری بڕی بوون، هەروەها هەمان هەستو بیرۆبۆچوون لە گوتارێن دانایانو دەرس و وانەکانی مامۆستایانی زانکۆدا دەبینین. بۆ نموونە لە وانەکانی (کولژدوفرانس) بە تایبەتی وانە فیزیولوژییەکانی کلود برنار، یان وانەکانی فلورەنس، لە هەموو ئەوانەدا ئاوڕدانەوە لەوەزعی پیشەسازیو کشتوکاڵی هاوچەرخ، ئاوڕدانەوە لە داهێنانو ئیمکاناتی تازەو پیشانگاکانو... هتد دەبینرێ.

نارەزایی لە هەموو ئەوانەدا هەمان ناڕەزاییە، هەموو ئەوانە پتر لە هەر شتێك هێرش دەکەنە سەر ئەدەبیاتی فەرمی، سەر ناودارانی درۆینەی ئەدەبی، سەر ئەو شتانەی رۆژنامەی (فەرەنسای لاو)، ناوی دەنا (شێوازی دەسکردی تەقلیدیو دوور لە رەسەنایەتیو ژیان)، قوتابخانانو مۆدیلان رەفز دەکەنو پشت بە تەبیعەتو بلیمەتی کەسانێك دەبەستن. بە رادەیەك کە زۆلا لە رۆژی ١٨٦٠/٤/١٦دا داوا لە سیزان دەکات کە مۆدیلانو زەوقی بازاڕی وەلابنێ، رەخنە لەو "سوفستائیو پیلانگێڕانەی... کە بەرژەوەندی گەورەی نەتەوەیی، بە بیانووی بەرەڤانی لەو بەرژەوەندیانە، دەخەنە خەتەرەوەو دەیخەنە خزمەتی قازانج خوازی بچووکەوە" دەگرێ. دروشمی وان (ئازادی)یە، ئازادی لە هەموو وارەکاندا، بە تایبەتی لە واری مەزەبیدا. زۆربەی ئەوانە خەڵکانێکی ئازاد هزرنو هەموویان ئەخلاقی کۆنو باو رەتدەکەنەوە. ئەوان ئاگایان لەوە هەس کە هەموویان سەر بەیەك حیزبن "حیزبی لاوان"و چارەنووسی خۆیانو چارەنووسی وڵاتو ئایندە بەیەك دەزانن (فەرەنسای لاو) لەم بارەیەوە دەنووسێت:

"زەمانی رابوونو بێداریو خەباتو بەرەڤانی هاتووە. بۆ پێشەوە ئەی لاوان! (...) ئێمە وەچەی لاوی ئایندەین. ژیان بۆ ئێمەیە (...) ئێمە رۆڵەێن ئەم زەمانەین، و راستگۆیانە قەبووڵی دەکەین، بەڵام دەمانەوێ پێش بکەوێتو بە ئومێدی ئایندەی باشترین. حیزبی ئێمە حیزبی نیشتمانە. ئێمە تەنیا سەرکەوتنی نیشتمانمان دەوێ، بۆیە رایدەتەکێنین تا بێدار بێتەوە..

بەمجۆرە تەنیا مەسەلەی ململانێی وەچەکان لە ئارادا نییە. بەڵکو مەسەلەیەکی قووڵتر لە نێودایە، ئەویش دەرك کردنی گۆڕینی سیمای شارستانیەتێکی تەواو، واتا گۆڕینێکی ریشەیی.

چونکە ئەم لاوە نارازییانە لەوە بە ئاگان کە شایەتی کۆتایی شتێکنو بەخۆیان دەوریان لەو پرۆسەیەدا هەیە. (ژول میلین) لە رۆژی ١٩٦٢/٢/١٦دا لە رۆژنامەی کاردا دەنووسێت: ئێمە لە رۆژگارێکی پڕ پاشاگەردانی ئەخلاقیو زەینیدا دەژین. (...) قەرنی هەژدەیەم هەموو هێزو تواناو کاروکردەوەی خۆی بۆ دژایەتی هەڵە کۆنو خورافاتە کۆنەکان تەرخان کرد. بە جورئەتێکی گەورەوە بینای حکومەتو سیستەمی فێوداڵیو کەشیشانی، کە زۆر مکومو قایم دەهاتە بەرچاو، هێنایە لەرزەو بەم کارەش خزمەتێکی گەورەی بە ئایندەکرد. بەڵام کە رابوردووی رووخان، چ شتێکی لە جیاتی ئەو رۆنەنا، کاری بونیادنانەوە خرایە عۆدەی قەرنی نۆزدەو ئێستا ئێمە دەبێ لە رێگەی ئەم ئەرکە شانازی ئامێزەدا هیممەت بکەین (...) ئێمە ئەمرۆ بە هەمان شێوەی هەژدە سەدەی پێش ئێستا، لە قۆناغێکی پڕ زاوزێدا دەژین. زەینمان پێویستی بە فورمۆلێکی فەلسەفی تازە هەسو پێویستە ئەوەندە کار بکات کە بتوانێ ئەو فەلسەفە تازەیە بدۆزێتەوە.

(گۆڕانکاری)، (بێداری)، (زاوزێ)، (زمانگرتنی منداڵ)، (سکپڕی)و... ئەمانە ئەو وشانەن کە لە نووسینی هەموو ئەندامانی ئەم (حیزبی لاوان)ـەداو لە نووسینەکانی (زۆلا)شدا دەبینرێن. زۆلا لە ١٨٦٠/٦/٢ لە نامەیەکیدا بۆ (بای) دۆستی دەڵێت: ئەم سەدەیەی ئێمە سەدەی گۆڕانە، لە رابردووی بێزراوەوە هاتووین و بەرەو ئایندەیەکی نادیار بەڕێوەین.

هەڵبەتە ئەم ئاگادارییە سەبارەت بە بەشداریکردن لە کۆتایی هێنانی رۆژگارێک، و پێشوازیکردنی تەواو لە رۆژگارێك کە لەحاڵی مەیین و دروست بووندایەو، باوەڕهێنان بەوەی کە دەبێ لەم بونیادە نوێیەدا بەشداری بکرێ، بناغەیەکی مکومو بتەوی بۆ ئەو دنیا تازەیە دابین کرد. پاش شکستی کۆماری خوازان لە ساڵی ١٨٤٨دا، ئەم وەسوەسەی (مەحکەمکاری)و (حەددی بوونە) لە هەوویانداو بە تایبەتی لەلای زۆلا دەبینرێ، کە لە زۆربەی نووسینەکانی ئەودا بە تایبەتی لەگەڵ وشەی (ناتورانیزم)دا بەدی دەکرێ.چونکە (زۆلا) بە هەموو هێزو توانایەوە لەم راپەڕینەدا بەشدارە. لە پێشەکی (رقەکانی من)دا دەڵێت:

من گاڵتەم بە سەدە زێڕینەکان دێ. من تەنیا دەرەبەستی ژیان و خەباتم. لە نێو هاو تەمەنانی خۆمدا خەیاڵم رەحەتە.

لەم قۆناغی پڕ جۆش و خرۆشە گشتیەدا، لەم قۆناغی توژینەوەو یاخی بوون و وێرانکاری و بونیادنانانەوەدا، ئەویش هەست بە زەرورەت ئەو (فرمۆلە فەلسەفیی)یە دەکات کە (ژول میلین) عەوداڵی بوو. لە هەمان نامەدا کە بۆ (بای) نووسیوە دەڵێت:

ئەوەی رۆژگاری ئێمە جیا دەکاتەوە، ئەم هەڵچوون و چالاکی و چەلەنگییە پڕجۆش و خرۆشەیە. چالاکی لە بواری زانستدا، لە وار ی بازرگانیدا، لە مەیدانی هونەرداو، لە هەموو شوێنێکدا: سکەێن قیتار، ئەو هەڵمەی کە کەشتیان دەجولێنێ، ئەو باڵۆنانەی کە دەچنە ئاسمان. لە واری سیاسەتدا وەزعو رەوشەکە خراترە: میللەتان رادەپەڕن و ئیمپراتۆریەتەکان دەیانەوێ یەك بگرن. لە جیهانی مەزەب و ئایندا هەموو شتێك لەق بووە، لەم دنیا تازەیەدا کە لە حاڵی سەر هەڵبڕیندایە، پێویست بە مەزەبێکی تازەو زندوو هەس.

وەڵامی (ناتورالیزم) بۆ ئەمە چاوەڕوان کردنە. ئەم قوتابخانەیە لە هەمان کاتدا هەم نکوڵی کردنەو هەم بونیاد نانەوەیە. بۆ دروستکردنی دنیای ئایندە لەسەر پایەی مکوم، دەبێ سیستەمێك بدۆزرێتەوە کە نە سیستەمی محافەزەکاری بێ (کە پشت بە تەسەوراتی کۆنەپەرستانە دەبەستێ)و نە سیستەمی شۆڕشگێڕان بێ (کە پشت بە تەسەوراتی سەلبی دەبەستێ).

پێویستە کۆمەڵگەیەك بونیاد بنرێ کە کۆمەڵگەی دادپەروەری و برایەتی بێ... زۆلا دەڵێت:

ئێمە نەخۆشی پێشکەوتن و سنعەت و زانستین و بەدەم تاوە دەژین. کۆمەڵگە لە راستیدا وەکو جەستەیەکی زندوو یان وەکو ئامێرێکە. ئۆژن پاز لە ساڵی ١٨٦٥ وای نووسیوە:

من دەتوانم خۆمان بەو مەکینەی قیتارانە بشبهێنم کە بە زەبری هێزی بوخار یان هەڵم گەرم بووەو کۆمەڵێك پێچکە و گێری لاوازی پێوە بەستراوە، ئیدی یان دەبێ مەنجەڵی هەڵمە کە بتەقێ یان پێچکەو گێرەکان بشکێنێ.

بەمجۆرە دەبێ هاوسەنگیو هاوئاهەنگییەك لە نێوان بەدەنو روحدا دروست بكرێ، لە نێوان دەسەڵاتو ئازادی تاكدا، هەروەها هاوسەنگی كۆمەڵایەتی، هاوسەنگی بەرژەوەندییەكان، و دادپەروەری كە داینەمۆی رێكخستنی پەیوەندی نێوان بەرژەوەندی تاكو بەرژەوەندی كۆمەڵە.
تاتورالیزمی زۆلا دەخوازێ بە گەڕانەوە بۆ مودیلی تەكنولۆژی یان مۆدیلی سروشتی ئەو هاوسەنگییە بدۆزێتەوە، و ئەم كارەش بە هیچ كلۆجێ بریتی نییە لە بێدەنگ بوون یان محافەزەكاری، بەڵكو مەبەستو ئارمانجی ئەم كارە دوزینەوەو پەیداكردنی هاوسەنگییە لە نێوان ژیانو سەلامەتیدا.
بەڵام لە روانگەی كۆماریخوازانی لاوەوە ئەوەی رێگە لەم كارە دەگرێت، كڵێسایە كە ئەوان زۆر بە توندی سیستەمەكەی رەتدەكەنەوە. كڵێسا پشتیوانی لە كودەتا كردبوو و گەورەترین هێزی محافەزەكاری كۆمەڵایەتی بوو. هەڵبەتە خودان موڵكو كاسبكاران (نەك هەر خودان موڵكی گەورە، بەڵكو تەنانەت سەرمایەدارانی بچووكیش) لەترسی سوسیالیزمو بەرپابوونی ئاژاوە لە ناو كۆمەڵگەدا، roviyan كردبووە كڵێسا. ڤیویو-ی رۆژنامەنووسی كاتولیكو داكۆكیكاری كڵێسا دەینووسی كە:
پێویستە لە كۆمەڵگەدا خەڵكانێك هەبن زۆر كار بكەنو ژیانێكی كولەمەرگییان هەبێ. هەژاری، یاسای بەشێكی كۆمەڵگەیە. ئەمە یاسایەكی خواییەو دەبێ جێبەجێ بكرێ.
پاپی نۆیەم، لە ١٨٦٠/١/٣٠دا لە نامەیەكیدا بۆ كەشیشەكانی، فەرەنساییەكان هاندەدا بۆ جیهاد دژی شۆڕش، كە بەلای ئەوەوە ترسناكو زەرەردار بوو (شۆڕش) لەولاشەوە لاوان دژی دەستوەردانی كڵێسا بوون لە كاروباری كۆمەڵایەتیو پێیان وابوو تا پەیوەندی نێوان كڵێساو دەوڵەت كەمتربێ، تەرەقی و پێشكەوتن ئاسانتر دەبێ.
بەمجۆرە ناتورالیزم بەلای زۆلاوە بەر لە هەر شتێك رێبازێكی ئەنتی كڵێسایی و كۆتایی (تابۆ)كان بوو، گێڕانەوەی ئابڕوو حەیسیەتی جەستەیە یان بە گوتەیەكی باشتر رێبازێكی تازەیە بۆ قسەكردن لەسەر جەستەو بەخشینی ژیان بەجەستە. بە كورتی هاوسەنگییە هەم بۆ تاكو هەم بۆ كۆمەڵگە. چونكە (زۆلا)ش وەكو (لویس ژوردان)و (ئوژن پان)و گەلێك لە رۆژنامەوانانو نووسەرانی دیكەی هاو سونحی خۆی، پێی وابوو كە كڵێسا نەژادی بەشەری وێران كردووەو هێزو شنگی لەبەر فەرەنسا بڕیوەو وەكو هەموو ئەوان جگە لەوەی لایەنگری خوێنەواری گشتیو نەهێشتنی نەخوێنەواری بوو (چونكە سەدی پەنجای دەنگدەران نەخوێنەوار بوون) دەشیویست لاوان بكەونە وەرزشی بەدەنیو كوڕان- سەربازانی ئایندە-و كیژان -دایكانی ئایندە- ژیانێكی شایستەیان هەبێ.

## ناتورالیزمو زانست

پێشكەوتنی زانست، بە تایبەتی لە هەردووك بواری (فیزیۆلۆژی)و (زەویناسی)دا بە تەواوەتی بیری زۆلای مژۆل كردبوو و جۆرە شۆڕشێكی لە ناخیدا بەرپا كردبوو. زۆلا لە نێوان ساڵانی ١٨٦٦ (ساڵی پەیوەندی كردنی زۆلا بە كۆنگرەی زانستی Aix- en- provence تا ساڵی

۱۸۸۰ (ساڵی بڵاوکردنەوەی بەرهەمە تیۆرییە بەناوبانگەکەی زۆلا بەناوی رۆمانی ئەزمونگەری) لە رێگەی زۆر نووسینیەوە تێۆرییەکانی ناتورالیزمی راڤەو شرۆڤە کرد. لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەوانان بە بەردەوامی هێرشیان دەکردە سەری‌و، ئەویش وەلامی دەدانەوەو بەرەڤانی لە خۆی دەکردو، تایبەتمەندی‌و خەسڵەتەکانی رۆمانی لە گۆشەنیگای خۆیەوە شرۆڤەو شەرح دەکردو ئیعترازی لەو رەخنەگرە بێ ئاست‌و بەدخواو دڵپیسانە دەگرت کە بیروبۆچوونەکانیان دەشێواند:

جارێ ناتورالیزم لە ئەدەبیاتدا بیدعەتێکی سەیر نییە کە زادەی خەیاڵی پایەخوازانەی کاندیدێك بێ بۆ سەرۆکایەتی قوتابخانەکە. زۆلا لە هەموو نووسینە تێۆرییەکانیدا ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە لە ئەدەبیاتدا شتێك نییە بەنێوی (قوتابخانەی ناتورالیست)و ئەم قوتابخانە خەیاڵییە ناکرێ سەرۆکێکی هەبێ. زۆلا دەیگوت: "ناتورالیزم رێبازە یا بە گوتەیەکی سادەتر بیلێین گۆڕانێکە"و لە هەمان کاتدا درێژەی خواستی بەرهەمی ژمارەیەك لە پێشەوایانەو لەلایەکی دیکەوە ئەنجامی ئاسایی قۆناغێکی تازەی شارستانییەتە.

زۆلا، ناتورالیزم بە زادەی بیروباوەڕەکانی دیدرۆ دەزانێ (زانست پەروەری) ئەم ئەنسکلۆپیدیادارە ناسراوەی فەرەنسا، لە بەرانبەر (ئایدیالیزم پەروەری روسۆدا) دیدرۆ دەخاتە خانەی پێشەواو پێشەنگی باوەڕێکەوە کە لاف زەرورەتی بەکارهێنانی رێبازی ئەزموونگەری زانستان لە واری ئەدەبیاتدا لێدەدا. (زۆلا) دەڵێت: "لەگەڵ دیدرو-ی باوکی پوزیتیڤیستانی ئەمڕۆی ئێمەدا، رێبازێن دیتن‌و ئەزموونی پراکتیکی لە ئەدەبیاتدا لە دایك دەبێ". وەکو چۆن رۆمانتیکەکان، رۆڵەو پاشماوەو جێ نشینی رۆسۆو دواتر شاتۆبریان، لامارتین، هۆگۆ، و جورج ساند بوون، ناتورالیستەکانیش جێنشینی دیدرۆو دواتر ستاندال، بالزاك، فلوبیر،و برایانی گنکورن: زۆلا بە ئانقەست بیروبۆچوونەکانی خۆی لە هەمبەر رێبازی رۆمانتیکەکان رادەگرێ‌و بەراوردیان دەکات‌و ئەوان بە هونەرمەندانێك دەزانێ کە بێ ئەوەی بەخۆ بزانن هەمان ئەستاتیکی کلاسیك بەکار دێنن: "نموونەکان دەپارێزن‌و تەجریدیەتی باوی کلاسیك پەرەپێدەدەن‌و دڵیان بەمە خۆشدەکەن کە گوایە بەرگێکی دیکەی لەبەر دەکەن"، ئایدیالیزمی رۆمانتیك دروست خاڵی بەرانبەری ئەو (ریالیزمی زانستی)یەیە کە زۆلا پێشنیازی دەکات. زۆلا هۆی شکستی رۆمانتیزم لەمەدا دەبینێ کە ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی تازەو ئارەزووی زانست پەروەری ئەو کۆمەڵگەیەدا نەدەگونجا.

زۆلا دەڵێت: "هەندێ کۆمەڵگە هەن کە گۆڕانکاری ئەدەبی دروست دەکەن" داهێنانی ئەدەبی هەر سەردەمێك وەکو بەرهەمێکی گەورەی نەناسراوە کە ئەندێشەی گرنگ بەڵام ناچاری هەموو ئەو وەچەیە رێبەرایەتی کردووەو هێناویەتە ئاراوە. هەروەها دەڵێت:

"نووسەرێك چەند بەهرەدارو بلیمەت بێ، هەر کرێکارێکی سادەیەو بەردی خۆی بەشانی خۆی دەکێشێت‌و بەگوێرەی توانای خۆی درێژە بە تەمەنی ساختمانی میللی دەدات" ناتورالیزم وەزعێکی شۆڕشگێڕانەی ئاژاوەخوازی نییە، بەڵکو بەرەنجامی گۆڕانێکی سروشتییە. سەدەی نۆزدە بە دەرەجەی یەکەم سەدەی زانستە:

**"نــاتوراليزم بــەرەنجامی سروشــتی کۆمەڵگــەی دیمــوکراتیکی تازەیــە گــرنگترین نیشــانەی شارستانیەتی رۆشنبیرانەی تازەی ئێمە، زیاد بوونی لە تەسەور بەدەری ئاگایی و هۆشیاری ئێمەیە. دەبارەی سروشت. نووسەری ئەوڕۆ، ئەگەر لە رووی بەهرەداریو بلیمەتیشەوە هاوتاو هاوشانی نووسەرانی رابردوو بێ، ئەوا گومانی تێدا نییە کە بەرهەمی دەولەمەندترو دروستتر لە پێشینانی خۆی دادێنێو لەوان نزیکترە لە واقیعەوە".**

**ئەوەی زۆلا داوای دەکات بەر لە هەر شتێك بریتییە لە بەکارهێنانی رێبازە زانستییە سروشتییەکان لە بواری ئەدەبیاتداو هەروەها سوود وەرگرتن لەو زانیارییانەی کە ئەو زانستانە بە دەستیان هێناوە. رێنوێنی ئەو لەم بارەیەوە بەرهەمە زانستیەکانی رۆژگارو سەردەمی خۆیەتی کە بوارە جیاوازەکانی ژیانو رێبازە زانستییەکانی شیکردۆتەوە. هەندێ لەو بەرهەمە گرنگانە بریتییە لە: (نامەی بۆ ماوەیی سروشتی)ی (لۆکاس ١٨٤٧- ١٨٥٠)، وەرگێڕانی (ئەسڵی ئەنواع)ی داروین (١٨٦٢)و بە تایبەتی (پێشەکییەك بۆ پزیشکگەری ئەزموونگەری ١٨٦٥)ی کلود برنار. زۆلا لە زۆربەی وتارەکانی خۆیدا پشتی بە کتێبەکەی کلود برنار دەبەست. هەر چەندە لە کاتی نووسینی یەکەمین رۆمانو دەربڕینی هەوەڵین بیروبۆچوونەکانی خۆیدا، ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو بەرهەمەی برناردا پەیدا نەکردبوو، لێ پاش خوێندنەوەی ئەو کتێبە لە پڕ بیروبۆچوونە ئاڵۆزو نا پوختەکانی ناو مێشکی بە تەواوەتی لا روون بووەو لێبڕا لەوە بەدواوە پەنا وەبەر ئەو زانا بلیمەتە بەرێ، بۆیە لەوە بەدواوە ئەو کتێبەی کرد بە سەرچاوەی هەموو بەڵگەکانی خۆی.**

**(کلود برنار) پێی وا بوو کە ئەو رێبازە زانستییە بنجڕەی دەربارەی (تەنە بێ گیانەکان) بەکار دەبرێ پێویستە دەربارەی (تەنە زیندووەکان)ش تەتبیق بکرێ. و زۆلا دەیگوت دەبێ ئەم رێبازە لەگەڵ (ژیانی سۆزداریو زەینی)شدا بسازێنرێ. ئامانجی رەوشو رێبازی ئەزموونگەری (دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییانەیە کە دیاردەیەك بباتەوە سەر هۆیە هەرە نزیکەکەی ئەو دیاردەیەو هەلومەرجە پێویستەکانی بە دیارکەوتنی ئەم دیاردەیە بدۆزێتەوە).**

**بۆ گەیشتن بەم ئەنجامەش دەبێ پەنا وەبەر رامانو دیتنو تۆژینەوەی پاژەکان (جزئیات) ببرێ. پێش زۆلا، رێبازی دیتنو رامان لە ئەدەبیاتدا، لەلایەن بالزاكو ستاندالو فلوبیرەوە بەکار هێنرابوو. زۆلا روانگەو تیۆری خۆی بەم رستەیە دەردەبرێ:**

**" کەسێك کە لەسەر ئەزموون کار بکات، موفەتیشی سروشتە"و دەڵێت: "رۆمان بریتیە لە راپۆرنامەی تەجروبەو ئەزموونان" بەمجۆرە باوەڕی وایە کە نووسەر بەتەواوەتی خەیاڵ تەرك بکات، چونکە:**

**"چۆن جاران دەیان گوت فلان نووسەر خودانی خەیاڵێکی بەهێزە، من دەمەوێ لێرە بەدواوە بگوترێ کە خودانی هەستی واقیعبینییە. ئەم پێناسەیە دەربارەی نووسەر گەورەترو دروستتر دەبێ. بەهرەی دیتن لە نێو خەڵکانی جیاوازدا خاڵی هاوبەشی زۆر کەمترە لە بەهرەی ئەفراندن لە نێو هەمان ئەو خەڵکەدا.**

بەڵام ئەم دیتن و روانینە دەبێ ئاوێتەی تەجروبەو ئەزموون بێ، یانی نووسەر حاڵاتێك لەبەرچاو بگرێ کە بتوانێت پەیوەندییەکانی نێوان دوو دۆخی جیاوازی یەك دیاردە نیشان بدات. ئەمەش هەمان ئەو رێبازە ئەزموونگەرییەیە کە کلود برنار دەیویست لە واری لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی زیندەوەرزانیدا جێبەجێی بکات و بیهێنێتە ناو زانستی پزیشکگەرییەوە. زۆلا لە کتێبی (رۆمانی ئەزموونگەری)دا بەمجۆرە رێبازی ئەزموونگەری بۆ رۆماننووسان شەرح و شرۆڤە دەکات: رۆماننووس هەم تەماشاکەرەو هەم ئەهلی تەجروبە. وەکو تەماشاکەر، رووداوەکان وەکو چۆن دەیان بینێ ئاوا نیشانیان دەدا. بۆ ئەم کارەش، سەرەتای دەست پێکردن دەست نیشاندەکات و زەمینەیەکی مکوم و قایم بۆ جولەی قارەمانەکان و دیاردەکانی چیرۆکەکەی لەبەرچاو دەگرێ. پاشان وەکو ئەهلی تەجروبە، قارەمانەکانی خۆی لە چوارچێوەی چیرۆکێکی تایبەتیدا دەخاتە گەر، کە لە وێدا زنجیرەی یەك لە دوای یەکی رووداوەکان بە شێوەی ئەنجامێکی جەبری ئەو دیاردانەی خراونەتە بەر موتالا بەرجەستە ببێ. لە شوێنێکی دیدا دەڵێت: "رۆمانی ناتورالیستی تاقیکردنەوەیەکی واقیعییە کە رۆماننووس بە پشتیوانی ئەزموونەکانی خۆی لەسەر تاکی کۆمەڵ ئەنجامی دەدات".

بەکارهێنانی ئەم رێبازە وا دەخوازێ کە دنیای ئەخلاقی بە شێوەیەکی ماددی و میکانیکی دەرك بکرێ، زۆلا وای دادەنێ کە "دنیای بەشەری-ش سەر بە هەمان جەبرییەتە کە بەسەر هەموو بوونەوەرانی تەبیعەتەوە فەرمانڕەوایە". ئەم باوەڕە کە بە پایەو کۆڵەکەی فەلسەفی ناتورالیزمی ئەدەبی دەژمێردرێ، زیاتر لە هەر شتێکی دی دژمنانی زۆلای هاروژاندو دەنگی ناڕەزاییان بەرز بووەوە. جا ئەمانە رەخنەی ئەوەیان لە زۆلا دەگرت کە کاری رۆماننووسی بە تاقیکردنەوەی زاناکان دەشوبهاند. چونکە ئەو رۆماننووسەی کە رێبازی ئەزموونگەری دەگرێتە بەر، زیاتر لە زانا دەچێت تا لە شاعیرو هونەرمەند. دەتوانین لە رێگەی ئەم گوتەیەی زۆلاوە باشتر پەی بەو مەبەست و بابەتەی سەرێ بەرین:

"ئێستا زانست دێتە ناو قەڵەمڕەوی ئێمەوە. ئێمەی رۆماننوسان لەم قۆناغەی کاری خۆماندا توێکاری وەزع و حاڵی فەردی و کۆمەڵایەتی تیرەی بەشەرین. وەکو چۆن فیزیۆلۆجی زان درێژە بەکاری فیزیکزان و کیمیازان دەدات، ئێمەش بەدیتن و ئەزموونەکانمان درێژە بەکاری فیزیۆلۆجی زان دەدەین.. بە کورتی وەکو چۆن کیمیازان و فیزیازان لەسەر کەرەستەی بێ گیان کار دەکەن و فیزۆلۆجی زان تەنە زندووەکان دەخاتە بەر تاقیکردنەوە.

ئێمەش دەبێ کار لەسەر سیفەت و تایبەتمەندی و هەوەس و ئارەزوو هەڵچوون و رەفتارو داب و نەریتی تاك و کۆمەڵی تیرەی بەشەر بکەین.

یەکەم بەرهەمی زۆلا کە لەسەر بناغەی ئەم تیۆرییە ئەزموونگەری و "جەبرە زانستییە" دامەزرابێ (ترازراکون)ە زۆلا لە پێشەکی ئەم کتێبەدا دەڵێت:

"لە ترزراکوندا تایبەتمەندییە ئەخلاقی و روحییەکانی قارەمانەکانم شی نەکردۆتەوە، بەڵکو وەزعی میزاجیانم خستۆتە بەر شیکردنەوە. ئاشقێنی قارەمانانی من تێرکردنی پێداویستییەکە ئەو قەتڵەی ئەنجام دەدەن ئەنجامی زینای ئەوانە، وەکو چۆن گورگان مل دەدەنە کوشتنی مەڕ،

ئەوانیش ئەم ئەنجامە قەبوڵ دەکەن و، لە ئەنجامدا ئەو شتەی کە ناچار بووم ناوی بنەم پەشیمانی، زادەی بیّ نەزمی سادەی ئورگانی و سەرکێشی ئەعسابی بزواو ناڕەحەتی ئەوانە".
لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێت:
" مەبەستی من زیاتر مەبەستێکی زانستی بوو. من پاشاگەردانی و پەشێوی قووڵی میزاجی خوێناویم، لە مامەڵە کردن لەگەڵ تەبعی ڕەشبینیدا نیشان داوە... من زۆر سادە ئەو کارەی کە جەڕاح لەسەر جەستە ئەنجامی دەدا، لەسەر دوو بوونەوەری زندوو ئەنجامم داوە.

## مەسەلەی ویراسەت

مەسەلەیەکی دیکە، کە ناتورالیستەکان هێناویانەتە نێو ڕۆمانەکانی خۆیان و پشتیان پیّ بەستووە، مەسەلەی کاریگەری بۆ ماوەییە لەسەر بارودۆخی روحی مرۆڤ. چونکە باوەڕیان وابوو کە هەلومەرجی بەدەنی و روحی هەر کەسێك لە دایك و باوکییەوە بۆی ماوەتەوە.
دەربارەی مەسەلەی ویراسەت زۆلا سوودێکی زۆری لە لۆکاس و کتێبەکەی لۆکاس (نامەی ویراسەتی سروشتی) وەرگرتووەو لەسەر بنەمای ئەم تێۆرییە زنجیرە ڕۆمانی ناوداری (ڕوگون ماکار)ی لە بیست بەرگدا بەناوی (مێژووی سروشتی و کۆمەڵایەتیماڵباتێك لە زەمانی ئیمپراتۆریەتی دووەمدا) نووسی. زۆلا، لەم زنجیرە کتێبەدا ژیانی خانەوادەیەکی بچووکی. شەرح و شیکردۆتەوەو سەرجەلە نامەیەکی بۆ فەرزەندانی ئەم خێزانە ڕێکخستووەو بەسەر لق و پۆپی جیاوازدا دابەشی کردوون. حیکایەتی ئەم زنجیرە کتێبە، بریتییە لە گەشەکردن و نەشونمای لق و پۆپەکانی ئەم شەجەرەیە. لە یەکەم روانیندا هیچ لێکچونێك لە نێو ئەندامانی ئەم خێزانەدا نابینریّ، لیّ ژێراوژێر رستێکی قایم و توند پێکەوەی بەستوون و بردوونیەتێوە سەر یەکدی. ئەو فەرزەندەی کە لە ئەنجامی پەیوەندییەکی حەرام و لە دایکێکی داوێن پیس هاتبێتە دنیاوە، سەرسەری و عەرەقخۆرو تاوانکار دەردەچێت، هەڵبەتە ئەوانی تریش ڕۆڵەی هەلومەرج و ژینگەی خۆیان دەبن.

## تایبەتمەندییەکانی بەرهەمێن ناتورالیستی

بەم جۆرە ناتورالیزم لە شێوەی ڕاپەرنێکدا، دژ بە دادوەرێین پێشوەختە و قەراردادی ئەخلاقی و مەزەبی دێتە مەیدان . ئەو سانسۆرەی کە کۆمەڵگە خستوویەتیە سەر بەشێك لە دیاردەکانی تەبیعەت و ژیان، تێك دەشکێنیّ. باسی شتانێك دەکات و دیمەنانێك شیدەکاتەوە کە تا ئەو ڕۆژە ڕێیان نەکەوتبووە نێو بەرهەمێن ئەدەبییەوە ، جا ئەمە یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی ناتورالیزم کە پابەندانی داب و نەریت و قرێردادە ئەخلاقییەکان و دژی ناتورالیزمیان دەهاڕۆژێنیّ. باسکردنی دزێوی و کارەساتەکانی هەژاری و بێدادی کە هەوەڵجار لە بەرهەمەکانی دیکنزەوە دەستی پێکرد بوو، و کۆمەڵگەی بورژوازی دەیویست خۆی لیّ گێل بکات، لە کارەکانی زۆلادا گەییە لوتکە. لە وڵاتانی دیکەشدا تورگینیف و جورج ئیلیوت و هاوپێتمان باسی دەکەن.

تـاكرى داوەرييـە پێشـوەختە ميلييـەكان و خۆپەسـنديى و پايـەخوازيى و شـكۆخوازى كۆمەڵايـەتى دەداتـە بـەر تـەوس و توانجـان. لـە شـانۆدا، سـودرمان رەخنـە لـە داب و نـەريتى شـەرەف و شـانازى دەگرێت، ئيبسن پەردە لەسەر دووڕوويى و ريا لادەبات، جياوازييـە قوڵـەكانى نێوان حەقيقەت و ژيانى كۆمەڵايەتى دەخاتە روو، و ئەو لەمپـەرو بەرهەڵستانەى دێنـە بـەردەم گەشـەى ئـازادى تـاك نيشـان دەدات. نـا توراليسـتەكان. شـتانى نـەنگ ئـامێز، مايـەى پێكـەنين و شـەرمەزارى و بچوكبوونەوەى ئەڤين لە بەرا نبەر سوودخوازيدا ريسوا دەكەن و بۆ يەكەمجار ئەڤين بە شێوەى ويستێكى بەدەنى و رەگەزى وەكو ئەزموونێكى حەڵاڵ و رەوا لـە بەرهەمەكانياندا دەخرێتـە روو. بـەمجۆرە دەتـوانرێ بگـوترێ كـە ئـەدەبياتى ناتوراليسـتى بەشـێوەيەكى گشـتى رەخنەيـەكى توندوتيژە لـە بونيادەكانى كۆمەڵگـە جا چونكە ئەم كۆمەڵگەيە جۆش و خرۆشى راستگۆيانەى رۆمانتيزم و روحيانەتى قووڵى مەزەب و ئاينى لـە دەست داوە، بۆيـە لـە هـەوڵى ئەوەدايـە بـە هـەر چوار چنگ خۆى بـە جۆرە ئـەخلاقێكى ئايدياليستيدا هەڵواسـێ، و لـە بەرانبـەر ئـەم بەربەسـت شـكاندنەدا جـۆرە كاردانەوەيـەك نيشـان بـدات. هێرشـى تونـد بـۆ سـەر زۆلاو لايـەنگرانى، و محاكەمەى فلوبير، بۆدلێرو ئۆسكار وايڵد لەوەوە هەڵقولاوە.

جا بە حوكمى ئـەو رێبازەى كـە ناتوراليزم گرتوويـەتىٚ بـەر، هەنـدىٚ لـە دياردەكانى كۆمەڵگـە لـە بەرهەمێن ناتوراليستيدا هەقى دەست پێشكەرى پەيدا دەكەن. ماجەراى زۆربەى چيرۆكەكانى بە جۆرىٚ روو دەدا كە دەڵێى جگە لە چەپەڵى، پەرێشانى، بێدادى و خـەوش و نەنگ چ شتێكى دى لە ئارادا نييە. ناتوراليزم بەپێى لۆژيكى كاردانەوە دژ بە ديدو روانگەى رۆمانتيك، ئايدياليستى يان تەنيا فەرمى، هەموو دنيا تەنيا لە دياردە پێچەوانەكا نى هـەموو ئەوانـەدا كورت دەكاتـەوە و ئەگەرچى زۆربەى ئەم كارانە بەناوى رياليزم و واقيعبينييەوە ئـەنجام دەدات، لـىٚ لـە ئاكامدا يـا ن لـە كۆتاييـدا كارەكـە بـە شـێوەى جـۆرە لاسـارييەكى هانـدەرو، رەخنـەى شۆڕشـگێڕانەو يـان مامەڵەيەكى رەشبينانەو فەلاكەت گەرا بۆ مرۆڤ دەشكێتەوە.

سووربوون لەسەر پەردەلادان لەسەر هەموو رووداوەكان و واقيع بەوە دەشكێتەوە كە تەنيا دياردە بازاڕييە رۆژانەكان شيبكرێنەوە. سوور بوون لەسەر ديتنى هەموو ئەو شتانەى كە لە مرۆڤدا هەن دەبێتە هۆى ئەمەى كە هەموو مرۆڤەكان لە شێوەى بوونەوەرانێكدا بدينين كـە هيدايـەت گوتـەنى: "هـەر هـەموويان يـەك زار بوونـەو كۆمـەڵێك ريخۆڵـەيان پێـوە هەڵواسـراوەو دەچـێتەوە سـەر كـۆ ئەنـدامى زاوزێييـان" بايەخـدانى لـە رادە بـەدەر بـەوەى كـە تەسـليمى خورافـا ت نـەبين. دەگاتـە ئـەوەى كـە هـەر جـۆرە ئيمـان و باوەڕێك بـە خورافـات بـژمێرێن. (ئـازادى) تـەنيا لەبـەر ئەمـەى كـە هەسـتێكى خـۆ بـەخۆى دەروونييـە، ئينكـار دەكـرىٚ: ژيـانى مرۆڤـانى لـە كـۆت و زنجـيرى بێڕەحمانەى جەبرى مێژوويى، كامڵبوونى ژينناسى، ويراسەتى جەستەيى و كۆمەڵايەتى نراوە.

ناتوراليزم كە لـە بـارى تيۆرييـەوە دژى داوەرييـە پێشـوەختەكان رابووەو بـەناوى رياليزم و واقيع گەراييـەوە هاتۆتـە مەيـدان، بـە جـۆرىٚ لەسـەر بنـەماى قـەرار و بڕيـارە پێشـوەختەكان هەڵوێسـت وەردەگرىٚ كە بە ناچارى ئەو روانگە ئازادو روونەى كە لە مەڕ واقيع هەمانـە، ئـاوەژوو دەكاتـەوەو

ڕەنگە خودی واقیعەکەش ئاوەژوو بەرەواژ بنوێنێ. قارەمانی ڕۆمانی ناتورالیستی، لە ژێر فەرمانی هەلومەرجێن بەدەنی و جەستەیی خۆیدایە. زۆلا دەڵێت:
"وەزعی میزاجی قارەمانەکان بخوێنینەوەو شی بکەینەوە نەك ئەخلاق و عاداتیان.... مرۆڤ لە ژێر فەرمانی ئەعساب و خوێنی خۆیدایە..."
نیتشە لەم بارەیەوە دەڵێت:
"یەکێك لە کەشف و دۆزینەوەکانی ئەم سەدەیە ئەمەیە کە مرۆڤ بریتی نییە لە ویژدان بەڵکو سیستەمێکی عەسەبییە بۆ خۆی".
بەمجۆرە وەزعی بەدەنی وەکو پرەنسیپێك حەساو کراوەو وەزعی روحی دەبێ بەسێبەرو سایەی بەدەن بژمێردرێ. واتە دەرکەوتە رووحییەکان ئەنجامی هەلومەرجە جەستەیی و بەدەنییەکانە.
کەواتە هەموو هەست و هزرەکانی مرۆڤ، ئەنجامی راستەوخۆی ئەو گۆڕانکارییانەن کە لە بونیادی جەستەییدا روو دەدەن و بارودۆخی جەستەییش بەپێی یاساکانی ویراسەت لە دایك و باوکەوە بۆ ئەو ماوەتەوە.
یانی ئەگەر کێماسییەك یان شێوانێکی بەدەنی لە باپیرێکدا هەبێ، ئەوا ئەم کێماسییە بەرەبەرە زیاد دەکات و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دی دەمێنێتەوەو دەبێتە باعیسی ئەوەی کە نەوەکانی دواتر ئالودە یان سۆزانی دەربچن یا ن کێماسی روحی دیکەیان لێ پەیدا ببێ.

## ناتورالیزم و ئەخلاق و کۆمەڵگە

زۆلا ئیدیعا دەکات کە بەرهەمی زانستی، واتا رۆمانی تازە، لە هەمان کاتدا بەرهەمێکی ئەخلاقییە. هەر چەندە زۆربەی رەخنەگران، لە بەرهەمەکانی زۆلادا ئارەزوویەکی توندی بێ پەردەیی و بێ ئەخلاقییان کەشف دەکردو دەخستە روو، بەڵام زۆلا هەر سوور بوو لەسەر ئەو ئیدیعایەی خۆی. بەڕای زۆلا، رۆماننووس بە تەواوەتی کاری زانا ئەنجام نادات. هەڵبەتە لە شیکردنەوەی وەزع و حاڵاندا، رەچاوی بێ لایەنی زانایەك دەکات، جا لەگەڵ ئەمەشدا وەکو چۆن (کلود برنار) گوتویەتی "ئەزمونگەر موفەتیشی تەبیعەتە" زۆلاش دەڵێت کە: "رۆماننووس موفەتیشی مرۆڤ و سۆزی مرۆڤە" و ئەگەر قەرارە قازی بێ لایەن بێ چۆن دەتوانێ دەرهەق بە مەسەلە ئەخلاقییەکان بێ لایەن نەبێ؟ جگە لەوە رۆماننووس دەبێ:
"میکانیزمی دیاردەکان لە مرۆڤدا بزانێ، بونیادو تەرزی کاری دەرکەوتە زینی و هەستییەکان بە هەمان شێوە ی کە فیزیولوجی لە ژێر کاریگەری ویراسەت و فاکتەری ژینگەدا بۆ ئێمەی شەرح دەکات، نیشان بدات، دواتر زیندوو لە ژینگەی کۆمەڵایەتییدا نیشان بدات.. و کاریگەری بەسەر دیاردەکانەوە هەبێ و کۆنترۆڵیان بکات، و بەمەش بە کردەوە کار بکاتە سەر ژینگەی کۆمەڵایەتی.
رۆماننووس بە کەشفکردنی یاساێن ژیانی کۆمەڵایەتی، ئیمکانی ئەوە بە سیاسەتوانان و خەمخۆرانی مەیدانی ریفۆرمێن کۆمەڵایەتی دەدات کە دەست بەکار بن و کۆمەڵگە چاك بکەن.

زۆلا زۆر بە توندی بەرپەرچی تۆمەتی ئەو (جەبریەتو قەدەرییەتە) دەداتەوە کە دەیدەنە پالْ فەلسەفەکەیو رایدەگەیەنیٚ کە: "ناتورالیزم لە ئەدەبیاتدا، نوێکارییەکی وردەو قەبوڵکردنو وێنەگرتنی شتێکە هەیە". زۆلا باوەڕی بە پێشکەوتی کۆمەلاٚیەتی هەیەو دەیەوێت ڕێگەکانی پێشکەوتن هەموار بکات. ئامانجێکی ئەخلاق ی توندو سەختگیرانەی هەیەو لەم رووەشەوە سەر بە یاساکەی (کلود برنار)ـە: "ئەخلاق ی ئەمڕۆ، عەودالْی تاقیبی هۆکارەکانە، دەیەویٚ هۆکارەکان شی بکاتەوەو لەبەر رۆشنایی شیکردنەوەکاندا دەست بەکار بیٚ."

## زمانی بەرهەمێن ناتورالیستی

ئەمیل زۆلا لە وتارێکدا بەناوی (ناتورالیزم لە شانۆدا) دەڵێت:

ئێستا دەگەینە سەر مەسەلەی (زمان) دەڵێن کە شێوازێکی تایبەتی بۆ شانۆ هەیە. دەخوازن کە ئەم شێوازە بە تەواوی لە زمانی ئاسایی دیالۆگو گفتوگۆ جیاواز بیٚ، ریتمدراو توندتر لەو، بە هەناسەیەکی یەجگار درێژ، قاژ قاژ وەکو ئەڵماس کە روناکی چلچرایانی بەسەردا بدرەوشێتەوە.

لە رۆژگاری ئێمەدا بۆ نموونە ڕێزدار (ئالکساندەر دۆمای کور) بە شانۆنامەنووسێکی گەورە دەژمێردریٚ. وشەکانی ئاهەنگدارن وەکو فیشەکە شێتە بە ئاسماندا دەچنو لە نێو چەپڵەرێزانی تەماشاڤاناندا رادەخوشێنو دێنە خواریٚ. هەموو کاراکتەرانی بەرهەمەکانی ئەو بە یەك زمان دەدوێن: زمانی پاریسی بە توێکلْ، تەژی پێچەوانەخوانی کە وەکو نێزە وشكو زبر بێتە هاویشتن. من هەقم بەسەر بریقو باقی ئەم زمانەوە نییە، بریقو باقی ئەم زمانە ئینکار ناکەم. بریقو باقێکی سەرڤە سەرڤە! لیٚ حەقیقەتبوونی ئەو زمانە ئینکار دەکەم. هیچ شتێك هێندەی ژارخەنی بەردەوامی رستە تاقەتبەر نییە. من چاوەڕوانی نەرمی زیاترو تەبیعی بوونم. خودان شێوازانی واقیعی ئەم سەردەمە رۆماننووسەکانن. دەبیٚ لە بەرهەمەکانی (گوستاف فلوبێر)و (برایانی گنگور)دا بۆ شێوازی بیٚ کەمو کوڕیو زندوو رەسەن بگەڕێین. کە پەخشانی ڕێزدار (دوما) لەگەلْ کاری ئەم پەخشان نووسە گەورانەدا بەراورد بکەین، دەبینین کە نە دروستەو نە رەنگو روویەکی ئەوتۆی هەیەو نە جۆشو خرۆش... ئەوەی دەمەویٚ لە شانۆدا بیدینم، پوختەیەکی زمانی گفتوگۆیە —ئەگەر نەتوانریٚ گفتوگۆیەك بە هەموو درێژدادڕی و دووبارە بوونەوەیەكو بێهودەییەکییەوە ببرێتە سەر شانۆ، ئەوا دەتوانریٚ حالەتو تۆنی گفتوگۆیەکە، تایبەتمەندی هەر قسەکەرێكو، بە کورتی واقیع لە رادەی زەرورەتدا بپارێزریٚ....

بەمجۆرە ناتورالیزم گفتوگۆ، یەکەم لە ڕێگەی رۆمانو دواتر لە ڕێگەی شانۆوە دێنێتە ناو ئەدەبیات. نووسەرانی ناتورالیست، هەوڵدەدەن لە گوێزانەوەی گفتوگۆی هەر کەسێکدا، ئەو رستەو دەستەواژانە بەکاربێنن کە ئەو کەسانە بەکاری دێنن، ئەمە یەکێکە لەلایەنە هەرە گرنگەکانی ریالیزمی ناتورالیستەکان کە پاش پێچانەوەی خودی قوتابخانەکەو نەمانی دامەزرێنەرانی قوتابخانەکەش، لە نێو نووسەرانی سەدەی بیستەمدا رۆژ بە رۆژ رەواجی زیاتر پەیدا دەکات. بەمجۆرە دەتوانریٚ زۆلاو پەیڕەوانی زۆلا بە پێشینانی هەموو ئەو نووسەرە گەورانە بژمێردریٚ کە ئەوڕۆ زمانی گفتوگۆ لە نووسینەکانی خۆیاندا بەکاردێنن.

## گروپی میدان

له مێژووچەی ناتورالیزمی فەرەنسادا، دامەزرانی دەستەی (میدان) بایەخێکی فرەی هەس.
ئەمیل زۆلا کە لەو رۆژگارەدا گیرۆدەی دەستکورتی و هەژارییەکی لە رادەبەدەر بوو، ئەنجام کتێبی (ئاسوموار)ی بلاوکردەوەو پارەیەکی بەدەست هێناو توانی موڵکێ بەناوی (میدان) بکڕێ. لەم سەردەمەدا زۆلا لەلایەکەوە کەوتبووە بەر هێرشێن توندو تیژو لەلایەکی ترەوە ژمارەیەك لە نووسەرانی لاو بەرەڤانیان لێدەکرد. ئەم ژمارەیە کە بۆ بەرەڤانی لە پێشەواکەی خۆیان لە دەوری گردبوو بوونەوەو کۆبوونەوەیان دەکرد بریتی بوون لە: (پل ئەلکسی ١٨٤٧– ١٩٠١) کە هاوشاری زۆلاو خەڵکی (ئەکس) بوو و تاقە کەسێك بوو کە تا کۆتایی پشتیوانی لە زۆلا کردو پابەندی رێبازەکەی ئەو بوو و، (گی دوموپاسان ١٨٥٠– ١٨٩٣) کە دۆستی فلوبیر بوو و فلوبیر لەگەڵ خۆیدا هێنایە لای زۆلاو بەوی ناساند، (هنری سیارد ١٨٥١– ١٩٢٤)، (هویسمان ١٨٤٨– ١٩٠٧)و لیون هنیك ١٨٥١– ١٩٣٥). ئەم نووسەرانە کۆبوونەوەکانی خۆیان لە ماڵی زۆلا لە پاریس‌و، لە بەهارو لە هاویندا لە (میدان) ئەنجام دەدا. ئەم ژمارەیە بۆ ئەوەی بە کۆمەکی یەکتری‌و بە پەیڕەوی لە رێبازی قوتابخانەکەیان بەرهەمێك بنووسن لێبران کتێبێك بلاوبکەنەوە. ئەم کتێبە کۆمەڵە چیرۆکێك بوو بەناوی (شەوانی میدان) کە هەر چیرۆکێکی لەلایەن یەکێك لە نووسەرانی نێو براوەوە نووسرابوو، لەم کتێبەدا بوو کە موپاسان چیرۆکە بەناوبانگەکەی خۆی (بول دوسویف)ی بلاوکردەوە، ئەم کتێبە لە ساڵی ١٨٨٠دا بە پێشەکییەکی توندو پڕ هەراو هەنگامەی زۆلاوە بلاوبووەو دوا بە دوای ئەو بوو کە زۆلا وتارو تێوری‌و بەرهەمە رەخنەییەکانی خۆی بلاوکردەوەو یاساو بنەماکانی بۆچوونەکانی خۆی ئاشکرا کرد.

## چەند بیروبۆچوونێك

(گوستاف فلوبیر) لە ساڵی ١٨٧٨دا لە چوار چێوەی چەند نامەیەکدا ئیرادی لە بۆچوونەکانی زۆلا گرتووەو نووسیویەتی:
سەیری پێ دێ کە بۆچی هاوڕێی نووسەری ناتوانێ ئەوە بدینێ کە لە (ئەزموونەکانی) ئەودا هیچ شتێکی جەبری نییە. بەڵکو هەرچییەك هەیە ئەوەیە کە ئەو بە کەیف ی خۆی تێهەڵکێشی کردووەو ئەوەی نووسیوە کە دڵی ویستویەتی وابێ.
(هنری سیارد) لە ساڵی ١٩١٨دا نامەیەکی بەم شێوەو ناوەڕۆکە بلاوکردووەتەوە:
"کاتێ کە من کتێبی پێشەکییەك لەمەڕ توبی (پزیشکگەری) ئەزموونگەری"ی (کلود برنار)م بۆ خوێندنەوە دا بە زۆلا، کە دەیگوت کاری نووسەر دەبێ وەکو کاری زانا بێ، ویستم ئەوەی پێ نیشانبدەم کە تەرزی کاری زانا تا چ ئەندازەیەك وردو گرانەو ئەگەری بە هەڵەچوونی تەرزی بیرکردنەوەی نووسەرا ن چەند زۆرە، دەمویست بەمە لە ئاکام و ئاقیبەتی ئەو جۆرە بڕیارە وریای بکەمەوە. بۆی بسەلمێنم کە تەنانەت لە کتێبەکانی خۆشیدا کاتێ کە قارەمانانی چیرۆك یەکیان خۆشدەوێ یان رقیان لێکدی دەبێتەوە، کە لێکدی نزیك دەبنەوە یان دوور دەکەونەوە بە

هیچ کلۆجیٚ پەیڕەوی یاساو ڕێساو بنەمای زانستی ناکەن، بەڵکو قەڵەمی نووسەر چۆنی بویٚ ئاوهایان دەجوڵێنیٚ"".

(رنه دومنیل)ی خاوەنی کتێبی (ریالیزم) دەربارەی ئەو نامەیە دەڵێت:

"ئەگەر ئەمیل زۆلا بە گوێی هنری سیار-ی بکردایە کتێبی (ڕۆمانی ئەزموونگەری) نەدەنووسی و بەم شێوەیە بەرهەمەکەی خۆی لەوە رزگار دەکرد کە ببیٚ بە ئەوزارو ئالەتی تێوریانی زانستی غەڵەتو، خوێندنەوەی پاش دەیان ساڵ خوێنەران ناڕەحەت بکات. ئەم تێورییە ئاسایی و سەرەتاییانە کە خۆی لە خۆیداو بەدەر لەم باسانەیە، بایەخ و ئیحتوبارێکی هەس، سێبەرێك دەخاتە سەر بەرهەمەکەی زۆلا".

ئەم بابەتانەی خوارەوە لە یاداشتەکانی (برایانی گنگور) لە ۱۸۷۷/۲/۱۹دا دەبینریٚ:

"فلوبیر دەستی داوەتە هێرشێکی توندو هەر هەموو تیوری و کارەکانی زۆلای کوتیوەو، زۆلاش بەم ناوەڕۆکە وەڵامی دەداتەوە: " ئێوەگەل، سووکە سەروەتو سامانێکتان هەیەو لە زۆر گیروگرفتان رزگارتان دەکات، بەڵام من ناچاربووم هەر جۆرە کتێبێك بنووسم! بەڵیٚ، نووسینی ناچیزە! خودایە من، منیش وەکو ئێوە گاڵتەم بە وشەی (ناتورالیزم) دیٚ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر دووبارەی دەکەمەوە، چونکە دەبیٚ ناوی تازە لە هەر شتێك بنەی تا خەڵکی بە تازەو نوێی تەسەور بکەن... من هەوەڵجار بزمارێکم هەڵگرتو لە مێشکی خەڵکیم کوتی، پاشان چەکوشێکم بەدەستەوە گرتو بە ئەندازەی یەك سەنتیمەتر لە سەری خەڵکیم داکوتی، پاشان بە ئەندازەی دوو سەنتیمەتری دی دام کوتی.. چەکوشەکەی من هەمان هەراو زەنای ناو رۆژنامەکان و ئەو دەنگۆیانەیە کە دەربارەی بەرهەمەکانم دەینەمەوە..."

(دانیل مورنە)ی نووسەری "مێژووی ئەدەبیاتی فەرەنسا" دەربارەی ناتورالیزم دەڵێت:

"هەڵبەتە رێبازێکی ئەدەبی پشت بەستوو بە بنەماێن زانستی گومان لێکراوی منالانە، تەنیا رۆمانی منالانەو پێکەنین ئامێزی لێدەکەێتەوە. لیٚ زۆلا بلیمەتییەکی شیعری و خەیاڵێکی بەهێزی ئەوتۆی هەبوو کە زۆر لە سەرووی ئەم تیورییە بێهودانەوە گیرسابووەوە... زۆلا توانایەکی بالای دیتنی هەیە، ئەگەر نەی توانی بیٚ تایبەتمەندییە ئەخلاقی و روحییەکانی قارەمانەکانی بەرجەستە بکات، ئەوا ژینگەی بێرونیانی زۆر چاك داوەتە بەر زەین و شیکردۆتەوە. بۆ وێنە لە ئاسومواردا جلشۆرخانەکەو لە فەسڵی (مانگرتنی) کتێبی ژەرمینالدا جۆش و خرۆش و رابوونی کرێکارانی مەعدەنچی بە توانایەکی سەیرەوە بەرجەستە کردووە... لیٚ لەلای هەموو نووسەرانی ناتورالیستدا، چ بەرهەمێك بە شێوازی زۆلا نابینریٚ و زۆربەیان دووبارە هاتوونەتەوە سەر ریالیزم. ئەمانە تەنیا هەوڵی ئەوەیان داوە کە لە نێو داب و نەریتی باوی ناو خەڵکیدا، ئەو بابەتانە وێنە بگرن و شەرح بکەن کە لە هەوەسبازی و ئارەزووی سیکسییەوە نزیکە، واتە بە زۆری لایەنی فەسادێن ئاساییان خستوەتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە".

جگە لەوە، خودی زۆلا نووسەرێکی خەباتگێڕ بوو، ملی بۆ نا ئومێدی نەدەداو تەسلیمی ئەو جەبرە نەدەبوو کە بەو هەموو جۆش و خرۆشەوە لە کتێبەکانی خۆیدا پشتی پیٚ دەبەست،

گـەورەترین بەڵگـەش بـۆ ئـەم بابەتـە رووداوی "دریفـوس" بـوو کـە زۆلا لـە پێنـاوی رزگـاری تۆمەتبارێکی بێگوناحدا لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتدارانی گەندەڵ‌و سـەرمایەدارانی زۆرداری عەسـری خۆیدا، وەستاو هاواری (مەحکومتان دەکەم)ی ئەو دنیایەکی هێنایە لەرزە.

ئەو خاڵـەی کـە دەبـێ لێرەدا ئاماژەی بـۆ بکـرێ ئەمەیـە کـە هەڵـەی زۆلاو پشـت بەسـتنی زۆلا بـە "زانستێن ئەزموونگەری" لە راستیدا هەڵـەی سـەدەکەی ئـەو بـوو. سـەدەی نۆزدەیـەم لـەم رووەوە سـەدەیەکی سـەیر بـوو. ئـامێری بوخـارو گڵـۆپی گـاز بـەدوا کەشـف‌و دۆزینـەوەی بەشـەر دەژمێـردران‌و هـەموو گـەورە زانایـانی عەسـر گـەیی بوونـە ئـەم ئەنجامگیرییـەی کـە هـیچ رازێکـی شاراوە لە جیهان‌و لە ئینساندا نییە. لە روانگەی ئەوانەوە هەموو شتێك ماددی‌و مەلموس بـوو و کـاری (کلـود برنـار) گـەیی بـووە ئـەوەی کـە دڵنیـا بـوو بـە زووتـرین کـات کەرەسـتەو پێکهاتـەکانی هـزرو خـەیاڵ لـە نێـو مێشـکی مرۆڤـەوە دەردێـنێ‌و بـە بەرچـاوی هەمووانـەوە شـی دەکاتـەوەو فورمول‌و یاساکانی دەنووسێت.

لە فەسڵی یەکەمی کتێبی (بەرەبەیانی جادووگەران)دا کە نووسەران لویس پاولزو جاك بورژیە لە سـاڵی ١٩٦٠دا بڵاویـان کردۆتـەوە شـتی سـەیر دەربـارەی ئـەم (هەڵـەی سـەدە)یـە دەبینـرێ، جێـی خۆیەتی چەند برگەیەکی ئەو فەسڵە لێرەدا بە نموونە بێنینەوە:

"ئەفسـوس کـە مێـژوو نـاوی ئـەوی تۆمـار نـەکردووە. ئـەو بەڕێوەبـەری (نووسـینگەی تۆمـاری داهێنانەکان)ی ئەمریکا بوو. هەر ئەویش بوو کە یەکەمجار ئەم هەراو هوریایەی نایەوە. لە ساڵی ١٨٧٥دا ئیسـتیقالەنامەکەی خـۆی بـۆ وەزیـری بازرگـانی نـاردو بیانووشـی ئـەوە بـوو کـە ئیـدی چ شتێك بۆ داهێنان نەماوە. ئیدی ئەوە بوو دوازدە ساڵ دواتر (مارسیلین بیرتلو)ی گەورە کیمیـازان نووسـی کـە: "جیهـان لەمـەودوا چ نهێنییـەکی نییـە...." هـەموو دەرگاکـان لـە رووی هـەر جـۆرە تەسـەورێك دەربـارەی کەشـف‌و کەشـفکاری تـازە لـە بـواری زانسـتەکاندا دادەخـرا... (برونتیر) لـە ساڵی ١٨٩٥دا بە دڵنیاییەوە باسی (ئیفلاسی زانست)ی کرد. پرۆفیسـۆر (لیپمـان)ی نـاودار هـەر لەو سەرو بەندەدا بە یـەکێك لـە قوتابییـەکانی خـۆی راگەیانـد کـە زانسـتی فیزیـا تـەواو بـووەو، وا چاکە بچێ سۆراغی زانستێکی دیکە بکات. ئەو قوتابییە کە (هلبرونر)ی ناو بـوو پاشـان بـوو بـە یەکـەمین مامۆسـتای (کیمیـا- فیزیـا)ی ئـەورووپاو گـەلێك کەشـفیاتی بەرچـاوی دەربـارەی (هـەوای شل)، تیشکی سەرووی وەنەوەشەیی‌و (نەرمە ئاسنجاو) ئەنجامدا....

لـەو جـۆرە سـەدەیەداو لـە نێـو ئـەو زانایانـەدا بـوو کـە زۆلا بـە دڵنیاییـەوە بناغـەی (رۆمـانی ئەزموونگەری" دامەزراندو پاشان کە لە کەسێکی پسپۆری ژنەفت کە یاسـاکانی (ویراسـەت) ئـەو یاسایانەی پایەی زانستی بەرهەمـە بەناو بانگەکـەی ئـەو (روگـون- ماکـار) بـوون بـە هـیچ کلـۆجێ جێگیر نین‌و هەموو کاتێ ئەگەری ئەوە هەیە کە لە ئـەنجامی کەشـفکاری تـازەوە بگـۆڕێن، یـەجگار سەرسـام بـوو. هـەروەها بـە هـەمان ئەنـدازە سەرسـام بـوو کـە کـاتێ پێیـان گـوت کـە زانسـت لـە قەڵەمڕەوی (مرۆڤناسی)دا یەجگار کەم پێشکەوتووە و رۆماننووس بـە هـیچ کلـۆجێ نـاتوانێ لاف ئەوە لێ بدات کە یاساکانی ئەم بابەتەی دۆزیوەتەوە!....

## ئایا دەكرێ ریالیزمو ناتورالیزم تێكەڵ بكرێن؟

ناتورالیستەكان بەو بیانووە هاتنە مەیدان كە گوایە دەخوازن ریالیزم كاملّتر بكەنو لایەنە رۆمانتكییەكانی لێ بژار بكەن. جا لەم رووەوە تیۆرییە نا ئاساییەكانی خۆیشیان دایە پاڵ ریالیزم. بۆیە هێشتاش زۆربەی نووسەرانی مێژووی ئەدەبیات، ناتورالیزم بە فۆرمێكی خەملّیوترو وردتری ریالیزم دەژمێرنو كە باسی ئەو دوو قوتابخانەیە دەكەن لە سایەی تایتلی ریالیزمدا باسیان دەكەن، بەلاّم بە گوێرەی ئەو پێناسەیەی كەلە فەسلی رابردوودا سەبارەت بە ریالیزم كردمان، ناتوانین نووسەرێك كە توانای بەسەر هەڵسەنگاندنی رووداوی چیرۆكەكەی خۆیو ئەنجامی چیرۆكەكەی خۆیدا نەشكێو لە ئەنجامی باوەڕبوونی بە زنجیرە بنەمایەكی زانستی گومان ئامێزو منالاّنە، نەتوانێ هۆكاری دروستی رووداوەكان دیاری بكات، ناو بنەین ریالیست.

ئەمە جگە لەوەی كە نووسەرانی ریالیست نموونەی جیاوازی خەڵكیان لە كۆمەڵگەی خۆوە وەردەگرتو لە بەرهەمەكانیاندا نوێنەری دیاری ئەو خەڵكەیان بە تواناو بەهرەیەكی هونەری پەسندەوە بەرجەستە دەكرد. بۆ نموونە لە ناو نموونەكانی (كۆمیدی مرۆڤانی) بالزاكدا قارەمانانی زیندوو بەرجەستەی وەكو "كوزین بتو گرندەو وترن" هەن. لێ زۆلاو پەیڕەوەكانی (نموونەسازی)یان بە كارێكی رۆمانتیك دەژمارد. بۆیە قارەمانانی ئەوان لایەنی گشتایەتیان نییە، بەڵكو هەریەكەیان تاكێكنو بە گوێرەی كاریگەری بۆماوەییو بونیادی بەدەنی، ناچارن هەندێ كاران ئەنجامبدەن. جا بۆیە دەبێ ئەوە بگوترێ كە نووسەری ناتورالیست ناتوانێ دەست بخاتە رەوتی رووداوی چیرۆكەكەی خۆی، بەڵكو رووداوی چیرۆكەكە كە زادەی كۆمەڵە فاكتەرو هۆكارێكی جەبرییە، بەدەر لە ویستی نووسەرەكە بەرەو ئەنجامێك دەڕوات كە دەبێ بیگاتێ.

## لە جیهانی شانۆدا

ناتورالیستەكان زۆریان هەوڵدا لە جیهانی شانۆدا سەركەوتن وەدەست بێنن، وێڕای ئەوەی كە لەم وارەدا سەركەوتنی گەورەیان بەدەست نەهێنا بەلاّم هەر چۆنێ بوو شوێن پێیەكیان لە دوا بەجێما. رۆماننووسانی ناتورالیست هەستیان دەكرد كە پێویستە لەواری شانۆشدا وەكو واری رۆمان سەركەوتنو پیرۆزی وەدەست بێنن. دیارە كەسیان لە خۆیان بە شایستەتر بۆ ئەم مەیدانە نەدەزانی. بۆیە بیرۆكەی نووسینی شانۆنامە چووە مێشكیانەوەو گنكورو زۆلاو ئالفونس دودەو موپاسانو ژول رنار بەریز تواناو بەهرەی خۆیان لەو وارەدا تاقی كردەوە. بەلاّم كەسیان نەیانتوانی تەنانەت ئەو نیمچە سەركەوتنەش بەدەست بێنن كە لەواری رۆماننووسیدا بەدەستیان هێنابوو نیشانەی هەرە دیاری شانۆ نامەێن ناتورالیستی ئەمە بوو كە لە رادەبەدەر بایەخ بەدیكۆرو جلو بەرگ دەدراو نووسەران دەیانویست ئەو وردە شتانەی لە رۆمانەكانی خۆیاندا دەربارەی هەر شتێك شەرحو شرۆڤەیان دەكرد، لە شانۆنامەدا لە رێگەی دیكۆرو جلو بەرگەوە نیشانی بدەن.

لـێ ئاشـكرایه كـه ئـەو شـتانه (دیكـۆرو جـل‌و بـەرگ) نـەیان دەتـوانی جێگـەی ئـەو وردەكاریانـه بگرنەوه كه له رۆمانی ناتوراليستیدا ئەنجام دەدران.

گومـان لـەوەدا نییـه ئەگـەر هنـری بـك شـانۆنامەی "قـەلآنی نەنووسـیبایه، ئەمرۆكـه لـه هـیچ مێژوویـەكی ئەدەبیاتـدا نـاوی شانۆی ناتوراليسـتی نـەدەبرا. (قەلان) حیكایـەت‌و سـەربوری ژنـی كابرایەكی كارخانـەداری دەوڵەمەنده كه لەگەڵ سێ كیژەكەیدا كەوتۆتـه نـاو كۆمـەڵێك دەسـتبڕو فیڵباز، له ئەنجامدا یەكێك له كیژەكانی ناچار دەبێ شوو به یەكێك لەو پیاوه خوێڕیانه بكات.

هەڵبەته (هنری بك) له پەیڕەوانی (زۆلا)و له لایـەنگرانی قوتابخانـه زانسـتی‌و ئەزموونگەرییەكەی ئـەو نـەبوو بـەڵكو نـاتوراليزمێكی تایبـەت بـه خـۆی هـەبوو و بـەردەوام لـه هـەوڵی ئـەوەدا بـوو كـه بەرەڤانی له ڕێبازەكەی خۆی بكات‌و دەیگوت: "من ئەوەنده حەزم لەوه نییه خۆم به پیـاوكوژان‌و كوژراوان‌و بادەنووشان‌و قوربانیـانی ئیرسیەت‌و قوربانیـانی وەچـەوه خـەریك بكـەم‌و بچمه بنج‌و بنــاوانی ئــەو مەســەلەو بابەتانــه". دەربــارەی ئــەو تیۆرییانــەی كــه زۆلاو دۆســتەكانی بــۆ ناتوراليزمیـان دانـاوه، پێـی وابـوو كـه حەقیقـەت پێویسـتی بـه تیۆرییـان نییـه، بریتییـه لـه شتێك كەمرۆڤ دەیبینێ‌و هەستی پێدەكات‌و خۆڕسك‌و ئاسایی نیشـانی دەدات‌و پێویسـتی بـه یاسـاو ڕێساو فورمۆلان نییه.

به شێوەیەكی گشتی ئەگەرچی خەباتی پڕ جۆش و خرۆشی ناتوراليستەكان لـه دنیـای شـانۆدا سەرەكەوتنێكی زۆری بەدەست نەهێناو بەرهەمی بەرجەستەو شـاكاری لـه پـاش بەجێنـەما، بـەڵام نابێ ئەوه له یاد بكرێ كه ئازادییەكی كاری فراوانی بۆ شانۆنامەنووسانی ئاینـده فەراهـەم كـردو هـەر كۆششـی بـێ وچـانی ئـەو نووسـەرانه بـوو كـه كردییـه كارێـك ئەوڕۆكـه شـانۆنامەكانی جـان ئانویەو مارسیل ئەیمێ‌و جان پۆل سارتەر و ئالبیر كامۆ سـەركەوتووانه لەسـەر شـانۆگەورەكاندا نیشان دەدرێن‌و وازی دەكرێن.

## ڕێبازی نووسەره ناتوراليستەكانی دیكه

تەنانەت ئەو نووسەرانەش كه لەگەڵ خودی زۆلادا هاوكارییان هەبوو و پـەیڕەوی ئـەویان دەكـرد، پابەنـدی بنـەما فەلسـەفی‌و زانسـتییەكانی ئـەو نـەبوون، و تـەنیا پـەیڕەوی ڕێبـازه ئەدەبییەكـەیان دەكـردو ئیـدی تاقـەتی ئـەوەیان نـەبوو تـاقیبی شـەجەرەی میراتـی كاراكتـەران بكـەن‌و ژیـانی بـۆ مـاوەیی خـەڵكانی ئـالودەو كەچـڕەو بخەنـه بـەر وردەبـینی لێكۆڵینـەوەو موتـاڵاوه. نەیانویسـتوه رۆمانەكانی خۆیـان لـه شێوەی نامەیـەكی زانسـتی زانایانـەدا دەربـڕن و بـه ئـەزموونێكی زانسـتی فیزیولۆجی كۆمەڵایەتی بزانن. بەڵكو لـه هـەمان ڕێبـازی ئەدەبیـدا، كـه خـودی زۆلا لـه نووسـەرانی ریالیسـتی وەكو فلوبێرو گنكوری وەرگرتبوو، زیـدەڕەویان دەكـرد. ئـەم نووسـەرانه دەیـانگوت لـه رۆماندا هەر جۆره گریمانەو تەسەورێك بگری درۆی رووته، بۆیه جگه لەو شتانەی كه بـه كـەماڵی دیقەت دەبینرێن، نابێ هیچ شتێكی دی بخرێته ناو رۆمانـەوه، تەنانـەت هەنـدێ ڕووداوی سـەیرو دەگمەنیش كه له ژیانی واقیعیدا روو دەدا، نابێ ناوكێشی كتێبەكـەتی بكـەی، چـونكه ئـەو جـۆره ڕووداوانـه زیـاتر لـه درۆ دەچـن. نیـوەڕۆكی رۆمـان دەبـێ بریتـی بـێ لـه ڕووداوه رۆژانـه ئاسـایی‌و

باوەکانی ناو ژیان، دەبێ لەو شتانە بێ کە نە سەرەتایان هەس و نە کۆتایی، ئەو ڕووداوانەی کەهەمیشەو لە هەموو شوێنێکدا هەن و ڕوو دەدەن و بەسەر هەموو کەسێکدا دێن. ئەمەشیان بە هەند وەرگرتووە کە ژیانی ڕۆژانەی هەموو کەس لە مەیل و ئارەزووی ناچیز یان نزم و یان دزێو پێکهاتووە، جوانی و سوخەتێن باش، یان خەیاڵ و وێنای ڕووتە یا ئەگەر هەقیقەتیش بێ ئەوا حەقیقەتێکی ڕیزپەڕو نا دروستەو ناشێت ببێ بە بابەتی ڕۆمان. ڕۆمان دەبێ درۆو دەلەسەو نزمی و دوو ڕوویی و ڕیاکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کە لە سەر بناغەی عەیب و عارو خۆپەرستی ڕۆنراوە، نیشان بدات. بایەخ و جوانی ڕۆمان لەمەدایە کە زیاتر پابەندی دزێوی و بێهودەیی و بێ بەهایی دنیا بێ. بۆیە پەیڕەوان و موریدانی زۆلا کە بنەماکانی قوتابخانە زانستی و ئەزموونگەرییەکەی ئەویان پشت گوێ خستبوو، لە حەقیقەتدا کۆمەڵە نووسەرێکی ریالیستی توندڕەو بوون و تەنیا سازی دزێوی و خراپییەکانیان لێدەدا.
بەمجۆرە جگە لە ژمارەیەکی زۆری نووسەران کە کەوتبوونە دژایەتی ناتورالیزم و هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی نووسینی بەرهەمی هەمە جۆری ئەخلاقی و ئایدیالیستی و زانستییەوە پەلاماری ناتورالیستەکان بدەن و بونیادی ئەم قوتابخانەیە هەڵوەشێننەوە، خودی نووسەرە ناتورالیستەکانیش لە بنەماکانی قوتابخانەکەی خۆیان هەڵگەڕانەوەو تا ڕادەیەك بۆ ریالیزمی (فلوبیر) و (گنکور) گەڕانەوە.
جا لەم بەینەدا "بەیاننامەیەکی پێنج قۆڵی" بڵاوبووەوەو لەو بەیاننامەیەدا پێنج نووسەری لاو زۆر بە توندی هێرشیان کردە سەر زۆلاو دەیانگوت پێشەوای ناتورالیزم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لەبەرنامەکەی خۆی هێوەتر دەڕوات و ناتورالیزمی کردووە بە لانەو ئاشیانەی مەسەلەێن توڕەهات و، هاواریان دەکرد کە دەبێ تا زووە نەسڵی تازە ڕزگار بکرێ.
بەڵام ئەم بەیاننامەیە کە هێرشی ڕاستەوخۆ بوو بۆ سەر زۆلا هیچی بەهیچ نەکرد، تەنانەت ناحەزانی زۆلاش پێی قایل نەبوون.

## کاریگەری ناتورالیزم

زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە پابەندی قوتابخانەی ناتورالیزم بوون هەر زوو لە بنەماکانی هەڵگەڕانەوە. لەبری ڕاڤەو شرۆڤەی (حەقیقەتی بچووك و ڕۆژانەی ژیان) هەر کەسەو بە شێوەی خۆی و هونەرمەندانە، ڕیاکارییەکانی کۆمەڵگەو ساختەکاری و فریوکاری چینی فەرمانڕەوای سووك و ڕیسواکردو بە هەزاران نموونەی جۆراوجۆری لە بابەتی چیرۆکەکەی موپاسان (بول دو سویف)یان لە بەرهەمەکانی خۆدا بەرجەستە کردو خەڵکانی (خواناس و پارێزکار)ی وایان نیشاندا کە لە کاتی پێویستیدا ڕوو لە ژنێکی سۆزانی دەکەن و هەر کە پێویستی خۆیان ڕایی کرد، ئیدی بەر جنێوانی دەدەن.
لایەنگری یەك لایەنە، ئەم (ئەدەبیاتە بێلایەنە)ی بە خێرایی لەبەر چاوی خەڵکی خست و پاش ئەوە تەقریبەن چ شتێك لە ناتورالیزم نەمایەوە جگە لە مەیلە ڕیالیستییەکانی. بەم حاڵەشەوە ناتورالیزم بە هەموو کاڵی و کرچییەکی خۆیەوە ڕەوتی ڕۆماننووسی لە سەدەی بیستەمدا گۆڕی.

یەکەم ئەوەبوو کە رۆمان بە پشتیوانی قەواڵەو بەڵگە نامانو کەرەستەی واقیعی بنووسرێت، چیتر رۆماننووس نەخزێتە ناو جیهانی ناخو دەروونو لە گۆشەی تەنیاییدا نەژی، و ئەگەر جارجارێکیش پەنا وەبەر خەڵوەتخانەی دڵ بەرێ ئەوا ناچارە تەرکی گۆشەگیری بکات تا بچێتە تەمەشای ژیانی رۆژانەو لەو دیوی دیاردەو رواڵەتی کاروبارەکانەوە تاقیبی ئەو غەریزەو هەوەسو کەڵکەڵانە بکات کە جڵەوی راستەقینەی ژیانی هەر تاکێکیان بەدەستە، لە روانگەی ئەم جۆرە رۆماننووسەوە، ژیانی راستەقینە، ژیانی ئەو کۆمەڵە تەمەڵە ئەروستوکرات رەچەڵەکانە نییە، چونکە ئەم ژیانە جگە لە درۆو ریاکاری چ شتێکی تری تیدا نییە، بەڵکو ژیانی زۆرینەی خەڵك، ژیانی خەڵکانی بێ شومارو دڵساف بابەتی ئەوەو شایستەی لێ وردبوونەوەیە، و هونەر بریتییە لە وێنەگرتنی ژیانی ئەو رەشوو رووتە ساکارو عەوامەی خەڵك.
خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە رۆماننووس دەبێ لە قەراردادو پەیمانو رێسا دەستکردو کۆنەکان سڵ بکاتەوە: واتە رووداوی چیرۆك لەبری ئەوەی بەسەر هاتی سەیرو سەمەرەی منالانەی وەکو بۆکەڵەبازی نیشان بدات یان بەدەم خەیاڵ پڵاوەوە سەرکەوتنی ئەخلاقی زانستان وەسف بکاتو بەردەوام بە وەهمی چاکیو چاکەکاری خوێنەر فریو بدات، دەبێ رەوتی ئاڵۆزو پڕ گرێو گۆڵی بێ سەرەتاو بێ کۆتایی ژیان نیشان بدات.
ئەم ناتورالیزمە بەڵگەنامەییو کۆمەڵایەتیو رەشبینو تەوسئامێزو رەخنەییە دەسەڵاتی خۆی گەیاندووەتە زەمانی ئێمەش.

## ناتورالیزم لە وڵاتەکانی دیکەدا

دەسەڵاتو کاریگەری ناتورالیستانی فەرەنسەیی زۆر کەم لە ئینگلیستاندا رەنگی داوەتەوە، چونکە تەسەوری بێ پەردەیی دیمەنانی چیرۆك بەو جۆرەی کە لە بەرهەمی ناتورالیستەکاندا دەبینرێ لەگەڵ تەبیعەتو گیانی ئینگلیزیدا نەگونجاوە. وەشانکاری یەکەمین وەرگێڕانی بەرهەمەکانی (زۆلا) خرایە زندانەوە. لە نێوان نووسەرانی ئەم قۆناغەدا دەتوانین تەنیا یەك کەس بپەڕێنین، ئەویش (جورج مور ١٨٥٢- ١٩٣٣)یە کە نووسەرێکی ریالیستی تەوق شکێن بوو و گەنجی خۆی لە پاریسو لە نێو نووسەرانو هونەرمەندانی پێشڕەودا بەسەر بردبوو، یەکێك لە بەرهەمەکانی (مور) کە ناوی (Extherwatem) بوو بەرهەمێکی ناتورالیستییە.
ناتورالیزم لە ئەدەبیاتی هوڵەندیدا زۆر بە گەرمی رەواجی سەند، زەوقی میللی ئامادەی قەبوڵکردنی شیکردنەوەی واقیعەکان بوو و کاردانەوەیەکی توند دژی رۆمانی محافەزەکارو تەقلیدی هاتبووە ئاراوە. (ڤان لانپ) کە کتێبی (Keaasge zevenster- ١٨٦٥) بڵاوکردوەوە، هێندە توندڕەوانە بەلای ریالیزمدا دایکێشابوو کە هەراو زەنایەکی زۆری نایەوە. بەڵام دامەزرێنەری راستەقینەی ناتورالیزمی هۆڵەندا (ئیمانیس ١٨٤٨- ١٩٢٣) بوو کە پەیڕەوی (تن)ی دەکردو دەیویست هونەریش وەکو زانست ئازادو بێ پەروا بێ. ئەم نووسەرە خودان زەوقێکی شیکاری دروست بوو و شێوازێکی سادەو روونو رەوانی هەبوو لە رۆمانەکانیدا تا رادەیەکی زۆر قەرزار باری (سێ نۆڤل)ی تۆڕگینیفەو بەناوبانگترین رۆمانی (مادامۆزیل لینا

١٨٨٨)يـه كـه كەوتـه بـه هێـرش‌و پـەلامارێکی زۆر. نووسـەرێکی دیکـەی ئـەم قوناغـه (ئـالترینو ١٨٥٨- ١٩١٤) یە، ئەم نووسەرە پزیشك بوو، لاسایی فلوبیر و زۆلاو بەتایبەتی برایانی گنکوری دەکردەوە. چونکه بۆ خـۆی هـەر لـه بیری نیگـەرانی و مەرگدا بـوو، ژیـانی کەسـانی نـەخۆش‌و ئەسـیرو دیلـی غـەریزەو مەیلـەکانی خۆیـانی، دەخسـتـه بـەر وردەبـینی شـیکردنەوەوە، جـا ئـەم نووسـەرە شـێوازێکی ریتمـدارو بـێ کـەم‌و کـوڕی هـەبوو. زۆر چـیرۆکی وەکـو (مارتـا)ی هەیـە.دەسـەڵات‌و کاریگـەری (تـن)و (زۆلا) توانـای وێنـەگرتنی بـێ پـەردەو رەشـی واقیـع‌و رووداوەکانی بەم میللەتە بەخشی بوو. جا لـەم بارەیـەوە ئـەم قۆناغـەی ئـەدەبیاتی هۆڵەندی بـه قۆناغێکی گرنگ دەژمێردرێ‌و رۆمانی هۆڵەندی چڕترو دەوڵەمەندترو واقیعی تر کردووە.

## لە ئەڵمانیا

لـەو قوناغـەدا کـه رۆمـان شـێوەیەکی سـواوو بـازاڕی وەرگـرت، تێـوری‌و رێبازەکـانی زۆلا زۆر بـه گـەرمی پێشـوازی لێکـرا، نـاتورالیزم کـه راپـەڕینێکی تـازە بـوو بـه تایبـەتی لـه بەرلینـدا دەنگـی دایـەوەو بە گـەرم‌و گـوڕی پێشـوازی لێکـرا، یەکـەم نووسـەرێك کـە رووی کـردە ئـەم قوتابخانەیـە (کرتـزر) بـوو کـه بـه (زۆلای ئـەڵمان) ناسـرا. لـێ لـه بەرهەمـەکانی خۆیـدا زیـاتر لـه ژێـر کاریگـەری (دیکنـز)دا بـوو و شـێوازێکی زۆر ئـەدەبی‌و ئەدیبانـەی هـەبوو. تێوریسـیی نـاتورالیزمی ئـەڵمانی نووسـەرێکه بـەناوی (هـۆڵتز ١٨٦٣- ١٩٢٩) کـه لایـەنگری (وێنـەگرتنی واقیعەکانـه) (ریـالیزمی فۆتۆگرافیك) هۆڵتز لەساڵی ١٨٨٩دا بە یارمەتی نووسەرێکی دیکه بەناوی (شلاف) سێ چیرۆکی بـەناوی (پاپـا هاملێـت) بـه هـەمان شـێوازی (ریـالیزمی فۆتـۆگرافی) بڵاوکـردەوە . بـه شـێوەیەکی گشـتی نـاتورالیزم لـه ئـەڵمانیادا هاوتـاو هاوکـات بـوو لەگـەڵ هـەراو زەنـاو دامەزرانـدنی ئەنجوومـەنانی ئـەدەبی و بڵاوکردنـەوەی بـەیاننامان‌و دامەزرانـدنی شـانۆیاندا. لـە نێـو شانۆنامەنووسانی ئەم قۆناغەی ئەڵماندا دەبێ ناوی هوپتمان ١٨٦٢- ١٩٤٦) ببرێ کە بەرهـەمی هەمە جۆری هەیەو هەموو قوتابخانە جیاوازەکانی تاقیکردۆتەوە، بەڵام زیاتر بە هۆی شانۆنامەی ناتورالیستی (بەر لە سپێدە ١٨٨٩) شـۆرەتی پەیداکردووە کە باسی کارەساتێك دەکات بەهۆی کاریگـەریی ویراسـی مەیخۆرییـەوە روویـداوە. ئـەم شـانۆنامەیە کـە هـەم کاریگـەری زۆلاو هـەم کاریگەری ئیبسنی پێوە دیارە گەلـەك مشت‌و مڕو هـەراو زەنـای نایـەوە. (هوپتمـان) لـە رێگـەی شـانۆنامەێن (جـەژنی ئاشـتی)، (پیـاوی تـەنیا)و (جۆلایـان)وە بەدەسـت هێنـا. ئـەم شـانۆنامەیە بوێرییەکی زۆری تێدایەو بێ پەروا باسی کارەساتی کۆیلەیـەتی‌و رۆژ رەشـی کرێکـارانی سـیلزی دەکات.

## لە ئیتاڵیادا

لە ئیتاڵیاشدا، لەم قۆناغەدا، رۆمانێن ریالستی روو لە کەسادو بێ برەوی‌و بـێ بازاڕی بـوو، بۆیـە لاوانی سەرکێش‌و خوێنگەرم کەوتنە بیری ئـەوەی روو لـە نـاتورالیزمی فەرەنسا بکـەن‌و ئیلـهامی لێوەربگرن. ئەوانـەی کـە دوور بـوون لـە دیـدو بۆچـوونی (ئوبـچەکتیف) سـوودیان لـە ئـازادی تـازە

وەرگرت بۆ بەرەنگاربوونەوەی (ئایدیالیزمی ساردو ئەخلاقی تەقلیدی) کەبەسەر ئەدەبیاتیاندا زاڵ بوو. بەڵام هیچ یەکێك لەوانە نەبوون بە نووسەری دەرەجە یەك. ئەم قۆناغی (ڤیریزم verismeه لە ئەدەبیاتی ئیتاڵیادا هیچ سەرکەوتنێکی بەخۆوە نەبینی. چونکە زەوقی ئیتاڵیایی بە هیچ کلۆجێ ئەدەبیاتی نا شەخسی– objective) قەبووڵ نەبوو و لە یەکەم دەرفەتدا لایەنی لیریکی یان گەپجاڕی بۆ زیاد دەکرد.

# هونەر بۆ هونەر

# و

# قوتابخانەی پارناسی

ساڵی ١٨٣٠ ساڵی کۆمەڵە کودەتاو گۆڕانکارییەك بوو کە کۆتایی بە قۆناغی (رستوراسیون)* لە فەرەنسادا هێناو بوو بە سەرەتاو دەستپێکی گۆڕانکاری لە بارودۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتی فەرەنسادا، لە قۆناغی (رستوراسیون)دا رۆمانتیزم بەسەر ئەدەبیاتی فەرەنسادا فەرمانڕەوا بوو. مێژوونووسان ساڵی ١٨٣٠ بە ساڵی هەڕەتی کەماڵو لوتکەی توانای رۆمانتیزم دەزانن، چونکە لەم ساڵەدا بوو کە (ئیرنانی) هاتە سەر شانۆو (لامارتین) بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا بەڵام وەکو لە فەسڵی رۆمانتیزمدا گوتمان، ئەم ساڵە لە هەمان کاتدا بە ساڵی سەرەتای ئاوابوونی رۆمانتیزم-ش دێتە ژماردن. گەلێك لە شاعیرانی رۆمانتیك دەیانبینی ئەو قوتابخانەیەی کە بەگەڵی کەوتبوونو تا ئەم قۆناغە بە بەرزی هێنابوویان بەرەبەرە دەپۆکێتەوەو لەبەرچاو دەکەوێ. حەقیقەتی مەسەلەکەش ئەمە بوو کە جەماوەری خەڵك پاش گۆڕانی بارودۆخی سیاسیو کۆمەڵایەتی دەیانویست بە تەواوەتی لە رابردوو دابڕێن و پەیوەندییان پێوەی نەمێنێ. لەبەر ئەمە رۆمانتیزم-ش روو لە نەمانو فەرامۆش بوو، سەنت بیف-ی گەورە رەخنەگری فەرەنسی لەم بارەیەوە بەمجۆرە بیرو بۆچوونی خۆی دەردەبڕێ:

"رەوتی ئەدەبی قۆناغی رستوراسیون لە لوتکەی پەرەسەندنو لە درەخشانترین قۆناغی خۆیدا بوو، بەڵام لە ئەنجامی کودەتای تەمووزو ساڵانی پاش کودەتادا شکستی هێناو تڕۆ بوو".

پاش ماوەیەك لەدوو دڵیو پاشاگەردانی، کە هەراو زەناو پەشێوییەکانی نیشتنەوەو خەڵکی توانیان بارودۆخەکە روونتر بدینن، تەماشایان کرد کە شاعیرانو نووسەرانی رۆمانتیك بایان داوەتەوەو لە بیروبۆچوونەکانی رابردوویان ژێوان بوونەتەوە، یان بە گوتەیەکی دی بیروبۆچوونە ئەدەبیو هونەرییەکانیان ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرتووە.

لە قۆناغی یەکەمی پاش کودەتای ساڵی ١٨٣٠دا، هەموو رۆشنبیران کەوتنە بیری ئەوەی کە لە کۆمەڵگەی تازە ئەرکی کاریگەر بگرنە ئەستۆ، بە زۆری روویان کردە حیزبە سیاسیو قوتابخانە فەلسەفییەکان. لە ماوەی چەند ساڵێکدا بە نزیکە هەموو نووسەرانو شاعیران، پڕ بەمانای واقیعی وشە بوون بە (رۆژنامەڤان)و چەند کەسێکیانیش بوون بە نوێنەر لە ئەنجومەنداو پایەو پۆستی وەزارەتیان وەرگرت.

## هونەری ئامانجدار

لـەم سـەرو بەنـدەدا لەلایەکـەوە لـە ڕێگـەی بڵاوبوونـەوەی بەرهەمـەکانی بالزاکـەوە پایـەو بناغـەی ریـالیزمو نـاتورالیزم دادەمـەزرا (کـە لـە فەسـڵەکانی پێشـتردا باسمـان کـرد)و لـە لایـەکی دیکـەوە ژمارەیێک لە فەیلەسوفو ئەدیبان کە لایەنگری هونەری ئامانجدار بوون، شاعیرانو نووسەرانیان

* Restauartion: قۆناغی گەڕانەوەی دەسەڵاتە بۆ ماڵباتی بۆربۆنەکان کە لە ساڵی ١٨١٤ (کەوتنی ناپلیون) تا ساڵی ١٨٣٠ (کەوتنی شارلی دەیەم بەردەوام بوو.

هانـدەدا کەبەرهەمـەکانی خۆیـان بخەنـە خزمـەتی کۆمەڵگـەو ئەخلاقـەوە (پێشخسـتنی بـیری مرۆڤانی). ئەمانە بریتی بوون لە (کلاسیکەکان) کە پێیان وابوو ئارمانجی هونەر (پەروەردەیی و فێرکاری)یـەو دەیـانگوت هونـەر دەبـیّ بـۆ فێرکـردنو ڕێبەرایـەتی تـیرەی بەشـەر بەسـوود بـیّو، فەیلەسـوفان دەیانوییسـت شـیعرو پەخشـان لـە خزمـەتی پێشـکەوتنی فیکـری بەشـەردا بـیّو ریفۆرمخـوازان هـەوڵیان دەدا لـە پێنـاوی جێگیر بـوونی سیسـتەمێکی نـوێترو باشـتردا سـوود لـە هونەرو ئەدەبیاتیش وەربگرن.

بەهێزترین گرووپی ئەم مەیدانە (پەیڕەوانی سەنت سیمون) بوون کە هەندێك لە کلاسیکەکانو ژمارەیـەك لـە ڕۆمانتیکـەکانی گرتبـووە خـۆو داوایـان لـە هونەرمەنـدان دەکـرد کەلـە کۆششـی دەسـتەجەمی ڕۆشـنبیراندا بـۆ چاکترکردنی هەلومـەرجی ژیـان بەشـداری بکـەنو هونـەری خۆیـان بخەنە خزمەتی پێشڤەچوونی کۆمەڵگەوە. ئەم گرووپە پێیان وابوو کە بۆ سەرخستنی ئەو ئامانجە ئەوەنـدە بەسـە کـە هەسـتی هاوسـۆزیو هـاودەردیو هاوکـاری لـەلای خەڵکەکـە بـوروژێنن: مەحەبەتو برایەتیو هەستی لە بابەتی هەستێن ئاینی بوروژێنن. لەم ڕێبازەدا یان لەم ئاینـەدا کاری وەعزو تاربێژی لە ئەستۆی هونەرمەندانا بوو و دەیانگوت دەبیّ هونەرمەندان ڕێبەرایـەتی کردنی کۆمەڵگە بە ئەرکی خۆیان بزانن.

جگە لە "هۆگۆ" ئیدی هەموو نووسەرانو گەورە شاعیرانی ڕۆمانتیك هاتنە ڕیزی (پەیڕەوانی سەنت سیمون)ەوە. تەنانەت (موسیە)ی شاعیری گریان، ڕوندکی شاعیری بە هـەتوانی زامـەکانی کۆمەڵگەی بەشەر دەزانی.

## هونەر بۆ هونەر

ل ڤیکتۆر هۆگۆ وێڕای ئەوەی جاران بایەخی بە دۆزو پرسە کۆمەڵایەتییەکان دەدا، و پاشانیش لە ساڵی ١٨٤٠دا بەوە قاییل بوو کە هونەرمەند ئەرکی کۆمەڵایەتی لەسەرە. لە ساڵی ١٨٢٩دا کتێبی (شەرقیات)ی بڵاوکردەوەو بەمە بوو بە دامەزرێنەری قوتابخانەی هونەر بۆ هونەر. گەورە شـاعیری ڕۆمانتیـك لـەم بەرهەمەیـدا بایـەخێکی زۆری بـە فـۆرمو کـێشو قافیـەی شـیعرداو لـە پێشـەکییەکی غـروور ئـامێزدا وەڵامـی (پـەیڕەوانی سـەنت سـیمون)ی دایـەوەو ئـازادی شـیعری ڕاگەیانـدو گـوتی کـە شـاعیر هەمیشـە هـەقی ئـەوەی هەیـە "بەرهـەمێکی بێهـودە بڵاوبکاتـەوە کـە شیعری پەتی بیّ". هۆگۆ لە هەمان پێشەکیدا گوتوویەتی: "ئەگەر بە چاوێکی بەرز بڕوانین ئەوا لە شیعردا بابەتی چاكو خراپ لـە گۆڕیّ نییـە، شاعیرانی چاكو خراپ هەیـە. لەلایـەکی دیکـەوە

هەموو شتێك بابەتی شیعرە، هەموو شتێك هەوێنی هونەرە، هەموو شتێك بۆی هەیە بێتە ناو قەڵەمڕەوی شیعرەوە.. كەواتە نابێ بپرسرێ كە چ هۆكارێك وای لە شاعیر كردووە بابەتێكی شاد یان خەمناك، ترسناك یان دڵگیر، روون یان ئاڵۆز هەڵبژێرێ، دەبێ تەمەشای ئەوە بكرێ كە چۆن كاری كردووە نەك چ كارێكی كردووە.

دەستەواژەی (هونەر بۆ هونەر)ش لە هەمان ساڵداو لەلایەن (هۆگۆ)وە راگەیەنراو ئەوەبو بەدەم باس‌و خواس‌و مشتومڕی ئەدەبییەوە گوتی: "سەد جار دەڵێم: هونەر بۆ هونەر!".

چەند كەسێك لە شاعیران‌و شێوەكاران‌و پەیكەرسازانی لاو لە دەوری مامۆستا (هۆگۆ) خڕبوونەوەو پێشەكییەكەی (شەرقیات)یان بە ئینجیلی هونەر داناو گوتیان كە ئامانجداری یان پابەند بوون بە ئەركی كۆمەڵایەتییەوە بایەخی هونەر لە نێو دەبات‌و گوتیان هونەر خوایەكە كە دەبێ تەنیا لەبەر خاتری خۆی بپەرسترێ‌و هیچ جۆرە شەقڵێكی ئامانجداری یان ئەخلاقی‌و ئاكاری نەدرێتە پاڵ‌و چاوەڕوانی ئەو جۆرە وێنایانەی لێنەكرێ.

یەكێك لەو لاوانە (تیوفیل گوتیە ١٨١١– ١٨٧٢) بوو كە وەكو رۆمانتیكێكی دیارو پەیڕەو كارێكی هۆگۆ كەوتە بەرگری‌و داكۆكی لە شیعرێك كە بە تەواوەتی بەپرسە كۆمەڵایەتی‌و ئەخلاقی‌و سیاسییەكان نامۆو بێگانە بێ. گوتیە كە جاران نووسەرێكی رۆمانتیكی پڕجۆش‌و خرۆش‌و خەمین بوو، پاشان چەندین سەفەری بۆ وڵاتانی جۆراوجۆر كردو دوای گەڕانەوە بوو بە پێشڕەوی ژمارەیەك لەو لاوانەی كە (هونەر بۆ هونەر)یان كردبوو بە دروشمی خۆیان. ئەم گروپە دەیانگوت كە: هونەر تاقە بەڵگەی ژیان‌و زندویەتییەو لەگەڵ ئەمەشدا بە كەڵكی هیچ نایەت، هونەر بێفایدەو تەنیا بوونەكەی لە خودی خۆیدا بەسە. دەیانگوت ژیان ئەستەمەو پڕ لە دەردو رەنج‌و سەریەشەیەو چارەنووسی بەشەر روون نییە، تاقە شتێك كە بتوانێ سوكناییمان پێ ببەخشێت جوانییەو هونەر كاتێ دەتوانێ بگاتە كەماڵی جوانی كە لە هزرێن ئەخلاقی‌و فەلسەفی و گۆڕانكارییە لێكدا لێكداكانی ئەخلاق‌و فەلسەفەو لە بەرجەستەكردنی مەیلە ئاڵۆزەكان بەدوور بێ. تیوفیل گوتیە لە پێشەكی شیعرەكانی خۆیدا دەربارەی هونەر گوتویەتی: "سوودی چییە؟ جوان بوون! ئایا ئەمە بەس نییە! وەكو گوڵان، وەكو عەترو بۆنان، وەكو باڵندان، وەكو هەموو ئەو شتانەی كە بەشەر ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی بیگۆڕێ‌و لەنێو بەرێ، بەشێوەیەكی گشتی هەر شتێك كە سوودمەند بوو ئیدی ناتوانێ جوان بێ، چونكە تێكەڵ بە ژیانی رۆژانە دەبێ، شیعر دەبێ بە پەخشان‌و ئازاد دەبێت بە كۆیلە. هونەر ئەمەیە. هونەر ئازادییە، شكۆیە، گوڵكردنەو پشكوتن‌و گەشەكردنی روحە.. شێوەكاری‌و پەیكەرسازی‌و مۆسیقا بەهیچ كلۆجێ بەكەڵكی هیچ نایەن...".

هەر لە هەمان پێشەكیدا گوتویەتی: "ئێمە داكۆكی لەخۆیبوونی هونەر دەكەین. هونەر بەلای ئێمەوە ئەوزار (وەسیلە) نییە، بەڵكو ئامانجە هەر هونەرمەندێك كە لە بیری هەر شتێكدا بێ جگە لە جوانی، لە روانگەی ئێمەوە هونەرمەند نییە..."

هەروەها لە ساڵی ١٨٣٤دا لە پێشەكی كتێبە بە نێوبانگەكەیدا (مادموزیل دو موپن) نووسیویەتی: "تەنیا یەك شت بەڕاستی جوانە كە بە كەڵكی هیچ نەیەت. هەر شتێكی بەسوود

ناشیرینە چونکە گوزارشت لە پێداویستییەك دەکاتو پێداویستییەکانی مرۆڤ، وەکو میزاجی لە چارەسەر نەهاتووی خۆی، نزمو بێزەوەرە".
دوما دەربارەی (هونەر بۆ هونەر) دەڵێت: "سیّ وشەیە کە لە هەر جۆرە هەستێك مەحرومە". هەقە ئەم رستەیە بە پێناسەیەکی باش بۆ ئەم قوتابخانەیە بژمێردریّ. چونکە نووسەرێکە باوەڕی بە پرەنسیپی (هونەر بۆ هونەر)ـەو جگە لە جوانی قاڵبو فۆرمی بەرهەمەکەی خۆیو چۆنیەتی دەربڕینی بابەت ئیدی بایەخ بە هیچی دیکە نادات، هەندێ جار لە هەنبەر حەساسترین رووداوی ژیاندا بە رادەیەك ساردو سڕەو بیّ موبالاتە، هێندە بە بیّ موبالاتی دەری دەبڕیّ کە مرۆڤ دووچاری ترس دەکات.
شاعیرێکی دیکەی ئەم قوتابخانەیە (تیودور دو بانڤیل)ـە کە بە خۆی دەڵێت شوێن پێی تیوفیل گوتیەـی هەڵگرتووە. ئەم شاعیرە دنیا بە پەردەێن شانۆو خەڵکی بە ئەکتەرانی ئەو شانۆیە دەزانیّو زیاتر بایەخ بە نواندنو سیمایان دەدا تا بە هەست و سۆزیان. هەروەها دان بەوەدا دەنێت کە لە هونەری شیعردا تەنیا پابەندی کێشو قافیەیەو هیچ مەبەستێکی لەشیعر نووسیندا نییە جگە لە پاراو کردنی زەوقی خۆی. دەڵێت: "قافیەوەکو مێخێکی زێڕین وایە کە خەیاڵاتی شاعیرانی پیّ داکوتریّ".

## قوتابخانەی پارناس

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٠دا کاتیّ کە باسو خواسو مشتومڕێکی توند دەربارەی ئەدەبیات لە ئارادا بوو، ژمارەیەك لە شاعیرانی لاو کە دژی رۆمانتیزم هەستابوونو لە ژێر کاریگەری رەوتی (هونەر بۆ هونەر)دا بوون، لە دەوری یەکدی خڕبوونەوەو ئەنجوومەنانی ئەدەبیان بۆ خۆ پێکهێنا.
"لوکونت دولیل" لە ریزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەدا بوو و لە هەموویان پتر دیاربوو، و پێویستە بە گەورەترین نوێنەری ئەم رێبازە ئەدەبییە بژمێردریّ. لە ساڵی ١٨٦٦ کۆمەڵە شیعرێکی هاوبەشی ئەم شاعیرانە بەناوی (پارناسی[١] هاوچەرخ) بڵاو بووەوە. جا لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە لەلایەن خوێنەرانەوە بە گەرمی پێشوازی لێکرا، بۆیە پاش ماوەیەك بەرگی دووەمو سێیەمیشی لیّ بڵاوکرایەوە. ئیدی بەرەبەرە ئەم شاعیرانە بەناوی (پارناسین)ـەوە ناوبانگیانی دەرکردو لە ئەنجامدا رەخنەگرێك بەناوی "ئاندریە تریڤ" لە کتێبێکیدا کە بۆ شاعیرانی (پارناسین)ی تەرخان کردبوو، وشەی پارناسیزمـی بەکار هێنا.

## شیعری پارناسین

- [١] (پارناس) ناوی کێوێکە کەبەپێی ئەفسانەکانی یۆنانی کۆن، ئەپۆلونی خواوەندی شیعرو ئەو نۆ خۆشکەی کە فریشتەی پاسەوانی هونەرە جوانەکان بوون لەوێندەر دەژیان. ئەم ناوە بە کۆمەڵە شیعریش دەگوتریّ.

بە باوەڕی پارناسینەکان، شیعر نیشانەی روحی کەسێکە کە هەستەکانی خۆی کوژاندووەتەوە. شیعری پارناسین دژی ڕۆمانتیزم هەستاو دژایەتی هەر جۆرە شیعرێکی شەخسی "Subjectif" دەکرد. شاعیری پارناسین بە هیچ کلۆجێ نایەوێ خۆی بە نێوەڕۆکی گەشبینانەو ئاوات و ئارەزووانەوە مژول بکات و تەنیا هونەری پەتی بەلاوە پەسندەو بایەخ بە جوانی فۆرم و تەرزو چۆنیەتی دەربڕین دەدات، نێوەڕۆکی شیعرەکانی سادەو بێ بایەخە، لێ فۆرم و قالبی شیعرەکانی بە لێهاتوویی و وەستاییەکی یەجگار زۆرەوە داڕشتووە، چونکە هەر یەکێك لە پارناسینەکان بگری چەند شیعرێکی یەجگار کەمیان گوتووە، بەلام تا حەز بکەی بەرهەمەکانیان جوان و وەستایانەیە.

ئەو پرەنسیپە ناوازانەی کە جێگەی بایەخی پارناسینەکان بوو و قوتابخانەکەیانی لە قوتابخانەکانی دی جیا دەکردەوە، بریتی بوون لە:

١- کەماڵی فۆرم، چ لە رووی دەربڕینەوەو چ لە رووی هەڵبژاردنی وشەوە.

٢- دوورە پەرێزی لە هەست و سۆزان و گوێ نەدان بە مەبەست و ئارمانجان.

٣- جوانی قافییە.

٤- پابەندی بەرێبازی (هونەر بۆ هونەر).

جا بۆیە شیعری شاعیری پارناسین وەکو مەڕمەڕ ساف و بێ گەردەو لە هەمان کاتدا بتەوو مکومە، شاعیری پارناسین زۆر بە وردی هەر وشەیەك هەڵدەبژێری و لە جێگەی خۆیدا دایدەنێت و هێوای ئەو ئەوەیە کە شیعر لە رووی مکومی و جوانییەوە بگەیەنێتە ئاستی پەیکەر. شاعیری پارناسین باوەڕی وایە کە شیعر نە دەبێ کەس بێنێتە پێکەنین و نە کەس بخاتە گریان. بەڵکو دەبێ تەنیا جوان بێ و ئامانج و مەبەستی خۆی لە خۆیدا بدۆزێتەوە.

## ئاوڕدانەوە لە قۆناغی کلاسیك

شاعیری پارناسین کە لە زەینیات هەڵدێ و جوانی بەدەر لە هەر هەستێك بە ئەوزاری شادمانی دەزانێ، بە لای ئەدەبیاتی کلاسیکدا کە بە هیچ جۆرێ لایەنی زەینی تێدا نییە، دایدەکێشێ و، بالاترین نموونەی جوانی ئایدیالی خۆی لە هونەری یۆناندا، لە خواوەندانی مەڕمەڕینداو لە بیناسپیانە کە سێبەری هزرو سۆز لێڵ و تاریکی نەکردوون دەبینێتەوە.

شاعیر لە سەردەمێکدا کە بە خەیاڵی ئەو ناشیرینی بەسەر جوانیدا زاڵ بووە، ئەسپی خەیاڵ بەرەو ئەو سەدانە تاو دەدات کە بەڕای ئەو سەراپا شکۆی داهێنان و جوانی دەنوێنن.

لوکنت دولیل بەرهەمی هۆمەرو سوفوکل و هوراس-ی تەرجەمە کردووە، هەر بۆیەش لە بەرهەمەکانی خۆیشیدا بۆ سەدەکانی سەرەتا گەڕاوەتەوە. ئەم شاعیرە ولاتانی زۆری دیتووەو سەفەری شوێنانی جیاوازی کردووە، لێ نیشتمانی ئەسڵی ئەو یۆنانی کۆنە یۆنانی (هومەر)و (سوفوکل!). بە باوەڕی ئەو مەرجی ئایدیالیستی هونەر، بێدەنگی و ئارامی روحی شاعیرو بەیتی ریتمدارە کە دەتوانێ تابلۆیانی شکۆدار لەبەر چاوان بەرجەستە بکات.

## نائومێدی و ڕەشبینی لەبەرهەمێن

## پارنا سینەکاندا

"لوکنت دولیل"ی سەر قافڵەی پارناسینەکان، شاعیری نائومێدییەو بەوپەڕی ڕەشبینیو نائومیدییەوە دەڕوانێتە ژیان. بە باوەڕی ئەو هەموو شتێك بریتییە لە وەهمو خەیاڵو ڕەوتی بێ پایانی ڕووداوان.هیچ شتێك نایەتە راگرتن. هیچ شتێك بوونی نییە. تەنانەت خواش! تەنیا مەرگ هەیەو بەس. ئەو گوتارانەی دەربارەی مەرگو ئەو هاوارە بەزەیی ئامێزانەی کەلە شیعرەکانیدا سەبارەت بە زندووان دەنگ دەداتەوە، روحی زامداری شاعیرمان پێ دەناسێنێ.

نێوبراو پێی وایە کە خراپەو خراپی زادەی ژیانە، بۆیە دەبێ تا لە تواناداا بێ کەم بژی (جا سەیر لەوەدایە ئەم شاعیرە بەخۆی ٧٦ ساڵ ژیاوە!) دەبێ جۆش و خرۆش لە خۆدا بکوژێ، یەخەی خۆت لە دەستی (نەخۆشی هومید) دەربێنیو روح لە هەموو ئارەزوو هەواو هەوەسەکان دوور بخەیەوە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکرێ ئەمەیە کەخودی شاعیریش پابەندی ئەو وڕینانە نەبووەو نییەو نابێ. بە رواڵەت دەیەوێ لە هەنبەر کۆمەڵگەو دابو نەریتو ئومێدەواری بەئایندەو شتانی دیکە خەمساردو بێ موبالاتو بێ لایەن بێ، لێ ئەم بێ موبالاتییە دەبێ بەکینەو کەربو بەتوندی دەکەوێتە دژایەتی کردنی کۆمەڵگە. خەڵکی بە "گەوج" ناو دەباتو مەسیحیەت بە ئاینێکی زاڵمانەو فریودەر دەزانێ. بە رواڵەت دەخوازێ تەنیا جوانی فۆرم لە بەرهەمەکانی خۆیدا بپارێزێتو شیعر تەنیا بۆ جوانی فۆرمەکەی بڵێ، لێ هەموو شیعرەکانی پڕن لە فەلسەفەی کەچڕەوانەو نائومێدیو ڕەشبینی.

## رچەی دیکەی پارناسینەکان

لەدوای (لوکنت دولیل) بە تواناترین شاعیری ئەم قوتابخانەیە (ژوزە ماریادو هردیا)یە. ئەو شاعێرێکی تەواو پارناسینەو شیعرەکانی زیاتر (تیوفیل گوتیە) وەبیر دێننەوە تا (لوکنت دولیل) شیعرە پرشنگدارەکانی لە تۆ وایە بە دەستی جەواهێرسازێك رازێنراونەتەوە. هەر (سوناتە[٢])یەکی جوانی ئەو بەکرەی گرامافۆنێکی مەزنە کە لە سەر بازنەی تەنگو بچووکیدا، زۆر باسی مێژوویی و ئەفسانەیی بە پەڕەمووچی خەیاڵی هونەرمەندێکی بە توانا تۆمار کراوە.

ئەم شاعیرە تەنیا یەك کتێبی شیعری بەناوی (Les Trophees) هەیەو شیعرەکانی لە رووی بونیادەوە بێ نەزیرن.

[٢] سوناتە: قەسیدە یان شیعرێکی ١٤ بەیتییە.

## شیعری ئۆبجەکتیف

ئەنجام شیعری ئۆبجەکتیف-ش ئاویتەی بەرهەمێن پارناسینەکان بووەو ئەویش بریتیە لەو شیعرە ناتورالیستییەی کە لەگەڵ رۆمانی ناتورالیستیدا هاتۆتە ئاراوە. شیعرێکە کە (من)ی تێدا نییە، یانی شاعیر تەنیا تەماشاکەرو بەرجەستەکاری دیمەنەکانە.

ئەم شیعرە لەگەڵ ژیانی خانەوادەیی و واقیعی ئاسایی و سواو تەنانەت ناشیرینشدا دەسازیٚ و مامۆستای ئەم جۆرە شیعرە (فرانسوا کوپە)یە کە زۆلا بەهۆی (هەڵکردنی ئاڵای ناتورالیزم لە شیعردا) پیرۆزبایی لێکردووە. لیٚ رەخنەگری هاوچەرخی فەرەنسی "رنەلالو" پێی وایە کە (کوپە) شایانی ئەو ناوە نییە، چونکە تەنانەت ئەو شیعرە کەمانەشی کە لەسەر شێوازی ناتورالیستەکان گوتونی، لەگەڵ رێساکانی قوتابخانەی نێوبراودا ناسازێن.

(کوپە) یەکەم کتێبی خۆی (Reliquaire) پێشکەش بە (مامۆستای عەزیزی خۆی لوکنت دولیل) کردووە، هەر چەندە بابەتی شیعرەکانی لە مەسەلە رۆژانەکانی ژیانەوە هەڵێنجاوە، بەلاّم لە هەندیٚ بەرهەمی خۆیدا، بە تایبەتی لە پارچەی (Les Humbles) شاعیرێکی پارناسینە.

## ( سیمبولیزم )

"چ شتێك لەمەڕ سیمبولیزم دەزانم؟ هەزار شتی ئاڵۆزو بە تەمتومان. سیمبولیزم هەمیشە لە قەڵەمڕەوی رەخنە هەڵدیٚو لێهاتووانە خۆی لە شرۆڤەو وەسفان دەرباز دەکات..." ئەو کتێبەی کە ئالبرماری شمیدت دەربارەی (سیمبولیزم) نووسیویەتی و لە زنجیرە کتێبانی "چ دەزانم؟"ـە بەو دێڕانە دەست پێدەکات!.

تاقمێك تەسەوف تێدا دەبینن و ماکی عیرفانی رۆژهەڵات و رۆژئاوایی تیا دەدۆزنەوەو، ژمارەیەکی دی بە رێگەیەکی دەزانن بۆ ئیجادی زمانێکی تازە لەشیعردا، هەروەها هەندێکی دی بە هەوڵێکی دەزانن بۆ وەرگرتنەوەی ئەوزاری دەربڕین لە هونەرەکانی دیکە، وەکو چۆن زۆربەی سیمبولیستەکان بەوە دەنازن کە دەتوانن هەڤرکی مۆسیقا بکەن. ئیدی بەمجۆرە پێناسەو وەسفی ئەم قوتابخانەیە گەلەك زەحمەتە. بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا شاعیران و نووسەرانی سیمبولیست هەندێ تایبەتمەندی خۆیان هەیە کەبە ئاسانی دیاری دەکریٚو من ئەوەندەی بتوانم ئەو تایبەتمەندییانە نیشاندەدەم.

## ( سەرەتای سیمبولیزم )

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٨٠دا ژمارەیەك شاعیری گەنج، ئەگەرچی جۆرە پەیوەندییەکیان بە رێبازو رێچکەی (پارناس)وە هەبوو، بەڵام لە چوارچێوەی وشك و بێ گیانی شیعری پارناسین دەرچوون و بە حەساسیەتێکی تازەوە هەم دژی شیعرێن زبری پارناسینەکان و هەم دژی پۆزیتیڤیزم و ئەدەبیاتی ریالیستی و ناتورالستی وەستانەوەو یاخی بوون.
هەڵبەتە ئەمانە نیازیان نەبوو بەلای هەستی توندو تیژی غەزەلی نائاسایی رۆمانتیزمدا دایکێشن، بەڵکو یاخی بوونی ئەمانە بە تەواوەتی شتێکی تازە بوو و ئەوەی دەیانگوت قووڵترو ئاڵۆزتر بوو: پۆزیتیڤیزم وای تەسەور دەکرد کە توانیویەتی بەباشی دنیا وەسف بکات و وێنەی بگریٚو داوەری لەمەڕ بکات. بەڵام ئەم حەساوە سادەیە شاعیرانی تازەی ئیقناع نەدەکردو بەلای ئەوانەوەو لە نۆڕینی ئەوانەوە هەموو شوێنێك تەژی مەتەڵ و رازو نهێنی و نیگەرانی بوو. لەم ماوەیەدا وێڕای ئەوەی کە فەلسەفەی تەحققی (پۆزتیڤیزم) بە ناوی قوتابخانەی ئەدەبی ناتورالیزمەوە فەرمانڕەوایی قەڵەمڕەوی رۆمان و شانۆی دەکرد، بەڵام یاخی بوونی شاعیرانی تازە بە شێوەی هێزێکی تازە لە هەمبەر فەلسەفەی نێوبراو قووت بووەوە، هەر چەند نەیتوانی

رای بگرێت، بەڵام سنوورێکی بۆ دانا، فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم تەنیا بە واقیع پشت ئەستوور بوو، بەڵام گۆڤارو بڵاوڤۆکانی تازەو فەیلەسوفانی تازە پشتیان کردبووە واقیعو تەنانەت نکولییان لێدەکرد. لە روانگەی زۆربەی شاعیرانی سیمبولیستەوە واقیعی ئێستا یان واقیعی رابردوو و نیشاندانی ئەو واقیعە کارێکی بێزەوەر بوو.

گیانی یاخیگەرێتی لە هەموو لایەکەوە دیار بوو. یاخی بوونی وەچەی نوێ، یان بەشێك لەم وەچەیە کە لە کۆمەڵگەدا بە ئاسانی جێی نەدەبووەوە... ئەم گەنجانە لە هەر هەموو رەوت و رەوشە سیاسیی و کۆمەڵایەتی و هزری و هونەرییەکانی پێشینان بێزارو وەڕەز بوون، هێزی سوپایی، سیستەمی ئەخلاقی، هونەری رێك و پێك، رۆمانی ریالیستی باوەڕ بە فەلسەفەی پۆزیتیڤیزمو... هەر هەمووی لە نوێرینی ئەوانەوە هیچ و بێ ئیحتوبار بوو. دەیانویست یان ئەنارشیست بن یا حاشا لە هەموو شتێك بکەن و سیمبولیزم بەر لە هەر شتێك شێوەیەکی ئەو پاشاگەردانییە بوو.

یەکەم پەیام هەڵگری ئەم یاخیگەرییە فیکرییە شارل بودلێر بوو کە بەلایەنگری رێبازی هونەر بو هونەر دەژمێردرا. بەڵام رێگەیەکی تازەی گرتەبەرو بەمەش بناغەی قوتابخانەیەکی تازەی دامەزراند. بە بڵاوکردنەوەی دیوانی (گوڵێن شەڕ) دنیای شیعری هەژاندو نەوەیەکی تەواوی شیعرو ئەدەب لە نێوان ساڵانی ١٨٥٧– ١٨٨٠ بۆدلێریان بە پێشەوای بێ چەندو چوونی خۆ دەزانی.

ئەوەی شاعیرانی سیمبولیست لەوە بە دواوە بە بنەمای قوتابخانەکەی خۆیان دەزانی، بۆدلێر لە شیعرێن بچووکی وەکو (correspondaces, Lavie anterieure) دەری بڕیوەو نیشانی داوە.

لە نۆڕینی بۆدلێرەوە دنیا بێشەکی لێوان لێوی هێماو ئاماژانە. حەقیقەت لە خەڵکی ئاسایی شاراوەو پەنهانە و تەنیا شاعیر بەزەبری ئەو ئیدراکەی هەیەتی. لە رێگەی تەفسیرو راڤەو شرۆڤەی ئەو هێماو ئاماژانەوە هەستی پێدەکات، ئەو جیهانە جیاوازانەی کە کار لە هەست و حەواسی ئێمە دەکەن، پەیوەندی وردیان لە نێوان هەیەو، شاعیر دەبێ کە شفیان بکات، بیاندۆزێتەوەو بۆ نیشاندانی مەبەستەکانی خۆیا بە زمانێکی تازەتر سوودیان لێوەربگرێ. هەڵبەتە خودی بۆدلێر سوودێکی ئەوتۆی لەم زمانە سیمبولیکە وەرنەگرتووە، بەڵام چەند نموونەیەکی بەرجەستەی لە پاش خۆی بەجێهێشتووە کە بە پێشینەو پێشەکییەك بۆ شیعری سیمبولیك دەژمێردرێ.

## پێشەوایانی سیمبولیزم

لە نێو ئەو کەسانەی کە ئیلهامیان لە بۆدلێر وەرگرتووەو بە زەبری بەرهەمی خۆیان زەمینەیان بۆ سەر هەڵدانی سیمبولیزم خۆش کردووە سێ ناوی بە نامێ مایەی سەرنجن: پۆل ڤارلین، ئارتور رامبۆ، ستیفان مالارمیە... هەڵبەتە شێوازی شیعری ئەم سێ کەسە چوون یەك نەبوو و هەر یەکەیان تایبەتمەندی خۆیان هەبوو:

ڤارلین ئەگەرچی کەسێکی وێڵو ئاڵودە بوو، بەڵام شاعیرێکی گەورەبوو. بەوپەڕی بێ باشاریەوە دەیڕوانییە نابوودی بەرەبەرەی خۆی. ڤارلین یەخسیری کەڵکەڵەو ئارەزووەکانی خۆی بوو و، یەکێك لە رەخنەگرە فەرەنساوییەکان لە بارەی ڤارلینەوە دەڵێت: "خەیاڵدانێکی شەهوانی ئاوێتەی خەمێکی ئاهەنگدار کردبوو" واتا بە شیعرێن ناسكو هونەرمەندانە نیگەرانی روحێك کە دەیوەیست بەرەو خوا بچێو، ئاڵۆشو خرۆشی بەدەنێك کە لەزەتی لە گەندەڵکاری دەبینی، نیشان دەدا. هاواری روحی خۆی کە بەدەم چارەنووسی خۆیەوە دەتلایەوە، لە شیعرەکانیدا نیشان دەداو بەرەو جۆرە رۆمانیتزمێك دەگەڕایەوە، لێ لەگەڵ ئەمەشدا هەناسەیەکی تازەی بە بەر شیعری فەرەنسی دا کردو سیمبولیزمی هێنایە ناو شیعرەوە.

رامبۆ کە تا نۆزدە ساڵی شاکارەکانی خۆی بەرهەم هێناو دەستی لە شاعیری هەڵگرت، باسی وڵاتانی جوانو مرۆڤی غەریبو، بۆنو عەتری عەجیبو، شەهوەتو موجیزاتو گوڵی شکۆدارو جەبەروتی دەکرد. رامبۆ بلیمەتییەکی شیعریی لە رادەبەدەری هەبوو وەکو کلبر هدن-ی نووسەری فەرەنسی دەڵێت: "…. لە شیعرەکانی ئەودا وشە وێنەی تازە وەردەگرنو لە ناو نورو پرشنگێکی فسفۆریدا غەرق دەبن!" وەکو چۆن بۆدلێر لە شیعری: "Correspondances"ی خۆیدا دەیگوت: "عەترو رەنگو دەنگەکان پێکەوە دەسازێن" ئەویش رەنگی بۆ دەنگەکان دیاری دەکردو لە شیعری: "Voyelles"ی خۆیدا دەیگوت: "A رەش، E سپی، I قرمز، u سەوزو o شین". (جێی خۆیەتی ئەوە وەبیر بهێنرێتەوە کە رامبۆ بەم جۆرە شیعرانەی رێگەی بەرەو سورریالیزم دەکردەوە). رامبۆ زۆرجارو بەوپەڕی تواناوە باسی هەندێ شوێنی دەکرد کە نەی بینی بوو. بۆ وێنە شیعری "بەلەمی مەست"ی وەختی گوتووە کە دەریای نەبینی بوو.

ستیفان مالارمیە، هەموو تەمەنی خۆی لەسەر ئەوە دانا کە وێنەیەکی تازە لە شیعردا بدۆزێتەوە. دەیگوت دەخوازێ شیعر لە کۆتو بەندی هەموو ئەو شتانەی کە شاعیرانە نییە، ئازاد بکات. مالارمیە پابەندی هەستو فیکرو حاڵەتی روحی مرۆڤو وێنەگرتنی سروشت نەبووو گوێی بە فۆرمی شیعری ئاسایی نەدەدا. لە نوێینی ئەوەوە تەنیا (وشە) بایەخی هەبوو. هونەری شاعیر ئەمە بوو کە شیعر لە وشەێن شاعیرانەو ئەفسوون ئامێز دروست بکات. لە شیعری مالارمیەدا نە شادمانی هەبوو نە خەم، نەکینە دەبینراو نە ڤیان، بەکورتی هیچ جۆرە هەستێکی ئادەمی نەبوو. مالارمیە شیعری لە ژین دوور دەخستەوەو لە دەستی مرۆڤی دەردێناو بە جۆرێکی دەسازان کە تەنیا هەڵبژاردەیەکی ئەنگوست ژمێر بتوانن دەرکی بکەن.

## شاعیرانی منحط (بێ بەها)

لەدەوروبەری ساڵی ١٨٨٤دا کە ڤارلین کتێبی:

"Lespoetes maudiats" بڵاوکردەوە، ناوی (مالارمیە)ش دەکەوتە سەر زاران، لەم ماوەیەدا کۆمەڵێك لە شاعیرانی لاو کە لە گەمەی پارناسینەکان بێ تاقەت بوو بوون، ناو بەناو گۆڤارێکی ئەدەبی ناپایەداریان بڵاو دەکردەوەو بۆ ماوەیەك لە دەوری خڕ دەبوونەوە. هەڵبەتە ئەم بابەتە

گۆڤارانە تەمەنیان کورت بوو و بڕیان نەدەکرد. بەڵام زۆری پێ نەدەچوو کە گۆڤارێکی دیکە دەهاتە مەیدان. زۆربەی ئەم گۆڤارانە تا ٣- ٤ ژمارە بڕیان دەکرد بەڵام کاریگەرییان بەسەر ژینگەو ناوەندی شیعرو ئەدەبەوە زۆر زور بوو. جگە لەم گۆڤارانە، شاعیرانی لاو کە بە زۆری بۆچوونی جیاوازیانیش هەبوو، لەبەر ئەوەی هەموویان کەسانی تازەخواز بوون، کۆڕیان دەبەست و بە زۆری لە دەوری یەکتر خڕ دەبوونەوە. ئەم لاوو شاعیرە تازەخوازانە بەزۆری دەبوونە مایەی قەشمەری و گاڵتەجاری و گەپجاری و ناوەندە ئەدەبییەکان لە بری ئەوەی بەجددی وەدەنگیانەوە بچن قەشمەرییان بە شیعرو نووسینەکانیان دەکرد. لێ لە ئەنجامدا قۆناغێك هاتە پێشەوە کە چەند شاعیرێکی گەورەی تازەخوازی وەکو ڤارلین، مالارمیە، شارل کروس، هردیا، فرانسوا کوپە، مورەئا- یان ناسی و توانیان بەرهەمەکانی خۆیانیان پێ نیشان بدەن.

یەکەم شەقڵێك کە ئەم ڕێچکە شیعرییە بە خۆوەی گرت، ئەوە بوو کە ناویان نا قوتابخانەی: "Decadisme" واتە نزم و بێ بەها، هەڵبەتە هەوەڵجار وشەی (بێ بەها= منحط) وەکو جۆرە تانەو تەشەرێك بە هەموو ئەو کەسانە دەگوترا کە پەیڕەوی (ڤارلین)یان دەکرد. ئەم وشەیە بۆ یەکەمجار لەلایەن "گابریل ڤیکر)ەوە، لە نامیلکەیەکیدا دەربارەی ئەم شاعیرانە بەکار هێنراوە. لەو نووسینەدا بەمجۆرە باسی ئەو تاقمە شاعیرەی کردووە: " ئەم شاعیرە تازانە لە خەیاڵاتی خۆدا غەرق بوون و لە واقیعی ژیان دوور کەوتوونەتەوە. عیرفانی وردو هەستیاریان ئاوێتەی عەیش و نۆش و رابواردن و هەرزەکرداری کردووە. شیعرەکانیان کە دوورن لە تێگەیشتنەوە، زادەی ڕێکەوت و کە چ رەوییە.

هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی (بێ بەهایان) ئاڵۆزی روح و بێ هەستی و بێ موبالاتی و گوێنەدانە بە ئەخلاق و لێك نەچوونی شیعرەکانیانە. ئەوانە ستران بۆ روحی خۆیان، گۆرانی بۆ روحی گۆشەگیرو چۆڵ و هۆڵی خۆیان دەچڕن.. جا چونکە هەستیارو نیگەرانن بۆیە زۆر لە شێتییەوە نزیکن. لێڵی ناوەڕۆك فۆرمی شیعری دەفەوتێنێ.

بابەتی شیعری بێبەها (منحط) بریتییە لە رەشبینی تەوس ئامێزو جیهانبینی نا جێگرو دڵتەنگی و خەم و پەژارەی بێ دەرمان و ناڕەحەتی دەروونی. شاعیرانی بێ بەها سەربوری شەوانی نیگەرانی و پەرێشانی و، یەك شەممە شووم و پرسەئاساکان و درەختانی پایزی و بوونەوەرانی رازدار دەگێڕنەوە.

شاعیرانی بێبەها، وایان تەسەور دەکرد: "لە سەدەیەکدا دەژین کە هەموو ژیانی خۆیان لە دەست داوەو دوا تەکانی شارستانیەتێك دەبینن کە روو لە دامرکانەوەیە...

ڤارلین ئەم بیرۆکەیە لە نیوە بەیتێکی خۆیدا بەمجۆرە دەردەبڕێ: "من ئیمپراتۆری کۆتایی بێ بەهایم= انحطاط!".

بەناوبانگترین شاعیری قۆناغی بێبەهایی "بەهاسزی" (ژول لا فورگ ١٨٦٠- ١٨٨٧)ـە دەکرێ شیعرەکانی بە نموونەی بەرهەمی ئەدەبی ئەم قۆناغە بژمێردرێ. لافورگ شاعیرێکی خوێنەوارو رۆشنبیرو لە هەمان کاتدا زۆر هەستیارو رەشبین بوو. ژیانێکی خەمین و تەنیای هەبوو. کەسێکی

ئاڵۆزو هەست نەخۆش بوو. باوەڕی بە قەدەرو چارەنووسی مرۆڤ هەبوو و بە میهرو سۆزێکی تەوس ئامێزەوە دەیڕوانییە بەشەڕ.
"لاڤورگ" زمانێکی تێکەڵ و پێکەڵی بۆ شیعر داهێنا بوو کە خوێنەری دووچاری سەرەگێژکێ و سەرسامی دەکرد. زمانی فەلسەفی بەزاراوەێن سنعەتی و بە زمانی عامیانەو بە زمانی شەلاتیانی پاریس و بە گفتوگۆی منالانی چکۆلە تێکەڵ کردبوو. لە واری کێشی شیعریشدا هەمان کاری دەکرد، هەندێ جار شیعری "ئەلکساندرن"ی بە بڕگەی نا ئاسایی دەنووسی، هەندێ جاریش لاسایی کێشی نا دروستی گۆرانی فۆلکلۆری و شیعرێن لاوانەوە یان شایی دەکردەوە. شیعرەکانی هەمیشە لە گوڕاندا بوو، بەلام هەرگیز نەدەهاتە خوارەوە بۆ ئاستی دەستکردی.
یەك دنیا کتێبی فەلسەفی دەربارەی بیروبۆچوونی رەشبینانەو دەربارەی قودرەتی چارەنووسی حەتمی و "سەریەشەی ژیان" خوێند بووەوە. چونکە کەسێکی هەستیار بوو، بۆیە بەکەشفی ئەو مەسەلانە زۆر ناڕەحەت و نیگەران دەبوو. ئەو پووچی و بێهودەییەی لە دەوری خۆی دروستی کردبوو، گوشاری دەخستە سەر رۆحی. ماوەیەکی زۆر بە ترس و دوو دڵییەوە باسی ئەم قۆناغی (پەشێویە فیکرییە)ی خۆی دەکردو دەیگوت: "کاتێ بیرەوەرییەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی خۆم دەخوێنمەوە بەترس و لەرزەوە لە خۆم دەپرسم کە چۆن نەمردووم".
باوەڕی مەزەبی خۆی لە دەست داو بەدبەخت بوو، چونکە دەیویست ئیماندار بێ، پاشان هێور بووەوەو پاشتر بوو بە عارفێکی رەشبین. دەیویست تەماشاڤانی تێپەڕبوونی کەرنەڤاڵی ژیان بێ.
بیرو زمان و شێوازی (ژول لافورگ) بوو بە نموونەو سەرمەشقێك کە هەموو شاعیرانی دیکەی "قۆناغی بەهاسز"ی چاویان لێکردو قۆناغەکە بوو بەو قۆناغەی (R.m.Alberes نووسەری "ماجەراکانی فیکری سەدەی بیستەم" گوتەنی: "رۆشنبیران بێباکانە شانازیان بە بەهاسزی و خراپی خۆیانەوە دەکرد. قۆناغ قۆناغی پەرت بوون و پوکانەوەیەکی ئاڵۆزی ئاوێتە بەجۆش و خرۆشی سەرهەڵدانێکی تازە بوو کە ئایندەی روون نەبوو. باوەڕی ئاینی مردبوو. بیری پەنا بردنە بەر زانست و دۆزینەوەی رێگەی رزگاریش کە نزیکەی یەك سەدە خەڵکی مژوڵ کردبوو لە ناوچوو بوو، ئەم قۆناغە، قۆناغی داتەپین و بێبەهایی و حەساسییەتی ناسەغلەم بوو.

## مانیفێستی سیمبولیزم

کاتێ "ژول لاڤورگ" لە ساڵی ١٨٨٨دا، لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا مرد، ئیدی وشەی (انحطاط= بێبەهایی) وای لێهات دەرەقەتی ئەوە نەیات کە مەبەستی شاعیران دەربڕێ، یانی تینویەتی شاعیرانی نەدەشکاند، وەچەی نوێ دوو ساڵێك بوو بە وشەی (سیمبرلیزم ئاشنا بوو بوو.
سیمبولیستەکان بەر لە بەهاسزان سەرکەوتنیان بەدەست هێناو یاساو رێسای مکومترو گرنگتریان هەبوو، چونکە خوێندنەوەیان لەوان زیاتر و هەوەس و ئارەزووەکانیان لەوان کەمتر بوو، ئەمانیش تا رادەیەك هەمان ئامانجی شاعیرانی قۆناغی بەهاسزییان بۆ خۆ هەڵبژاردو کەوتنە بەرەڤانی لەو رەوتە شیعرییە تازەیەی کە لە زەمانی (بۆدلێر)وە هاتبووە ئاراوە. دوا بە

دوای ئەو وتارو گۆڤارانەی کە شاعیرانی لاو لە ساڵی ١٨٨٤ـەوە بڵاویان دەکردەوە، ئاقیبەت (ژان مورەئا)ی شاعیری یونانی نەژاد مانیفێستی قوتابخانەی تازەی لە ژمارەی ١٨ سێپتەمبەری ساڵی ١٨٨٦ی پاشکۆی ئەدەبی رۆژنامەی فیگارودا بڵاوکردەوە کە مشتومڕێکی زۆری لە ئەنجوومەنە ئەدەبییەکاندا نایەوە. (مورەئا) لەم مانیفێستەدا بۆ یەکەمجار زاراوەی سیمبرلیزمی سەبارەت بەم قوتابخانەیە بەکار هێناو لەوە بەدواوە قوتابخانە تازەکە بەو ناوە ناسرا. ئێستاش بەشێك لە مانیفێستی (سیمبولیزم) دەخەینە روو:

"پێشتر پێشنیازمان کردبوو کە وشەی سیمبولیزم تاقە گوزارشتێکە کە دەتوانێ ئارەزووە تازەکانی داهێنەرانی هونەر لە سەردەمی ئێمەدا نیشان بدات. ئێستاش دووپاتی دەکەینەوە کە هیچ پێویستییەك بە گۆڕینی ئەم وشەیە نییە.

جا وەکو چۆن لە هەوەڵی ئەم نووسراوەشدا گوتمان، ئارەزووە هونەرییەکانی هەر قۆناغێك، جیاوازی فیکری زۆر دەخەنەوە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەکانی ئەم قوتابخانە تازەیە پێویستە بچینەوە سەر هەندێ شیعری ئالفردوونیی، شەکسپیر، عارفان و سۆفیان و خەڵکانی کۆنتر لەوانیش "شارل بۆدلێر" بە مژدەبەری واقیعی ئەم قوتابخانە تازەیە دەژمێردرێ. "مالارمیە" مانای رازئامێزۆ پێناسە ناپەزێری پێ دەبەخشێت. بەر لە ئێستا بەیتی شیعر یاساو رێسای قورس و دژواری خۆی هەبوو. یەکەمجار "تیودوردو بانڤیل" بە قامکە ئەفسون ئامێزەکانی خۆی ئەو دژوارییانەی کەمترو هەموارتر کردبوو، لێ "پۆل ڤارلین" ئەم یاسا دژوارانەی بە تەواوەتی لابرد..... شیعری سیمبولیك کە دژمنی تیۆریانی فێرکاری و فەساحەت و زێدەرۆیی و حەساسیەتی دەستکردو وێنەگرتنی ئۆبجەکتیفە، هەوڵدەدات فیکر بە شێوەیەك نیشان بدات کە هەست بدوێنێ. لەلایەکی دیکەشەوە فیکر نابێ خۆی لە رازانەوەی شکۆو جوانی فۆرم مەحروم بکات. چونکە خەسڵەتی بنەڕەتی هونەری سیمبولیك ئەمەیە کە هونەرمەند تا تەسەوری (فیکری رەها) نەچێتە پێشێ. بۆیە لەم قوتابخانە هونەرییەدا، دیمەنێن سروشتی و جوڵەی کەسان و رووداوانی تەواو دیار، خۆ بەخۆ بوونیان نییە، بەڵکو برێك دیتنی دەرەکین و کار دەکەنە سەر هەستێن ئێمەو ئەرکیان نیشاندانی کۆمەڵە پەیوەندییەکی شاراوەیە کە ماکیان لە فیکردایە.

ئەگەر هەندێك خوێنەری کورت بین، ئەم تیۆرییە هونەرییەی ئێمە بە هەند وەرنەگرن، نابێ بەلامانەوە سەیر بێ. بەڵام چ دەکەی؟ مەگەر (شیعرێن پنداروس)، (هاملیتی شەکسپیر)، (فاوستی گوتە)ش رووبەڕووی هەمان ناڕەزایی نەبوو بوونەوە؟".

رێچکەو رێبازی سیمبولیزم لە ساڵی ١٨٩٠دا گەییە لوتکەی چالاکی و چەلەنگی خۆی. وەچەیەك لە شاعیران لە ساڵی ١٨٨٥ـەوە تا ساڵی ١٩٠١ کەوتنە پەیڕەوکردنی سێ پێشەوای گەورەی سیمبولیزم. زۆربەی ئەم شاعیرانە فەرەنسی نەبوون. بۆ نموونە چەند شاعیرێکی گەورەی بەلجیکی لە نێو سیمبۆلیستەکاندا بوون، لەوانە: ئیمیل ڤێرهارین و موریس مەترەلینگ. هەروەها چەند شاعیرێکی دیکەی ئەمریکایی و رووسی و یونانی-شیان لە نێودا بوو و بە شێوەیەکی گشتی سیمبولیزم شەقڵی جیهانی گرتبووەخۆ.

## (بنەماکانی سیمبولیزم)

**لە رووی فیکرییەوە، سیمبولیزم زیاتر لە سایەی کاریگەری فەلسەفەی ئایدیالیزمدا بوو کە لە میتافیزیکەوە ئیلهامی وەردەگرت و لە دەوروبەری ساڵی ١٨٨٠دا لە فەرەنسا رەونەقی پەیدا دەکردەوە.**

**رەشبینی رازئامێزی (شوپنهاور)ش کاریگەری زۆری کردبووە سەر شاعیرانی سیمبولیست. سیمبولستەکان لە (سوبجەکیتڤیزم)ێکی قووڵدا غەرق بوو بوون و لە پشت پەردەی خەیاڵەوە دەیانڕوانییە هەموو شتێك.**

**بۆ ئەو شاعیرانەی کە بەو جۆرە فەلسەفە رەشبینانە پەروەردە بوو بوون، هیچ شتێك لە دیکۆرێکی تەم و مژاوی و ئاڵۆزی ئەوتۆ کە هەموو هێڵە توندو بنجبڕەکانی ژیان لەخۆدا مەحو بکاتەوەو هیچ ژینگەیەك لە ژینگەی تاریك و روونی، لەبارترو گونجاو تر نەبوو. شاعیری سیمبولیست لەو جۆرە ژینگە ئاڵۆزەداو لەنێو خەونەکانی خۆیدا تەسلیمی ماخۆلانی خۆی دەبوو، کۆشکانی کۆنەو چۆڵ، شارانی وێران و گۆماوی مەنگی گەڵا بەسەردا رژاو، تروسکەی چرای شەوەزەنگ و تاپۆی جوڵەداری سەر پەردان و سەڵتەنەتی بێدەنگی و چاوانی لە ئاسۆ بڕاو.. هەموو ئەمانە جیلوەی ئەو جیهانە خەوناوی و نهێنی ئامێزە بوو کەلە شیعری سیمبولیستەکاندا دەبینرا. (جا لێرەدا نابێ کاریگەری ئیدگار ئالن پۆی شاعیرو نووسەری ئەمریکایی کە شارل بودلێر بەرهەمەکانی کرد بوو بە فەرەنسی فەرامۆش بکرێ).**

**خەون و خەیاڵ کە (پۆزەتیڤیزم)و (ریالیزم) دەیانویست لە ئەدەبیاتی وەدەرنێن، دووبارە لە رێگەی سیمبولیزمەوە هاتەوە نێو ئەدەبیات. هەڵبەتە سیمبولیستەکان نیازی ئەوەیان نەبووە کە بە تەواوەتی پەیوەندی لەگەڵ شیعری پارناسدا بپڕن و بگەڕێنەوە بۆ رۆمانتیزم. بۆ نموونە هەرگیز نایانەوێ ژیان و ژینامەو ئیعترافنامەی خۆ بنووسن و تۆمار بکەن. لە شرۆڤەی دیمەناندا نایەن فۆرمی پایەداری شتە مادییەکان راڤە بکەن و وێنەبگرن، بەڵکو گوزەری سەعاتان و وەرزو زەمانی زوو گوزەرو ئاهەنگ و ریتمی لە وەستان نەهاتووی ژیان شرۆڤەو شی دەکەنەوەو یاسا شاراوەکانی گەردوون و سروشت وێنە دەگرن. تەبیعە لە روانگەی ئەوانەوە جگە لە خەیاڵی جوڵەدار چ شتێکی دیکە نییە. چ شتێك پایەدارو سەقامگیر نییە، بەڵکو هەر شتێك بگری ئەوەیە کە ئێمە بە هۆی هەستەکانمانەوە دەرکی دەکەین. ئەوانەیە کە لە ناخی ئێمەدان. خودی ئێمەن!... جابیروبۆچوونی سیمبولیستەکان لەم رووەوە پتر لەعیرفان و سۆفیگەری رۆژهەڵات نزیك دەبێتەوە.**

**دەڵێن: بۆچوونی ئێمە دەربارەی سروشت، بریتییە لە ژیانی رۆحی خۆمان، ئێمەین کە هەست دەکەین و نەخشی روحی ئێمەیە کە لە شتاندا رەنگدەداتەوە، کاتێ مرۆڤ ئەو دیمەنانەی کە دیوونی، بەوپەڕی ناسکی دەرك دەکات، بەرجەستەی دەکات، لە راستیدا نهێنییەکانی روحی خۆی ئاشکرا دەکات. بە کورتییەکەی هەر هەموو سروشت رەمزو سیمبولی بوون و ژیانی خودی مرۆڤە. وێنەگرتنی شتان و رووداوان بەهۆی رەمزەوە شێوەیەکی تازە وەردەگرێ. بۆ دەربرینی پەیوەندی نێوان ئیلهام و فۆرم و شێوەکان، دەبێ زمانی شیعر تێك بدرێ و بە شێوەیەکی تر**

دروست بکرێتەوە. دیارە ئەم زمانە بۆ خەڵکانی ئاسایی زۆر نا مەفهووم دەبێت و نهێنی سیمبولیزم لەم شتە نا مەفهوومانەدایە. ژمارەیەك لە سیمبولیستان و لە سەرووی هەموویانەوە (مالارمیە) پەیڕەوی ئەم یاسایەیان دەکردو وشەو زاراوەو دەستەواژەی وەهایان بەکاردێنا کە هەر خۆیان لێی تێدەگەیشتن و شرۆڤەیان دەکرد. تەنانەت ئاندریە جید لە پێشەکی بەرهەمێکی خۆیدا بەناوی (پالود- Paludes) دەڵێت: "پێش ئەوەی بەرهەمەکەم بۆ خەڵکی شرۆڤە بکەم، حەز دەکەم خەڵکی ئەم بەرهەمە بۆ من شەرح بکەن".

بە گوێرەی ئەو رستەیەی سەرێ پیاو دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە هەندێ جار تەنانەت خودی سیمبولیستەکانیش نەیانتوانیوە بەرهەمەکانی خۆیان راڤەو شرۆڤە بکەن.

لە هەمان کاتدا سیمبۆلیستەکان حەزیان دەکرد هەموو رێساکانی دەستووری زمان بگۆڕن. بەر لە سیمبولیستەکان پرەنسیپی ماقووڵ و ئاسایی بەسەر پەیوەندی وشەێن زمانەوە زاڵ بوو. لێ سیمبۆلیستەکان پێیان وابوو ئەم پرەنسیپانە دەبێ تەنیا هەست پەزێر بن و وشە نابێ لە رووی رێزمانی مەنتیقییەوە بدرێنە دەم یەکەوە، بەڵکو دەبێ بەو جۆرەی کە شاعیر هەستی پێدەکات بدرێنە دەم یەکەوەو رستەیان لێ دروست بکرێ.

نیشاندانی خەیاڵاتی ئاڵۆزی سیمبۆلیستان بە زمانێکی ئاشکراو بنجبڕی ئەوتۆ کە بتوانێ هەموو شتێك نیشان بدات و ئەنجامی بنجبڕو ورد لەم نیشاندانە بەدەستەوە بدات ئیمکان نەبوو. جا بۆ دەربڕینی ئەم خەیاڵاتە زیاتر پەنا وەبەر شیعرێك دەبرا کە لە نەرمە گۆرانییەکی هێمن و ئاڵۆز بچێ، ڤارلین گوتەنی: "مۆسیقایەکی بێ ئاواز" بێ. دەیانگوت شیعریش دەبێ وەکو مۆسیقا ئاڵۆز بێ، مەبەستێکی ئاشکراو راستەوخۆ دەرنەبڕێت، بەڵکو بە یارمەتی ئاهەنگ و ریتم و بە زەبری خەیاڵات کار لە مرۆڤ بکات. وەکو مۆسیقای (ڤاگنر)، پاش ئەوەی بەربەرەکانییەکی زۆرکرا، ئەنجام سەرکەوتنی بەدەست هێناو بە گەرمی پێشوازی لێکراو شاعیران و هونەرمەندان بۆ ماوەی چەندینساڵ لە ژێر کاریگەی ئەودا بوون و یەکێك لە گۆڤارە هەرە گرنگەکانی سیمبولیستەکان کە لە ساڵی ١٨٨٥دا دەردەچوو ناوی: "La Revue Vagne rienne" بوو.

سیمبولیستەکان دەیانگوت کە وەزنی شیعری خەیاڵ لە جوڵە دەخات و باڵی خەیاڵ دەکات. هەروەها رەنگێن توخ و زەقی مەبەست بە شێوەیەکی بنجبڕ دەردەبڕێ و پێچەوانەی سیمبولیزمە. شیعر نیگارکێشی نییە، بەڵکو جیلوەیەکی حاڵاتی رووحییە، مەیدانی شیعر لەوێوە دەست پێدەکات کە پەیوەندی دەگەڵ حەقیقەتی واقیعدا ببڕێ و ئەم مەیدانە تا هەتا هەتایە بەردەوام دەبێ. ناتوانرێ بگوترێ کە مانای فلان دەستەواژە لە شیعردا دروست ترە لە فیسار دەستەواژەو دەربڕین. ئەم داوەرییە گشتییە پەسەند ناکرێ چونکە هەر خوێنەرێك بە پێی سەلیقەی خۆی شیعر دەرك دەکات یان بەگوتەیەکی باشتر هەستی پێ دەکات. ئامانجی شیعری سیمبۆلێك ئەمەیە کە شکۆی گەورەیی هەست و خەیاڵ بەشرۆڤەی روون و ئاشکرا لە نێو نەبەین و بۆ ئەم کارەش پێویستە ژینگەیەك بخوڵقێنین کە شیعری تیا بڕسکێ، یانی هێڵێن زیندوو و ئاشکراو زۆر روون نەهێڵین و غەرقی تەمتومانی بکەین. ئەم لێڵی و تاریك و روونە، بە گۆڕینی رێساکانی کلاسیك، توڕدانی مانای ئاسایی و، تێك شکانی دەستوورەکانی زمان دێتە دی.

ژمارەیەك لە سیمبولیستەكان دەستكاری كێشی شیعریانیش كردو قافیەیان گۆڕی، بەمجۆرە لە نێو سیمبولیستەكاندا دوو ڕێچكەی جیا پەیدا بوو:

یەكەم: ڕێچكەی (مالارمیە)و (ڕنەگیل) كە پێیان وابوو زمانی هونەری لە زمانی عەوام جیایەو بە پێویستیان دەزانی زمانێكی جیا لە زمانی عەوام بۆ نیشاندانی سۆزو گودازو هونەركاری سیمبولیستی دابهێنرێ. ئەمانە قاڵب و فۆرمی شیعری ڕومانتیكی و پارناسییان پێ قەبووڵ بوو و لێی ڕازی بوون.

دووەم: ڕێچكەی ڤارلین و ژول لافورگ ئەمانە گاڵتەیان بە ڕەسەنایەتی ڕۆشنبیرییانەی زمان و تەرزی دەربڕینی پارناسینەكان دەكردو هەوڵیان دەدا زمانی ئاسایی و عامیانەی خەڵكی بەشێوەیەكی هونەریانە بەكار بێنن. ئەمانە لە هەمان كاتدا كەوتنە بیری ئەوەی كە قاڵبە شیعرییە باوەكان تێك بشكێنن و بەو جۆرە مەسەلەی (شیعری ئازاد) هاتە ناو ناوانەوە.

## شیعری ئازاد

ئەو شاعیرانەی كە لە هەوڵی ئەوەدا بوون شیعر لە قاڵبی سنووردارو باوی خۆی ئازاد بكەن، هاتن نەزمی (ئالكسا ندرون)= نیوە بەیتی ١٢ هیجایی)یان كە قاڵب و فۆرمی ئەسڵی شیعری فەرەنسی بوو، تێك شكاندو لەجیاتی ئەوە قاڵبی جۆراوجۆریان بۆ شیعر هێنایە ئاراوە. بەیتی كورت و درێژو نایەكسانیان داهێناو ژمارەی هیجایەكانیان بە ڕادەیەك زیادكرد كەتا ئەو ڕۆژە لە دنیای خەیاڵیشدا پێشینەی نەبوو. زەرورەتی دابەشكردنی شیعریان بەسەر بەیتی یەكساندا ڕەتكردەوە، قافیەیان سادەتر كردو كۆمەڵێك قافیەی نوقستانیان لە جێی دانا. (ڤارلین) لێرەدا وەستا، بەڵام پێشڕەوی هەر بەردەوام بوو، و (شیعری ئازاد) ئەنجامی ئەم پێشڕەوییە بوو.

(شیعری ئازاد) بریتییە لە چەند پارچە بەیتێكی وەزنداری نایەكسان. لەم شیعرەدا یەكێتی قاڵب و فۆرم نییە، یەكێتی شیعر، بەو یەكێتیی فیكرو خەیاڵ و وێنانە دیاری دەكرێ كە لە شیعرەكەدا هەن. كورتی و درێژی بەیتەكانیش بەندە بە واقیعی نێوەڕۆكی ئەو بەیتانەوە. ئیدی شاعیر مەجبور نییە بۆ تەواو كردنی هاوسەنگی بەیتەكانی خۆی وشەی زیادە بێنێتەوە، ئەوەندەی وشان گەرەكە كە مەبەستەكەی بدات بە دەستەوە. هەڵبەتە (واڵت ویتمن- ١٨١٩-١٨٩٢)ی شاعیری ئەمریكاییش هەمان ڕێچكەی گرتبوو، بەڵام دەتوانرێ بگوترێ كە یەكەم شیعری ئازادی فەرەنسی لە شیعرەكانی (واڵت ویتمن) بێ ئاگابووە. ئارتور رامبو لە ساڵی ١٨٨٦دا یەكەم شیعری ئازادی گوتووەو دوای دوو یان سێ ساڵ زۆربەی شاعیرانی دیكەش ڕوویان كردۆتە شیعری ئازادو هەوڵیانداوە لە ناو خۆیاندا یاساو ڕێسایەكی بۆ دابنەن. هەوەڵین وتارێن ئەوانە لە ساڵانی ١٨٨٦ و ١٨٨٩دا بڵاوبوونەتەوە. باشترین داوەری شاعیری ئازاد (گوستاڤ كان) بوو. (كان) لە پێشەكی بەرهەمێكی خۆیدا بەناوی "Lespalaisnomades"و لە ساڵی ١٨٨٨دا لە گۆڤاری "*Revuoindependante" شیعری ئازادی بە چاكی شەرح و شرۆڤە كردووەو بەرەڤانی لێكردووە.

وەکو لە بەرهەمو نووسینی سیمبولیستەکاندا دیارە، شیعری ئازاد بووە باعیسی ئەوەی کە "وشە" بە گوێرەی ئەو ریتمو ئاوازەی لە شیعەرەکەدا هەیەتی، نرخو بایەخ بە دەست بێنیّ. شیعری فەرەنسی بە تێپەڕبوونی زەمان شێوەی جۆرە هونەرێکی تێوری وەرگرتبوو. عەروزی شیعر پڕ بوو لە یاساو رێسای عەجیبو غەریب (وەکو جووت نەبوونی قافیەی وشەی نێر لەگەڵ قافیەی وشەی مێدا یان هەندێ قەراردادی دیکەی لەو بابەتە.)

فۆرمی رێنووسی شیعریش، وەکو فۆنەتیکەکەی، هەلومەرجێکی بۆ شیعر هێنابووە ئاراوە، لەتۆ وایە شیعر پتر بۆ لەزەتی چاوو بینین نووسراوە نەك بۆ لەزەتی گویّ و بیستن..

سیمبولیزم برەو رەواجی بە بۆچوونەکانی بۆدلێر لەمەڕ (مۆسیقای وشە) لە شیعرا داو ریتمی وشەی روونکردەوەو مۆسیقای تایبەتی بە بەتی شیعر بەخشیو هەڵبەتە ئەم مۆسیقایە زادەی پەیوەندی نێوان ریتمەکان بوو. ئەم مۆسیقای وشەیەش پتر بۆ بەهێز کردنی توانای دەربڕین بەکار دەهێنرا. بەکارهێنانی سەرواو دووبارە کردنەوەی هەندێ پیتی دیاریکراو لە بەیتێکداو، بەکارهێنانی وشەیێن هاوئاهەنگو رەوانی رستەیێن شیعری، کۆمەڵێك توانای وێنەگرتنو دەربڕینی بۆ شاعیر فەراهەم کرد.

## "سیمبولیزم لە جیهانی شانۆدا"

سیمبولیزم بۆ سەر تەختەی شانۆش تەشەنەی کرد، جگە لە چەند نووسەرێکی وەکو (رمی دو گورمون)و (ژول لافورگ)و... هتد. کە شانۆنامەی سمبولیکیان نووسیو کارەکانیان خرایە سەر تەختەی شانۆ، دەتوانین باشترین نموونەی شانۆنامەی سیمبولیك لە نێو بەرهەمەکانی موریس مەتەرلینگی بەلچیکیدا بەدی بکەین. شانۆنامەکانی مەتەرلینگ لەسەر بناغەی ئەم تێورییە عیرفانییەی سیمبولیزم رۆنراون: ئەو شتانەی کە دەیانزانین لە چاو ئەوانەدا کە نایانزانین ناکەنە هیچ، هەموو شوێنێك تەژی نهێنیانە، کۆمەڵێك هێزی گەورەی نادیارو شوومو خایەن لە دەوروبەرمانن کە هەموو رەفتارو جمو جۆڵێکمان تاقیب دەکەنو دژمنی چەلەنگیو ژیانو شادیو شادمانین. ئەرکی شانۆنامەنووس ئەمەیە کە بیروهزری خۆی دەربارەی ئەم هێزە نادیارانە ئاوێتەی ژیانی واقیعی بکات.

هەموو شانۆنامەکانی مەتەرلینگ لێکدی دەچن. بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی یەکەمین شانۆنامەی ئەو (شازادە خانم مالن) بدەین دەبینین لە هەوەڵی ئەم شانۆنامەیەوە تا کۆتایی، هەمان هێزی نادیار کە مرۆڤ دێنێتە لەرزینو بە دووی خۆیدا بکێشی دەکات، مایەی سەرنجە، ئەو هێماو سیمبولە راز ئامێزانەی کە جار جاریّ بەدیاردەکەون، هەستی مرۆڤانی دەخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. ئەو دەنگەی کە لە گیانەوەران یان شتانەوە دەردێ ئاماژەیەکە لەم جیهانە رازئامێزەوە. کاراکتەرانی شانۆنامە کە لە کەسانێك دەچن کە بەدەم خەوەوە رێدەکەنو هەموو ساتێ وا دێنە بەرچاو کەبە ترسەوە لەو خەوە بێدار بوونەتەوە. بۆ نیشاندانی هێزی نادیار پێویست بەوە نییە بابەتێن تراژیدی دروست بکریّ، چونکە لە ناو ئاسایی ترین رووداوێن ژیانیشدا ماکێکی تراژیدی هەر هەیە.

مەرگ لە هەر ساتێکی ژیاندا لە پاڵماندایەو چاوە نۆڕمان دەکات. ناتوانرێ خودی خۆی بە ئاشکرا نیشان بدرێ بەڵام دەتوانرێ سوڕانەوەی ئەوو ئەو دەنگەی کە لە کاتی دانیشتنی ئەودا لە کورسییەکەوە بەرز دەبێتەوە، لە نووسیناندا بەرجەستە بکرێ تا خوێنەر هەستی پێ بکات. زۆرینەی ئەو شانۆنامانەش کە پاش (شازادە خانم مالن) بڵاو بوونەوە، لە سایەی کاریگەری هەمان هزرو خەیاڵو ترسدا بوون.

یەکێك لە شانۆنامە زۆر بەناوبانگەکانی مەتەرلینگ، شانۆنامەیەکی چکۆلەیە بەناوی (interleur=ئەندەروون). ئەم شانۆنامەیە خانەوادەیەکمان نیشاندەدات. ئەم خانەوادەیە هێشتا بێ خەبەرە لەوەی کە یەکێك لە مناڵەکانی کەوتووەتە ئاوەوەو خنکاوە. بەڵام لە ماوەی ئەو چەند دەقیقەیەی نێوان خنکانی مناڵەکەو ئاگاداربوونی خانەوادەکە لەم رووداوە، لە رێگەی هەندێ هەڵسوکەوتی لاشعورییەوە، پەشێوی‌و پەریشانییەکی ئاڵۆزو نامەفهوم باڵ بەسەر ئەندامانی خانەوادەی ناوبراودا دەکێشێت‌و هەر چەندە هێشتا بە تەواوی هەواڵی رووداوەکە نازانن، بەڵام هەستدەکەن کە بەڵایەك بەرە بەرە نزیك دەبێتەوە.

ئەم شانۆنامانەو ئەوانەی پاشتر بڵاوبوونەوە، هەر هەموویان لە زەمینەی خەیاڵی و نادیاردا لە قۆناغێن نامەعلوومدا، لە کوچك‌و کۆشکێن رازئامێزۆ شکەفت‌و غارێن سەیرو سەمەردا روو دەدەن. نووسەری سیمبولیست پێویستی بە نیشاندانی ئەم کات‌و شوێنانەش نییە. چونکە بە باوەڕی ئەو ئەم هێزە پەنهان‌و نادیارە هەمیشە هەیەو لە هەموو کات‌و شوێنێکدا بەسەر مرۆڤدا زاڵە.

## کورتەی پرەنسیپەکانی سیمبولیزم

بەپێی ئەو راوبۆچوونانەی سەرێ، دەتوانرێ ئەو پرەنسیپانەی سیمبولیستەکان رەچاوی دەکەن بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

١- حاڵەتی خەمبارو پرسەئامێزی سروشت‌و ئەو دیمەن‌و رووداوانەی کە مایەی نائومێدی‌و عەزاب‌و نیگەرانی‌و ترس و دڵەڕاوکێی مرۆڤە دەردەبڕن.

٢- بایەخ بەو فۆرم‌و رەمزو هێماو ریتم‌و یاسایانە دەدەن کە ئەقڵ‌و لۆژیك قبووڵیان ناکەن، بەڵکو تەنیا هەست پێیان قاییل دەبێ.

٣- هەر خوێنەرێك بەگوێرەی دەرك‌و هەستی خۆی لە هەر دەقێکی ئەدەبی دەگات. بۆیە پێویستە بەرهەمێکی ئەوتۆ دابهێنرێ کە هەر خوێنەرێك بەپێی وەزعی رۆحی خۆی‌و ئاستی تێگەیشتنی خۆی شی بکاتەوەو لێی حاڵی ببێ‌و ماناو چەمکێکی دیکەی تیا بدۆزێتەوە.

٤- پێویستە تادەکرێ لە واقیعی بابەتی دوورو لە واقیعی زەینی نزیك بێ.

٥- مرۆڤ گیرۆدەو دەستەمۆی کۆمەڵێك هێزی نادیارو شوومە کە چارەنووسی ئەوو تەبیعەتی لە دەستدایەو دیاری دەکات، بۆیە حاڵەتی مەرگ ئامێزو ترسناکی ئەم هێزانە لە میانی جۆرە خەون‌و خەیاڵ‌و ئەفسانەیەکەوە دەردەبڕن.

٦- هەوڵدەدەن حاڵاتی نائاسایی روحیو ئەو زانیارییە کوتوپڕانەی کە لە ویژدانی مرۆڤدا سەر هەڵدەدەنو حاڵاتی پەیوەست بە هێزێن موگناتیسیو گواستنەوەی فیکری لە شیعرو بەرهەمەکانیاندا دەربڕنو بئافەرێنن.

٧- بە کۆمەکی هەستو خەیاڵ، حاڵە رووحییەکان لە نێو ئازادی تەواودا بە مۆسیقای وشەو بە ریتمو رەنگو هەڵچوون وێنە دەگرن.

## ( سیمبۆلیزم لە سەدەی بیستەمدا )

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا وەها دەهاتە بەرچاو کە سیمبۆلیزم قۆناغی خۆی تەواو کردووەو لە نێو چووە.

شاعیرانی وەکو: (ژان مورەئا)و (هانری دورنیە) کە مەنشورترین نوێنەری قوتابخانەی نێو براو بوون پشتیان تێکردبوو و سەنگەریان لێ گرتبوو، و لە ساڵانی ١٩٠٠و ١٩٠١دا کۆمەڵێك بەرهەمیان بڵاوکردەوە کە خۆی لە خۆیدا راگەیاندنی گەڕانەوەیان بوو بۆ قوتابخانەی کلاسیزم، دوای چەند ساڵێکی دیکەش دەستەی (Abbaye) پێکهات کە بریتی بوون لە: (ویلدراك، دوهامل، ئارکۆ، رومن) ئەمانە شەقڵی کۆمەڵایەتییان بەشیعر بەخشی.

لێ هیچ یەکێك لەم رێبازە تازانە نەیدەتوانی کاریگەری شیعرێن (ئارتور رامبو، ستیڤان مالارمیەو تەنانەت موریس مەتەرلینگو ژول لاڤورگ بسڕێتەوە. جا لەم بەینەدا ئاندریەجیدو پۆل کلودڤیل و پۆل ڤالیری-ش لە بواری ئەفراندنی بەرهەمێن سیمبولیکدا لە چالاکیدا بوونو دەیانویست پایەی شیعری مامۆستایانی خۆیان باشتر نیشان بدەن.

لە ساڵی ١٩٠٦دا کۆمەڵە شاعیرێك لە دەوری گۆڤاری (فالانژ)دا خڕبوو بوونەوەو رایانگەیاند کە درێژەپێدەری سیمبولیزمو شەیداو مەفتونی مالارمیە-ن.

پاشان چەند گۆڤارێکی دیکەش دەرچوون، تا لە ساڵی ١٩٠٩ بە دواوە گۆڤاری ( Nouvelle Revue Francalse) دەرچوو و کەوتە هەولی زیندووکردنەوەی سیمبولیزمی (ئارتور رامبو). (ئاندریە جید) لە ریزی پێشەوەی بەرێوەبەرانی گۆڤاری نێو براو بوو. ئەم رێبازو رەوتە کە لە ساڵی ١٩١٠وە ناوی (سیمبولیزمی نوێی) گرتەخۆ، بەرەبەرە شێوەیەکی قورسترو ئاڵۆزتری بە شیعردا.

لەم زەمانەدا تاقە شاعیرێك کە پتر لە هەر کەسێکی دی، مەسەلەی شیعری لە دیدی فەلسەفەی رۆشنبیرانەوە دەدایە بەر باسو شیکردنەوە (پول فالیری ١٨٧١- ١٩٤٥) بوو. (ڤالیری) شیعری بەشتێکی وەکو وازی یان سرووتی ئاینی دەژماردو دەیگوت شیعر چ ئارمانجێکی نییە جگە لە خودی خۆی، نابێ کەس بیر لە ئەنجامی شیعر بکاتەوە. شیعری بە سەماو پەخشانی بەڕێکردن دەشوبهاندو دەیگوت رێکردن بەرەو مەبەستو مەنزڵێکە، بەڵام سەما هیچ مەبەسو مەنزڵێکی نییە، دیارە بەدەم سەماوە رۆییشتن بۆ شوێنێك دەبێتە مایەی پێکەنین، کەواتە ئارمانی سەما خودی سەماکە خۆیەتی. وشە، بریتییە لە هەنگاوەکان یان جوڵەکانی سەما. و شیعر بەوە لە پەخشان جیا دەکرێتەوە کە لە پەخشاندا وشە جگە لە

دەربڕینی مەبەست چ کارێکی دیکەی نییە، بەڵام لە شیعردا وشە بایەخی راستەقینەی خۆی پەیدا دەکات و شاعیرەکە ئەم هێزە "جادووییە" بە وشە دەبەخشێت.

لەگەڵ ئەمەشدا، (ڤالیری) باوەڕی وابوو کە ئەگەر شیعر کامڵترین و خاڵیسەترین هونەر بێ، لەبەر ئەمەیە کە ناچارە مل بۆ کۆمەڵێك یاساو رێسای جۆراو جۆر بدات و، ئەم یاساو رێساو ناچارییە وا لە شاعیر دەکات بەنێو ئاپۆرای ئەو هزرو خەیاڵانە بکەوێ کە لە روحیدا شەپۆل دەدەن و زۆر بە وردی ئەو بابەتانەیان لێ هەڵبژێرێ کە دەبێ بگوترێن و بنووسرێن.

بەبۆچوونی ڤالیری، ئیلهام- یان ئەو شتەی بەو ناوەوە باس دەکرێ- هیچ جۆرە کاریگەریی و بایەخێکی لەداهێنانی هونەریدا نییە، ئیلهام لە روانگەی ڤالیرییەوە بریتییە لە حاڵەتێك کە "هەستی داهێنەر" لە ئاستی "میکانیزمی مێشکدا" چ کاریگەرییەکی نامێنێ. (غەریزە) حەیوانی ترین بەشی روحی بەشەرییەو، ئەو ئیلهامانەی کە زادەی غەریزەکانمان بن دەکەنە "گیاکەڵەی هەستی ئێمە".

شیعرەکانی خودی (ڤالیری) پڕن لە لێکچوون و خواستن و زۆربەیان وەکو "گۆڕستانی دەریایی" بە جۆرێکن کە بەبێ تەفسیرو شرۆڤە بە هیچ جۆرێ قابیلی تێ گەیشتن نین.

## سیمبولیزم لە وڵاتانی دیکەدا

## سیمبولیزم لە رووسیادا

پێویستە سیمبولیزمی روسیا بە یەکێك لە درەخشانترین قوناغەکانی شیعری رووسی بێتە ژماردن، سیمبولیزم لە رووسیادا درەنگترو زیاتر لە ژێر کاریگەری فەرەنسادا دەستی پێکرد، بەڵام شێوەیەکی تایبەت بەخۆی هەبوو و لەساڵی ١٨٩٥ـەوە تا ١٩١٢ فەرمانڕەوای ئەدەبیاتی ئەو وڵاتە بوو. تەنانەت لە مەیدانی شیعریش هێوەتر چووو شێوەی رابوونێکی ئەخلاقی و هزری بەربڵاوی وەرگرت.

کەسێك کە بەر لە هەمووان هەستی بەم راپەڕینەی سەرەتای سەدەی بیستەم کرد، شاعیرو رەخنەگرو فەیلەسوفی ناوداری رووسی (فلادیمیر سولوفیف) بوو کە دەیگوت ئاینده لەبەرچاوی ئاڵۆزو بە تەمتومان و رازئامێز دەنوێنێ.

سولوفیف بەر لە هەر کەسێکی دی ئاسمانێکی خوڵقاند کە سپێدەی قوتابخانەیەکی نوێی شیعر لەوێندەرەوە هەڵات و سێ شاعیری ناودار، واتە (ئالکساندەر بلوك) و (ئاندرێ بیلی)و (ڤیا چسلاڤ ئیڤانۆڤ) دەرکەوتن و کەوتنە پەیڕەوکردنی شێوازی (سولوفیف). ئەم شاعیرانە لە سەرەتای کاریاندا یەجگار لاو بوون، گەورەترینیان (ئیڤانوف) بوو کە تەمەنی (٢٠) ساڵ بوو. ئەم سیانە کتێبی زۆریان خوێندبووەوەو بە تەواوەتی لە فەلسەفەدا قووڵ بوو بوونەوە. ئەوەی سەیرە وەختێ کە دەست بەکار بوون هەسێکیان یەك رێبازیان گرتبووە بەر بێ وەوەی لێکترەوە نزیك بن. (ئیڤا نوف) لە دەرێی رووسیا بوو، (بلوك) لە مۆسکۆ بوو (بیلی) لە پترزبۆرگ دەژیا.

**له رووسیدا وشەی (سپێدە)و (شیعر)و (شۆڕش)و (ئەڤین) هەموو مێنو شاعیرانی ئەم قۆناغە بەزۆری "ژن" یان لە جیاتی ئەو شتانە بەکار دێنا.**

**شاعیرانی ناوبراو لایەنگری فەلسەفەی (تاکایەتی) بوون و زیاتر لە ژێر کاریگەری هەستو سۆزدا بوون تا مەنتیقو لۆژیك. لەم لاشەوە ریالیستەکان کە لەو دەورو زەمانەدا سەرگەمی سازدانی شۆڕشی کۆمەڵایەتی بوون دەمیان لە (شۆڕشی رۆحی) دەکوتاو ئەو ژیانە کارەساتاوییەیان لە کانگەی دڵەوە قبووڵ بوو کە گەنجایەتی ئەوانی بە فیڕۆ دەدا.**

**لە ساڵانی ١٩٠٠– ١٩٠٣دا سیمبولیستەکانی مۆسکۆ لە دەوری یەکدی خڕبوونەوەو بە زۆری لە ماڵی (ئاندرێ بیلی)یان (بالمونت) کە ئەویش لە شاعیرە ناسراوەکانی ئەم قۆناغە بوو، خڕ دەبوونەوە.**

**لێ ساڵی ١٩٠٣ کە (بیلی) ساڵی یادەوەری پێ دەگوت، لە هەمان کاتدا ساڵێ بوو کە قۆناغی (انحطاطی فیکری) بەرەو کۆتایی دەچوو. شۆڕش بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە بارودۆخی کۆمەڵایەتیو فیکری وڵاتی دەگۆڕی.**

**ژمارەیەك لە شاعیرانی (بەهاسن)و لە رۆشنبیرانی پەیڕەوی ئەوان کە نەیاندەتوانی بیرۆکەی شۆڕشو چالاکی ئیجابی لە زەینی خۆیاندا جێ بکەنەوە، کەوتنە باوەشی گەندەڵییەوەو پەنایان وەبەر خوێندنەوەو نووسینی رۆمانێن پۆلیسیو سێکسی و تەنانەت خۆکوژی بردو، ژمارەیەکیش کە گوڕوتینی ژیانیان لەخۆدا دەبینی بیروباوەڕیان گۆڕی، کە یەکێك لەوانە "بلۆك" بوو کە لە ساڵی ١٩١١دا لەنووسینێکدا دەڵێت: "من لەتەمەنی سیو یەك ساڵیدا گۆڕانێکی گەورە لە خۆمدا دەبینم، وا دەزانم کە دوا سێبەری (بەهاسزی) ئاوا بووەو من دەمەوێ بەشێوەیەکی ئیجابی بژیم.**

## سیمبولیزم لە ئینگلیستانو ئەمریکادا

**یەکێك لە هەوەڵین پێشەنگانی سیمبولیزم لە ئینگلیستانو وڵاتانی ئینگلیزی زمانی دیکە شاعیرێکی ئیرلەندییە بەناوی ویلیام باتلەر ییتز ١٨٦٥– ١٩٣٩. بابی شێوەکارێکی یەجگار بەتوانا بوو و دۆستایەتی نزیکی دەگەڵ سیمبولیستانی فەرەنسی دا هەبوو. (ییتز) هەر لە منداڵییەوە لە کۆڕو مەجلیسی ئەواندا پەروەردە بوو و شارەزای زمانی سیمبولیستەکان بوو. (ییتز) کە پێشڕەوی خۆیبوونی ئیرلەندەش بوو لە ساڵی ١٨٩٢دا "ئەنجوومەنی ئەدەبی میللی ئیرلەندە"ی دامەزراندو بانگەشەی بۆ زەرورەتی هاوکاری نێوان نووسەرانو میللەت دەکرد. بابەتی سەرەکی شیعرەکانی ئەو بەرجەستەکردنی هیواو ئامانجو رەنجو دەردەسەری قەومی (سەلت)ە وەکو: (ئەڤین، دەردی غوربەتو هەڵاتنو رەڤین). عیرفانی ییتز "مەتەر لینگ" وەبیر خوێنەر دێنێتەوە. شاکاری ییتز بەیتی (سەفەرەکانی ئوسیان)ە. لە ساڵی ١٩٢١ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت. ییتز زۆر شانۆنامەشی نووسیوە کە بەناوبانگترینیان بریتین لە: "سەر زەمینی ئارەزووەکانی دڵ"و (ئاوەکانی زوڵمەت).**

لە ساڵی ١٩١٣دا کۆمەڵێك بە هاوکاری نووسەران و شاعیرانی سیمبولیستی ئەو زەمانە: (ئالدینگتون، لورنس، هوکسلی، بروك، وئیزرا پاوەند) دامەزراو بەرە بەرە بەناوی "رەمزییەکان"وە ناوبانگی دەرکرد. ئەم گروپە خۆیان لە شیعری مەجورەدی زەینی دەپاراست و هەوڵیاندەدا کە بیرو حاڵەتە دەرونییەکان راستەوخۆ بە زمانی شیعر دەربڕن و لەم رێگەیەوە قۆناغی کەف و کوڵی تەسەوراتی زەینی و هێماکان، بۆ دنیای دەرەوە بگەرێننەوە. لەم سەرو بەندەدا جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکردو زۆر کەسی ئەم گروپە تیا چوون و نەمان. "بروك ١٨٧٧- ١٩١٥" کەلە "دەردەنیل" کوژرا جگە لە چەند پارچە شیعرێك چیتری لە پاش بەجێ نەما. (سی. ئێچ. سورلی ١٨٩٥- ١٩١٥) بەو مەرگە رۆیی کە بە خۆی زۆرجار بە "سەتڵی خالی"و (تاوێری لووسی) شوبهاندبوو.

(ویلفریدوون ١٨٩٣- ١٩١٨) کە بەیتی "تەرجیع بەندی لاوانی مەحکوم"ی دەهۆنییەوە زمانی سەردەمی خۆی بەرجەستە دەکرد، نا ئومێدی و یاخی بوونی ئەو لە بەرهەمێن "پاشماوەکانی جەنگ"یشدا دیارە "ریچارد ئالدینگتون- ١٨٢٩-" لە بەیتی "مەرگی قارەمانێك- ١٩٢٩"دا، -کە بە هێزترو کاریگەرترین کتێبە کە بە زمانی ئینگلیزی دەربارەی جەنگ نووسرابێ- یاخی بوونی خەڵکی زەمانی خۆی، ئەو خەڵکەی لە چنگی ئەژدیهای جەنگ رزگار بوو بوون، نیشاندەدا، یاخی بوون لە درِندەیی و خوێن رشتن و کوشت و بڕی مرۆڤ و چەمکی ئاوەژوو کراوی (فیداکاری)و (گیانبازی لە رای نیشتمان)دا نیشاندەدا.

یەکێك لە رابەرانی راپەڕینی رەمزییەکان لە ئینگلیستان و ئەمریکادا "ئیزراپاوەند ١٨٨٥-"ی شاعیری ئەمریکایی بوو کە وەکو نارەزاییەك وڵاتی خۆی بەجێهێشت بوو و پەنای وەبەر ئینگلیستان بردبوو. ئیزراپاوەند بە حوکمی ئەو دەسەڵات و کاریگەرییەی بەسەر شاعیرانی لاوی سەردەمی خۆیەوە بوویەتی بە گەورەترین شاعیری زەمانی خۆی دێتە ژماردن. ئیزرا پاوەند بەرەبەرە لە راپەڕینی رەمزییەکان دوور کەوتەوەو بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە باوەڕیان بە سادەیی گوزارشت و دەربڕین هەبوو، شێوازێکی هێنایە ئاراوە کە تەژی وشەی قەبەو قەڵەوو دەستکردو ئاڵۆزو نامەفهوم بوو. بۆ تێگەیشتن لە شیعرێن (پاوەند)و پەیڕەوەکانی نەك هەر پێویست بە واژەنامەیەکی گەورە هەیە بەڵکو دەبێ کتێبخانەیەکی تەژی بەرهەمی ئەدەبی و مێژوویی و جوگرافیایی فەلسەفی لەبەر دەستدا بێ. کۆمەڵە شیعرەکەی بەناوی: "Pisancatos"وە بڵاوبووەتەوە.

یەکێك لە نێودارترین پەیڕەوانی "ئیزرا پاوەند" شاعیرێکی دیکەی ئەمریکایی بوو بە نێوی "T.SELiot"کە دەسەڵاتی شیعری و کاریگەریی هونەری ئەو بەسەر شاعیرانی لاوو راپەڕینی رەمزییەکانەوە لە (پاوەند) کەمتر نەبووە. شیعرەکانی ئەو روونترو مکومترن لە شیعرەکانی "پاوەند"و هیچ هەوڵێك بۆ ئاڵۆزاندنی پەیف و واتا لە شیعرەکانیدا بەدی ناکرێت. ئیلیوت لەو رووەوە کە بایەخی زۆر بە (هەرسی بابەتی شیعری) دەدات و بەرەڤانی لە (مکومی دەربڕین) دەکات، زۆرجار بە (پۆل ڤالیری) دەشوبهێنرێ.

جیاوازی هەرە گەورەی ئەو دەگەڵ (ڤالێری)دا لەمەدایە کە (ئیلیوت) باوەڕی وایە (بەشەرییەت بەبێ ئاین بێ مەعنایە). بۆیە شیعرەکانی کە بە زۆری ستایشی مەزهەبی کاتۆلیك دەکەن، لە رووی ناسکی (هەست)و قووڵی "هزر"ەوە ناگەن بە شیعرەکانی (ڤالیری). ئیلیوت لە ساڵی ١٩١٣ وە لە ئەمریکاوە رۆیی بۆ ئینگلیستانو بوو بە هاووڵاتی ئەوێندەر. لە ساڵی ١٩٤٨دا لەسەر شیعرەکانی خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.

دەکرێ کورتەی بیروباوەڕو پرەنسیپی تیۆری سیمبولیستەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا بەرجەستە بکرێ:

١- بەکارهێنانی زمانی قسەکردن بە مەرجێك هەر وشەیەك مانای وردی خۆی بگەیەنێ.
٢- داهێنانی کێشی تازە، لێ بێ پشت بەستن بە شیعری ئازاد.
٣- ئازادی لەهەڵبژاردنی هەر بابەتێکدا بۆ شیعر.
٤- دەربڕینو نیشاندانی "وێنەی شیعری"و (خواستن) –شیعر نابێ بکەوێتە شرۆڤەی کولیاتی ئاڵۆز هەر چەندە بەشکۆو ئاهەنگداربێ.
٥- خوڵقاندنی شیعری مکومو زبرو روون- شیعر هەرگیز نابێ سستو ئاڵۆز بێ.
٦- "تەمەرکوز" کرۆكو جەوهەری بنەڕەتی شیعرە.

## " سیمبولیزم لە ئەڵمانیادا"

ئەدەبیاتی ئاڵمان کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا کەوتبووە هەمێزی ناتورالیزمو (رۆمانیتزمی نوێ)وە لە ماوەی سالانی ١٨٧٠و ١٨٩٠دا تەقریبەن هیچ بەرهەمێکی سەرنج راکێشی بە خۆوە نەبینی، تا کارگەییە ئەوەی (نیتشەی فەیلەسوفو شاعیری گەورەی ئەڵمانی ١٨٤٤- ١٩٠٠) لە خۆی بپرسێت کە ئایا سەرکەوتنی سوپایی ئاڵمان "بەشکستو تەنانەت نابودی زەوقو هونەری ئەڵمانو بە قازانجی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا نەشکاوەتەوە". لێ پاش ساڵی ١٨٩٠، لە پاڵ رێچکەو رێبازانی ناتورالیزمو ئیمپرسیونیزم کە درێژەی بە رەوتی خۆی دەدا، گرنگترین نووسەرانو شاعیرانی ئاڵمانی هاوچەرخ هاتنە مەیدانەوە.

دیارترین شاعیری ئەم قوناغە (هۆفمانشتال ١٨٧٤- ١٩٢٩)ی نەمساوییە کە خۆی بە درێژەدەری شێوازی بۆدلێرو ڤارلین دەزانی، بەڵام هێشتا نەیتوانی بوو لە چنگی ناتورالیزمو رۆمانتیزمی قۆناغی بەهاسزی رزگاربێ.

ئەم کارە گەورەیە دەبوو لەسەر دەستی شاعیری بەتوانا (راینەر ماریا ریلکە ١٨٧٥- ١٩٢٦) کە ئەویش نەمساوییەکی خەڵکی پراگ بوو، ئەنجام بدرێ. ریلکە بە وڵاتانی ئەوروپادا سەفەری کردو بەشێکی ژیانی لە فەرەنسادا قەتاند. شۆرەت و دەسەڵاتی ئەو لە ئەدەبیاتی ئەوروپادا، بەر لە دەست پێکردنی دوا جەنگ لە برەودا بوو و بەلایەنگری (شیعری خالیسە) دەژمێردرا. بەرهەم و شیعرەکانی ریلکە بەزمانی ئەڵمانییەو دیوانێکیشی بۆ ئەو شیعرانە تەرخانکردووە کە بە زمانی فەرەنسی گوتوونی.

ریلکە لە ناو جەرگەی هونەرەکەی خۆیدا ژیاوەو لە شیعرەکانیدا زۆرجار ئەمەی گوتووە کە: "شیعر گوتن جیلوەی بوونە" باوەڕی وابوو کەشیعر بەرەنجامی هەستو سۆز نییە بەڵکو بەرەنجامی ئەزموونە. "بۆ گوتنی یەك بەیتە شیعر پێویستە زۆر شارو خەڵكو شتت بینی بێ" لێ ئەزموون لە روانگەی ئەوەوە ئەو رووداوانە نییە کە بەسەر کەسێکدا هاتبێ بەڵکو سوودێکە کە لەو رووداوانە وەردەگیرێ: "ئەگەر ژیانی رۆژانەت لەبەر چاوی خۆت هیچ نەبێ، خەتای ئەو مەگرە، خەتا خەتای تۆیە کە ئەوەندە شاعیر نیت تا شکۆو جوانی ئەو ژیانەت بدۆزیتەوەو کەشفی بکەی".

ریلکە وەکو گەورە عارفانی لای ئێمە باوەڕی وایە کە دەبێ لە خۆتا بۆ هەموو شتێك بگەڕێی و بیدۆزیتەوە، بەڵام نەك دانیشێتو چاوەنۆڕی یارمەتی میزاج بکەی. بەڵکو شاعیر پێویستە بە زەبری کار بتوانێ میزاجو تەبعی خۆی وەگەڕ بخات. یارمەتی تەبع بەلای ریلکەوە قسەی بێ مانایە. لە نامەیەکیدا بۆ (رودان) دەنووسێت: "من خۆم لە هەر هۆیەکی دەستکرد بۆ وەگەرخستنی تەبع پاراستووەو هەوڵم داوە کە ژیانی خۆم لە تەبیعەت نزیك بخەمەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم کارانەدا کە رەنگە ئاقڵانە بووبێ، هەرگیز نەمتوانیوە دولبەری خۆشڕەی تەبع بەکار بخەمە داوەوە. ئێستا دەزانم کە تاقە ئەوزاری راگرتنی ئەو (تەبع) هەر کارە".

بەرهەمەکانی دوا ساڵانی تەمەنی ریلکە ئەوەمان پێ دەڵێن کە ئەم شاعیرە خۆی لە کۆتو بەندی هەر قوتابخانەیەك ئازاد کردووەو گەییوەتە بەرزترین لوتکەی شیعر. پایەی ریلکە پاش "گۆتە" لە مێژووی ئەدەبیاتی ئاڵماندا بێ وێنەیەو ئەدەبیاتو پێشکەوتنی ئەدەبیاتی دواتری ئاڵمان قەرزارباری هەوڵی شەخسیو دەسەڵاتو کاریگەری بەرهەمەکانی ئەوە.

لە ساڵی ١٨٩٢ دا لە بەرلیندا هەوەڵین ژمارەی گۆڤارێك بەناوی (بەرپەڕێن هونەر) بڵاوبووەوە. ئەم گۆڤارە کە رابەری هونەرمەندانی لاوو پێشڕەوی لەئەستۆ گرتبوو بەناوبانگترین شاعیرانو نووسەرانی زەمانی خۆی لە دەوری خۆی خڕکردەوەو یەکەم ئاڵای (هونەر بۆ هونەر)ی لە دژی ناتورالیزمو پەیامی کۆمەڵایەتی ناتورالیزم هەڵکرد. دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری ئەم گۆڤارە شاعیرێکی لاو بوو بە نێوی (ستیڤان گیورگی ١٨٦٨- ١٩٣٣). گیورگی کە پێشتر سەفەری فەرەنسای کردبوو لە نزیکەوە ئاشنای شاعیرانی سیمبولیست بوو بوو و تەنانەت بەرهەمەکانی (ڤارلین)و (مالارمیە)شی تەرجەمەی زمانی ئاڵمانی کردبوو، خۆی بە موریدی شێوازی سیمبولیزم و تەنانەت قوتابخانەی پارناس دەزانیو شیعری خستبووە شێوەی مەزەبێکی تازەوە. ئامانجی گۆڤارەکەی ئەو "خزمەتی هونەر بوو. بە تایبەتی شیعرو پەخشانو دوور خستنەوەی کاروباری سەر بە سیاسەتو کۆمەڵگە". بە ئاشکرا دەیگوت کە "گۆڤارەکەمان ناتوانێ خۆی بە چاکبوونی جیهانو خەونی بەختەوەری کۆمەڵایەتییەوە خەریك بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو کاروبارانە زۆر جوانیش بن پەیوەندییەکیان بە قەڵەمڕەوی شیعرەوە نییە". ئەمەش ناوی هەندێ لە بەرهەمە هەرە بەناوبانگەکانیەتی: "ساڵی روح، ئەڵقەی حەوتەم، ئەستێرەی یەکیەتی". دەسەڵاتو ناوبانگی گیورکی کە لە نێو چینی خوێنەوارانەدا یەجگار زۆر بوو، پایەیەکی بەرزی بەشیعر بەخشی.

## سیمبولیزم لە ئەسپانیادا

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا، ئەدەبیاتی ئەسپانیا دژی ریالیزمو ناتورالیزمو فەلسەفی تەحوقوقی هەستاو شان بەشانی گۆڕانکارییەکانی ئەدەبی فەرەنسی بەرەو پێش هەنگاوی نا. سیمبولیستانی فەرەنسی و فەیلەسوفانی ئەڵمانو رۆماننووسانی رووسیەو (ئیبسن)ی نەرویجی و (ئوسکار والید)ی ئینگلیزیو (ئیدگار ئالن پۆ)و (والت ویتمن)ی ئەمریکایی دەبنە سەرچاوەی سەرۆو ئیلهامی بەرهەمێن نیوەی دووەمی سەدەی نوزدەیەمی ئەسپانیا. لەگەڵ ئەمەشدا ئەدەبیاتی ئەسپانیا رەنگو روو و شەقڵی ژینگەی خۆی لە دەست نادات و ئیلهام لە سەرچاوە لێوان لیوەکانی وڵاتی خۆی وەردەگرێت.

کۆمەڵێك بەرهەمی ناوازە بەرهەمدێنیٚو لەسایەی شکۆی شاعیرانو نووسەرانی تازەدا ئەو پایە بەرزەی کە پاش سەدەی هەڤدەیەم لە دەستی دابوو دووبارە بەدەست دێنێتەوە.

وەچەی ٩٨- داڕوخانی سیاسی و ئابووری ئەسپانیا لە ئاخرو ئۆخری سەدەی نۆزەدەیەمداو لە دەستچوونی کۆلۆنییە بەرینەکانی ئەسپانیا لە ئەمریکا، بووە مایەی ئەوە کە گروپێك لە نووسەرانی لاو بکەونە تاقیبی هۆو چارەسەری ئەو کارەو پرەنسیپی مەعنەوی دیکە لە جێی بنەماو باوەڕو پرەنسیپە کۆنەکان دابنەن. ئەم گروپە کە لە ساڵی ١٨٩٨ دامەزرا زۆر بە خێرایی بەناوی "وەچەی ٩٨"وە ناوبانگی دەرکرد. هەموو ئەندامانی ئەم گروپە نیگەرانی چارەنووسی ئەسپانیا بوونو لە خەمی مەسەلە گشتییەکانی ژیانو مرۆڤدا بوونو هەوڵیاندەدا بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە کۆنەکان شێوازێکی تازە بێننە ئاراوە. لەسەرتادا شاعیرێکی ئەسپانی زمانی خەڵکی (نیگاراگوای) سەر بە ئەمریکای ناوەندی، بەنێوی (روبن داریو ١٨٦٧- ١٩١٦) کە لە قوتابخانەی ئەدەبیاتی فەرەنسا پەروەردە بوو بوو، لەو ساڵەدا سەفەری ئەسپانیای کردو بوو بە پێشەنگی گۆڕانکاریێن تازە. زۆر بەخێرایی شاعیرانی لاوی وەکو برایانی (ماچادۆ، خیمنز، و ڤیلار سپیزا) لە دەوری گردبوونەوەو شاعیرانی پارناسینو سیمبولیستانی فەرەنساوی وەکو: (ڤارلین، لوکنت دولیل، بودلیرو مورەئا)یان بە مامۆستاو پێشڕەوانی خۆیان دانا. ئەم گروپە کەلە لایەکەوە لایەنگری شیعری ئازاد بوون، لەلایەکی دیکەوە گەلێك شیعری زۆر کۆنی ئەسپانیاشیان زندوو کردەوەو ژیاندەوە.

بەڵام مامۆستای راستەقینەی ئەم وەچە لاوە (ئونامونو ١٨٦٤- ١٩٣٦)ی نووسەری سەتیرو توێژەرو رەخنەگری زۆر شارەزا بوو کە هەموو زمانەکانی ئەوروپای دەزانی و بەرهەمی فەیلەسوفانو نووسەرانی تازەی وەردەگێڕا.

(ئونامونو) لە کاتی دەستبەتاڵیدا شیعری زۆر مکوم و کورتو زەحمەتیشی دەنووسی و شانۆنامەشی دەنووسی. کتێبەکانی ئۆنامونۆ لە خانەی باشترین بەرهەمی ئەدەبیاتی ئەسپانیادان، لەوانە: (ماهیەتی ئەسپانیا، ناسکی ژیان، گیانەڵلای مەسیحیەت). هزرو بیری ئونامونۆ لە قووڵترینو ریشەدارترین باوەڕێن ئەسپانیاوە هەڵقوڵاونو نیشاندەری عیرفانێکی

تایبەتی ئەوتۆیە کە لەوە پاش بەرانبەر بە (فەلسەفەی ئەساڵەتی ئەقڵ)ی ئەوروپایی وەستاوە. ئۆنامونۆ لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە دەیانگوت دەبێ ئەسپانیا ئەوروپایی بکرێ دەیگوت: "هەوەڵجار دەبێ ئەوروپا بکرێتە ئەفریقایی".

دامەزرێنەری واقیعی شیعری نوێ لە ئەسپانیادا، مامۆستای شاعیرانی هاوچەرخی ئەو وڵاتە (خوان رامون خیمنز ١٨٨١- )ـە کە بە نوێنەری گۆڕانە شیعرییەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێ. بەرهەمە شیعرییەکانی خیمنز بە سێ قۆناغدا تێ پەڕیوون. لە قۆناغی یەکەمدا کە خیمنز دڵبەندی سیمبولیزمی فەرەنسی بوو بایەخی زۆرو تایبەتی بە ریتمیو شەو مۆسیقای رستە دەدا. گرنگترین بەرهەمی ئەم قۆناغەی (روحی وەنەوشە)یە. خیمنز لە قۆناغی دووەمدا روو دەکاتە (ئیمپرسیونیزم)و بەوپەڕی لیهاتووییەوە گۆرانی فۆلکلۆری ئاوێتەی شیعرەکانی دەکات. کارەکانی ئەم قۆناغەی ئیلهام بەخشی شیعرەکانی لۆرکان. ئەوجا قۆناغێکی دیکە دەست پێدەکاتو خیمنز دەکەوێتە بیری (شیعری ناوازە)و وشەی کورتو شاعیرانەو مکوم بەکار دێنێو پشت دەکاتە قاڵبە سووکو ئاسانەکان.

خیمنز لە بواری پەخشاننووسینشدا هەر دەست رەنگین بووەو کتێبێکی هەیە بە ناوی (منو پلاتیرو) یان (بەسەرهاتی کەرێك) کەلە ئەدەبیاتی ئەسپانیادا بێ هاوتایە. خیمنز لە ساڵی ١٩٥٦دا خەڵاتی ئەدەبی (نۆبل)ی لەسەر بەرهەمە ئەدەبییەکانی وەرگرت.

ئیدی بەمجۆرە لە هەموو شوێنێکی دیکەی ئەوروپادا، لە ماوەی هەمان ئەو ساڵانەدا، گۆڕانکاری چوونیەکو هاوشێوە روو دەدات. لە ساڵی ١٨٩١دا (کنوت هامسون ١٨٥٩- ١٩٥٢)ی نووسەری نەرویجی پێوەرو پێوانەی بایەخو بەهاکانی سەردەمی خۆی رەتدەکاتەوەو پەنا وەبەر (خەون)و (راز) دەباتو بە هەقێکی رەوای دەزانێ. لە ساڵی ١٨٩٤دا رۆمانی (پان- Pan)ی بڵاوکردەوە کە هەناسەیەکی تازەو زندوو و شاعیرانەی بە بەر جیهانی مردوو خامۆشی ناتورالیزمدا کرد.

(براندس ١٨٤٢- ١٩٢٧)ی فەیلەسوفو رەخنەگری دانیمارکی کەلە ساڵی ١٨٧١دا فەلسەفەی پەرەسەندن)ی ئینگلیسیو (فەلسەفەی تەحەقوقی) فەرەنسی هێنابووە دانیمارك لە ساڵی ١٨٨٩دا پەردە لەسەر رووی فەلسەفەی (نیتشە) لا دەباتو (پەرستنی سوپەرمان) لە جێی (ئەفسانەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی) دادەنێ. هەر لە وڵاتی دانیمارکدا لە ساڵی ١٨٩٣دا گۆڤارێك بە نێوی (تارنت) دادەمەزرێو لە ژێر کاریگەری (بۆدلێر)و (ڤارلین)و (مالارمیە)دا جێگیری (زاتیەت)و (ئازادی هونەری) رادەگەیەنێ. لە سویدا پاش ئاوابوونی ئەستێرەی ناتورالیزمی (ستریندبرگ)، شیعری ریتمداری (فرودینگ ١٨٦٠- ١٩١١) لە غەزەلیاتی (شیللی)و (کیتس)ەوە ئیلهام وەردەگرێت. لە هۆڵەندەدا، شاعیرانی دوا چارەکی سەدەی نوزدەم، سیمبولیزمی فەرەنسا لەگەڵ غەزەلی رۆمانتیکی ئینگلیزدا لێك دەدەن. لە مەجەرستاندا شاعیرێکی گەورە بەناوی (ئەدی ١٨٧٧- ١٩١٩) کە ناوی (بۆدلێر مەجەر)ی لێ دەدەن. لە شیعرەکانی خۆیدا تۆنو نەواو وشەو کێشێکی تازە دێنێتە ئاراوەو قاڵبە کۆنەکانی شیعر تێکدەشکێنێو. ئەدەبیاتی ئیتاڵیا، پاش نەمانی قوتابخانەی (ڤەریزم) لە ساڵانی نێوان دوو

**سەدەدا، دەستەمۆو گیرۆدەی قوتابخانەێن وەکو (فوتوریزم)و چەندین (یزم)ی دیکە دەبیٚ کە هەموویان لە سیمبولیزمی فەرەنساوە لق و پۆپیان هاویشتووە..**

# چاوخشانێکی خێرا بە ئەدەبیاتی سەرەتای سەدەی

# و

# بیستەم و تێکرژانی قوتابخانەکان

ناتوانرێ ئەدەبیاتی هاوچەرخ، واتە ئەدەبیاتی دوا چارەکی سەدەی نۆزدەیەمو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، بە ئەدەبیاتێك بژمێردرێ کە یەکێتیو نەزمێکی دیاریکراوو شێوەیەکی هاوبەشی هەبێ. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەدەبیات لە قۆناغەکانی رابردوودا جۆرە هاوسەنگییەکی هەبوو، بەڵام کورتو کاتی بوو (بۆ نموونە دەروون پشکنی لە رۆمانتیزمداو بێرون پشکنی لە ریالیزمدا) وا دێتە بەرچاو کە ئەدەبیاتی هاوچەرخ بێ هیچ جۆرە هاوبەشییەکی شێوازو ناوەڕۆك، خۆی بە دەستی کەسایەتیانی جۆراو جۆرو گۆڕانکاری ناکۆك سپاردبێو بەپێی زەمانو شوێنو کۆمەڵگەو تاك لە نێوان ژیانەوەی رۆمانتیزمی نوێو پاراستنی پاشماوەکانی ناتورالیزم، لە نێوان ناسکترین غەزەلیاتی ئاشقانەو زبرترین رۆمانێن ریالیستی، لە نێوان پتەویو مکوی کۆنی زمانی نووسینو پەرێشانیو پەشێوی روو لە زیادی زمانی گفتوگۆ، لە نێوان دەروونزانیو فەلسەفەی رەسەنایەتی کار، لە نێوان پەرستنی هونەرو بایەخدان بە رێساکانی ئەخلاقو فەلسەفەدا لە نەوەستاندایە، ئەدەبیاتی تازە وەکو نیگارکێشی هاوچەرخ، ئەدەبیاتێکە کە هیچ جۆرە روویەکی هاوبەشو هاوسەنگو هاوبۆچوونی تێدا نییە.

بەڵام کە نەتوانین یەکێتی ئەو ئەدەبیاتە دەرك بکەینو بدۆزینەوە ئایا دەبێ نکوڵی لە رەسەنایەتی بکەین؟ جا با ئەوەمان لە بیر بێ کە بۆ وێنە دەربارەی قوتابخانەی رۆمانتیزم، کە نهوو بە بۆچوونی ئێمە یەکێتی شێوازو هاوبەشی ناوەڕۆکی تێدایە، هاوعەسرانی رۆمانتیزم لە کاتی خۆیدا باسی پەرێشانیو پەشێویو پاشاگەردانیو بێ سەروبەری ئەو قوتابخانەیەیان دەکرد. ئەدەبیاتی هاوچەرخ هێشتا قاڵبێکی جێگیری وەرنەگرتووەو هێور نەبووەتەوە. هەر کاتێ بە تەواوەتی جێگیر بوو هەنگێ دەکرێ رە سەن لە قەڵب جیا بکرێتەوەو، جیاوازی لە نێوان پاشماوەی شێوازێن کۆنو شێوازی نوێ بکرێ.

نابی ئەوەش لە بیر بکەین کە بە سەدەی بیستەم دەڵێن (قۆناغی نەمانی قوتابخانەکان)و تەنانەت بە باوەڕی گەلێك لە خودان نەزەران، ئیدی شێوازێکی تازە لە ئەدەبیاتدا پەیدا نابێ، بە هەر حاڵ لە دنیای ئەدەبیاتدا باسکردنی ئایندە کارێکی بێهودەیە لێ ئەگەر ئایندەی ئەدەبیاتی تازە هێشتا ئاڵۆزو نا جێگیر بنوێنێ، بێگومان سەرەتاو دەستپێکی روونییەکی تایبەتی خۆی هەیە، ئێمە لەم فەسڵەدا هەوڵدەدەین کە ئەم سەرەتایە پیشان بدەین.

# شکستی ناتورالیزم

**لە ساڵانی ١٨٨١و ١٨٩٠ تەقریبەن لە سەرانسەری ئەورووپادا، ڕاپەڕینی ناتورالیستی دەگاتە کۆتایی و شیعری سیمبولیستی کە پێشتر هەوادارانێکی کەمی هەبوو لە تاریکی و گومناوی دێتە دەرێ. سیمبولیزم و ریالیزم بەلای کەمەوە لە فەرەنسادا، هاوکاتن (گوڵی شەڕ)ی بۆدلێر کە سەرچاوەی شیعری نوێیە، یەك ساڵ پاش (مەدام بۆڤاری) بڵاوبووەتەوە. لەو دەمانەدا کە ریالیزم گەیی بووە لوتکەی گوڕو تینی خۆی. هەندێ هێزو ڕەوتی پێچەوانەی دیکە لە بەرانبەریدا قووت بووەوە، بەلام تەنیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هێزو ڕەوتە تازەکان بارودۆخەکەیان بە قازانجی خۆ گۆڕی. و لە ساڵی ١٨٩٠دا، "هیپولیت تن" بە "پول بورژیە" دەڵێت. " ڕۆڵی وەچەی ئێمە بەسەر چووە".**

هەستی ژیانی دەروونی لە بەرانبەر کەشفی دنیای دەرەکی رادەپەڕێ: "تاك" کە بەرەو ناخ و دەروونی خۆی گەڕاوەتەوە ژیانێکی تازە دەبینێ و تێدەگات کە زانست وەلامی هەموو گیروگرفتەکانی ژیانی پێ نییە. لەبەرانبەر ویستی زانستی تەحقیقکاری رووتدا، ئارەزووی ناسین و زانینی ڕێگای جۆراوجۆری ژیان دێتە پێشێ: بەهای مەزەبی، بەهای هونەری، بەهای ئاکاری و ئەخلاقی، بەهای کۆمەلایەتی، بوێری و یاخی بوون، خۆ پەرستی و پەرستنی "زەوی و مردووان" دێنە گۆڕێ. و لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا هەمووان هەق دەدەنە (گوتە)و (نیتشە) کە دەیانگوت: "هەر زانستێك کە هەستکردن بە ژیان زیاد نەکات بێ بایەخە".

هەڵبەتە مەبەست ئەمە نییە کە خەیالاتی فریودەر بخرێتە جێی حەقیقەتەکانی زانست، بە چاوی ئەفسانەو خەیالْ ناڕواننە خواو "دەروون پشکنی شاعیرانە" بەڵکو ئەوانە بە حەقیقەتی بێ چەندو چوونی رزگاری بەخش دەژمێرن. چونکە لە ریالیزمدا، واقیع ئەوەیە کە هەیە، بۆیە شاعیرو نووسەر تاقە ئەرکیان ئەوەیە کە ئەو واقیعە بدینن و تەماشا بکەن، لەوەشە بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ و بە ئومێدی ئەو بژی. بەلام لە هەموو حاڵێکدا ناکرێ بە پێچەوانەی ئەوەوە کاردانەوە یان پەرچە کردار بنوێنرێ. کەواتە ئەنجامگیرییەکە ئەوەیە کە ریالیزم یان (گەشبینی)یە یان (سست توخمی)یە. ژیان تەژی ئازارو رەنجە: "هەستی بەزەیی" جێی (ریالیزمی گەشبین) دەگرێتەوەو "واقیع" وەدەر دەنێ.

ساڵانێکی زۆر خەڵکی بە تاسەوە چاوەنۆڕ بوون کە بەروبوومی زانست ئاشکرا ببێ و، ویستی ئەقڵ و لۆژیك بەسەر پەیوەندییەکانی مرۆڤدا زاڵ بێ و هەموو کەلینەکان بگرێتەوەو مرۆڤ بە بەختەوەری و دادپەروەری و ئاشتیخوازی لەسەر تەختی مێژوو دابنیشێت. وا دەهاتە بەرچاو کە جیهان لە ئاستانەی هاوسەنگییەکی تەواودایە، ئیدی ئەم هاوسەنگییە بەناوی "سەردەمی سنعەت" یان (سەردەمی زانستی تەحقیقکاری) یا "کۆمەڵگەی بێ چینایەتی" یان "ئازادی عالەمگیر" ناو ببرێ لێ هەر زوو بەزوو ئاشکرا بوو کە هەموو دوای کلاوی بابردوو کەوتوون: پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و پیشەسازی هەژارو زوڵم و زۆر زیاد دەکات، دنیا بە دەست ئیمپریالیزم و کۆمەڵگە بەدەست پێکادانی خۆپەرستی و ئینکەبەرایەتییەوە دەناڵێنن، و سەدەی بیستەم بە نەعرەتەی جەنگ و شۆڕش دەست پێدەکات.

# تێکەڵبوونی ئەدەبیاتی میللەتان

# و

# کاریگەرییان بەسەر یەکترەوە

ولاّتانی ئەوروپا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا زۆر گۆڕانی مێژوویی و کۆمەلاّیەتیان بەسەردا هات. ئاسانی رێگاوبان و سەفەرو خوێندنەوەی زمانانی بێگانە پەیوەندی نزیکتر لە نێو میللەتاندا دروست دەکات. ئەدەبیاتی هاوچەرخ، ئەدەبیاتی جیهانگەرو تێکەلاّوبوونی زمانانە.

رۆژ بەرۆژ رەونەق و بازاڕی تەرجەمەو وەرگێڕان زیاد دەبێ، و نووسەرانی ولاّتانی جیاواز یەکتر دەناسن و بەرهەمی یەکدی دەخوێننەوە. لە قۆناغی کلاسیکدا، ئەدەبیاتی فەرەنسا گەیی بووە ولاّتانی بێگانە، بەلاّم چ شتێکی لە بری ئەوە وەرنەگرتبوو. لە قۆناغی رۆمانتیزمدا، ئاڵمان ئیلهامی بە ئینگلیستان و فەرەنسا بەخشی بوو لێ دەسەلاّت و کاریگەری سنووردارو ناڕاستەوخۆ بوو. تەنیا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا کاریگەری هاوبەش و راستەوخۆ بایەخێکی سەیر بە دەست دێنێ.

هەر ولاّتێك دەبەخشێت و وەردەگرێت، و ئەدەبیات لە چوارچێوەی سنوورو کەلێنان دەردەچێت. لە کۆتایی سەدەدا، وەکو لە فەسڵی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرا، دەسەلاّتی سیمبولیزمی فەرەنسا لە نێو نووسەرانی ئاڵمان و ئینگلیزو رووسیادا یەجگار دیارەو مایەی سەرسامییە. "ستفان گیورگی" شیعری بۆدلیرو ڤارلین و مالارمیە بۆ سەر زمانی ئاڵمانی وەردەگێڕێت. "ریلکە"ی دۆستی "رودان" لە پاریس دەژی و بە فەرەنسی شیعر دەنووسێت و شیعرێن ڤالیری دەکات بە ئاڵمانی. "روبن داریو" کە لە پاریس دەگەڕێتەوە، سیمبولیزمی فەرەنسا بۆ ئەسپانیا بە دیاری دەبات. "تی ئێس. ئیلیوت" لە رووی هونەرەوە خۆی بە قەرزاریاری "بۆدلێر"و "لافورگ"ی فەرەنساوی دەزانێ.

لێ فەرەنسا ئەوەندەی دەبەخشێت، ئەوەندەش وەردەگرێت، بلاوکردنەوەی کتێبی "ڤوگویە" بەنێوی "رۆمانی روسی"، وەرگێڕانی بەرهەمێن نیتشە، و کاریگەری "ئیدگارئالن پۆ" بەسەر مالارمیەوە لە رێگای بۆدلێرەوە، و دەسەلاّت و کاریگەری فراوانی "ئۆسکار وایلد"و "والت ویتمن" شیعرو رۆمانی فەرەنسی بە رێگەیەکی تازەدا دەبەن.

رۆمانەکانی دۆستوفیسکی کارێکی قووڵ دەکەنە سەر بەرهەمەکانی جیدو ئەدەبیاتی ئاڵمان. دەسەلاّت و کاریگەری رۆمانی هاوچەرخی ئەمریکا، لە دوا ساڵەکاندا، لە رێگەی فەلسەفەی ئاڵمانەوە، چوار دەوری رۆمانی فەرەنسی دەگرێ.

"مارسیل پروست" ئیلهام لە "هنری جیمس ١٨٤٣- ١٩١٦" وەردەگرێت و "فیرجینیا وولف ١٨٨٢- ١٩٤١" ئیلهام لە پرۆست وەردەگرێت. ئاندریەجید رۆمانەکانی "جۆزیف کونراد ١٨٥٧- ١٩٢٤"و شیعرەکانی "رابیندرانات تاگور" تەرجەمەی فەرەنسی دەکات. ئاندریە مالرو پیشەکی بۆ بەرهەمەکانی (ویلیام فۆکنەر)و جان پۆل سارتەر پێشەکی بۆ رۆمانەکانی "دۆس پاسۆس ١٨٩٦-      " دەنووسن. تۆماس مان دوا کتێبەکانی خۆی لە پێش دا بە ئینگلیزی

بڵاودەکاتـەوە ئـەوجا بـە ئەڵمانییەکـەی خـۆی بـڵاوی دەکاتـەوە. "لاژوس زیلاهـی"ی نووسـەری مەجەری دوا رۆمانەکانی خۆی راستەوخۆ بە ئینگلیزی دەنووسێت.

## کەشفکردنەوەی زەمانی رابردوو

یـەکێك لـە خەسـڵەتو تایبەتمەندییـەکانی ئـەدەبیاتی هاوچـەرخ ئەمەیـە کـە دەخـوازێ پەیوەنـدی دەگەڵ هەموو ئەو شتانەی لە جیهانی دەوروبەریدا روودەداو دەگەڵ هـەموو ئـەو شـتانەدا کـە لـە رابردوودا رووی داوە، بەرقەرار بکات. کلاسیزم تەنیا پشتی بە دابو نەریتە کۆنـەکان دەبەست، رۆمـانتیزم هـەر قسـەی رووت بـوو، لـێ ئـەدەبیاتی هاوچـەرخ لـە رای کەشـفی زەمـانی رابـردوو و دۆزینەوەی وەڵامێك بۆ زەمانی ئێستا هەموو مەرزو سنوورو بنەمایەك دەبەزێنێو بە هیچ قاڵبێك قاییـل نییـە، ئـەدەبیات بـە گوتـەی (ئیلیـوت) سیسـتەمێکی یەکپارچـەی یـەکگرتووەو نووسـەری هاوچەرخ هەوڵدەدا وابەستەیی خۆی لە ناو ئەم سیستەمەدا دیاری بکات.
هەر راپەڕینێکی ئەدەبی تازە دەکەوێتە خەمی کەشفکردنەوەی رابردوو یان رابردوویەك بۆ خـۆی دروست دەکاتو، شێوەیەکی تازە بۆ خوێندنەوەو تێ گەییشتنی بەرهەمی پێشینان دادێنێ.
شـیعری سیمبولیسـتی لـە راسـتیدا کەشـفێکی تـازەی شـیعرێن بـۆدلێرو مالارمیـەو رامبـو بـوو، سـورریالیزم وەکـو دەبیـنین، بەرهەمـەکانی "مـارکیز دوسـاد ١٧٤٠– ١٨١٤"و "لوتریـە ئـامون ١٨٦٤– ١٨٧٠" لـە جیهـانی فەرامۆشـییەوە دەردێـنێو فەسـڵێکی تـازە لـە مێـژووی ئـەدەبیاتی رابـردوو دەکاتـەوە. ئیلیـوت شـیعرو فەلسـەفەی (جوهـان دون ١٥٧٢– ١٦٣١)و "شـاعیرانی ئیلاهی"ی سەدەی هەژدەیەمی ئینگلیزی زیندوو دەکاتەوە.
زانستی مێـژووی ئـەدەبیات هـەر رۆژەی کەشـفێکی تـازە دەکاتو کەشـفەکۆنەکان قووڵتر دەکات. سونەتو رێسایەکی تایبەتی حوکمڕانی دنیای ئەدەب ناکاتو نووسەری هاوچەرخ کە ئاگـای لـە ئازادیو تـەنیایی خـۆی هەیـە، هەوڵـدەدا کـە بەگەمـەی زیندووکردنـەوەو ژیاندنـەوەی رابـردووان جـۆرە رەزامەندییـەك بـە دەسـت بـێنێ، بـە تایبـەتی کـە ئـەدەبیات رۆژ بـە رۆژ هـەوڵی زیـاتر بـۆ داهێنانو ئەفراندنی شێوەو فۆرمی تازەی دەربڕین دەداتو نووسـەر بـۆ گەییشـتن بـەو ئارمانجـە، ناچارە سوود لە ئەزموونی هونەری رابردووان وەربگرێ.

## سەرەتـای سەردەمی رۆمان

لـە قۆنـای "نـابووتی نـاتورالیزم"دا، رۆماننووسـان کەوتنـە هـەوڵی ئـەوەی کـە لـە دەرێـی چـوار دیواری ئەم قوتابخانەیـەدا، بەرهەمـەکانی خۆیـان پوختـەتر بکـەن، بۆیـە دیاریکردنی خەسڵەتو سیفەتی رۆمـانی ئـەم قۆنـاغو سـەردەمە تـەنیا لەبـەر رۆشـنایی رێبـازی کـاری نووسـەرو بابـەتو ناوەڕۆکی بەرهەمەکەی دێتە ئەنجامدانو دابەشکردن.
لـە راسـتیدا رۆمـان کـە زیـاتر لـە شیعر پابەنـدی پێشبینی و چاوەڕوانیی خوێنەرانـەو کـەمتر لـە شیعر ئامـادەی گۆڕانـە، لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدەیـەمو سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا دووچـاری هەمان گۆڕانو گۆڕین بوو بوو، لە ساڵی ١٨٩٧ وە تا ساڵی ١٩٠٢، بە مردنـی "ئالفونس دودە"و

"ئادمون دوگنکور"و "ئەمیل زولا" کۆتایی بە قۆناغی کۆن هات. هەروەها وەکو ئاماژەمان بۆ کرد "بەیاننامەی پێنج نەفەرە"کە دژی رۆمانی "زەوی"ی ئەمیل زۆلا بلاوبووەوە دژایەتی پەیڕەوانی کۆنی ناتورالیزمی ئاشکرا کرد. لە دوا ساڵەکانی سەدەدا، رۆمانەکانی (پیرلۆئیس)ی وەکو "ئافرۆدیت"و "ژنو بوکەڵە"و چیرۆکەکانی (فرانسی ژام) پێ بە پێی راپەڕینی تازەی شیعر دەچێتە پێشێ. کتێبی "موریدِ"ی "پول پورژیە"و دوو بەرگەکەی "خودپەرستی"ی بەرهەمی "موریس بارس" رۆمان بەرەو پرس و مەسەلە دەروونییەکانی ژیانو پێداویستی تۆمارکردنی زەرورەتی ئەخلاقی ئاراستە دەکات. رۆمانەکانی "ئاناتول فرانس" بە تایبەتی "تاوانی سیلوستر بونار"و "تائیس" لە رووی تۆنو ئاهەنگی شاعیرانەی دەربڕینو ئامادەگی بەردەوامی چیرۆکنووس لە نێو چیرۆکەکەو پەیامی رۆمان بۆ پیشاندانی شێوەی دروستی ژیان، رێك رووبەڕووی ناتورالیزم دەوەستێتەوە. تەنانەت "پیرلوتی"ش لە "سەربەست"و "ماسیگرانی ئایسلاند"دا لە قوتابخانەی ناتورالیزم دوور دەکەوێتەوە.

هەڵبەتە دەبێ ئەمەش بڵێین کە رۆمانو شانۆنامە لە قۆناغی ریالیزمدا قالبێکی وەهای پەیدا کردبوو کە لەگەڵ تێگەیشتنی خوێنەری مامناوەندیدا بگونجێت: دەربارەی چەمکی واقیعیەت "ریالیتە"و شێوەی شەرحو دەربڕینی واقیعیەت هەموو نووسەرەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێی قاییل بوون. جا بەم پێیە دەکرێت خەسڵەتە هاوبەشەکانی رۆمانی ئەم قۆناغە بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکرێتەوە.

وەسفی واقیعیو حەقیقەت نوێنی کۆمەڵگە لە چوارچێوەی چیرۆکێکی جواندا، خوڵقاندنی قارەمانانی زندوو و تەواو تاكو تاکرەو، هونەری دەربڕینی واقیعو واقیعیەت بە شێوەیەك کە لە روانگەی خوێنەرەوە جیلوەو پرشنگی هەقیقەتی هەبێ، توانانوێنی لە لۆژیکی کەلامو بونیادی چیرۆكو مکومی دەربڕینو یەکدەستی شێواز:

لێ، دەکرێ رۆمانێن ئەم قۆناغە بە شێوەیەکی گشتی بەسەر دوو دەستەدا دابەش بکرێ، رۆمانی سایکۆلۆژیو رۆمانی واقیعی.

1- **رۆمانی سایکۆلۆژی:** لە سالانی ١٨٥٥- ١٩٢٠دا کۆمەڵێك نووسەر هاتنە مەیدانو بە پەیڕەوی "ستندال"و "بالزاك"و "برایانی گنکور" کەوتنە نووسینی رۆمانێن سایکۆلۆژیو تاقە جیاوازییان ئەوە بوو کە دەرکی ئەخلاقی. ستندالو ئەندێشە قووڵەکانی بالزاكو کۆششە هونەرییەکانی گنکورەکانیان وەلاوە نابوو. رۆمانەکانی ئەم نووسەرانە شیکردنەوەی سایکۆلۆژیو شرۆڤەی سروشتو دیمەنێن ئاشقانەو وەسفی کۆمەڵگەیان لە خۆگرتبوو. لە نێو ئەم نووسەرانەدا دەکرێ نێوی پول هریڤ و برایانی پولو ڤیکتور مارگریتو مارسیل پرۆڤیوستو ئەدوار ئیستونییەو ئادمۆن ژالوو پول بورژیە ببرێ.

هەڵبەتە هیچ یەکێك لەم نووسەرانە لە شێوەی رۆمانووسیدا کارێکی تازەیان ئەنجام نەداوە، یانی لەم قۆناغەدا کە ئێمە باسی لێوە دەکەین سیفەتی دیاری رۆمانی سایکۆلۆژی نە لە فۆرمی نووسینی دایەو نە لە خەسێتی ئەخلاقی دایە، بەڵکو لەو بابەتە تایبەتیەدایە کە

هەڵیدەبژێرێ. تەنیا یەك رۆمان لە ئەدەبیاتی ئەم قۆناغەدا، هەم لە باری فۆرمی نووسینەوەو هەم لە رووی داهێنانو هەڵبـژاردنی بابەتو خەملاندنی نێوەڕۆکەوە پایەیەکی گەورەی وەرگرتووە، ئەویش رۆمانی بەناوبانگی "لوگراند مولین"ی ئالن فورنیە یە کە لە ساڵی ١٩١٣دا بڵاوبووەوە. نووسەر لەم کتێبەدا، واتا لەم تەنیا کتێبەدا کە نووسیوویەتی، بە توانایەکی زۆر تایبەتییەوە خەونو واقیعی تێکەڵ کردووەو یەکێك لە جوانترین شاکارەکانی رۆمانی فەرەنسی هێناوەتە ئاراوە. لە نێو ئەو بەرهەمانەدا کە دەرونیشکاری منالانی گرتۆتەخۆ، ئەم کتێبە بایەخێکی یەجگار زۆری هەیە. هەندێ رووداوی ناو ئەم چیرۆکە حەقیقەتەو لە ژیانەوە وەرگیراوەو هەندێکی دیکەشی لایەنی رەمزی هەیە، ئەم رۆمانە کە بە پەخشانێکی شاعیرانە نووسراوە، بەرهەمەکانی (ژراردو نرڤال) وەبیر دێنێتەوە.

بەرهەمەکانی هەوەڵی خانم "کولت"ش لەم قۆناغەدا لە دایك بوونە. "کولت" خانم کە یەکێکە لە نووسەرە هەرە گەورەکانی دنیا جگە لەوەی کە وشەو خواستنو زمانێکی تا رادەیەك تازە بەکار دێنێ، بە شێوازێکی بەرزو بەرجەستە هەستە دەروونییەکانی قارەمانەکانی خۆی دەخاتە بەر وردەبینی شیکردنەوەوەو بەمجۆرەو لەم رێگەیەوە مەودای رۆمانی سایکۆلۆژیو شیتەڵکاری دەوڵەمەندترو بەرینتر دەکات.

لە هەمان سەرو بەندا "مارسیل پروست ١٨٧١- ١٩٢٢" کە لەوەیە گەورەترین رۆماننووسی جیهان بێ لە سەدەی بیستەمدا، بە گوڕوتینو کاریگەرییەکی زیاترەوە دێتە مەیدانو قۆناغێکی تازە لە بواری نووسینی رۆمانی دەرونیشکاریدا دادەمەزرێنێ "گەڕان بە دووی زەمانی لە دەست چوو"دا کە شاکاری هەرە گەورەی پروستەو لە ١٥ بەرگدا نووسراوە، رووداوو حیکایەتێکی دیاریکراوی تێدا نییە. راستە کە قارەمانی رۆمانەکە لە سەرەتای کتێبەکەدا منداڵەو لە کۆتاییدا دەبێ بە پیاوێکی گەورەو تەواو، بەڵام داوێك یان زنجیرەیەك لە ئارادا نییە کە رووداوەکانی ژیانی ئەو پێکەوە گرێ بدات. "پرۆست" بە وردیو بە قووڵییەکی سەیرەوە زۆر مەسەلەی وەکو زەمانو بیرەوەریو زەینو مەحەبەتو حەسوودی و بەغیلیو گەوجایەتیو مۆسیقا دۆستیو زەوقی شانۆییو هونەر دۆستیو گوناحو خەوشو نەنگی دەخاتە بەر وردەبینی شیکردنەوەو راڤەکرن. نووسەر، بۆ شیکردنەوەی ئەو مەسەلانە، باری دەروونیو تایبەتمەندی، ئەو کەسانەی کە لە منداڵیدا یان لە قۆناغەکانی دیکەی تەمەندا ناسیونیو هەڵسو کەوتی دەگەڵ کردوون لە بیرو هزری خۆیدا زندوو دەکاتەوەو چەندین قارەمانی وەکو ئەوان دەئافرێنێو نموونەی دیارو بەرجەستە دەخوڵقێنێ. زۆربەی ئەم قارەمانانە نموونەی تەواوی تاکی ناو کۆمەڵگەو مرۆڤایەتین.

هەروەها نووسەر ژینگەو شوێنانی فرە راڤەو شرۆڤە دەکاتو کاریگەری ئەو ژینگانە لەسەر هەستو سۆزو دەروونی قارەمانانی نێو چیرۆکان نیشان دەدات.

"پرۆست" هەوڵیداوە لە بەرهەمەکانی خۆیدا وێنای زەینی "زەمان" دەربارەی پرسێن پەیوەست بە ژیانی دەروونییەوە ئینکار بکاتو ئەوە نیشان بدات کە زەمانی رابردوو و ئێستا، لە زەینی بنیادەمدا دوو چۆنیەتی جیاو نا پەیوەست نییە. لە کتێبە گەورەکەی

"پرۆست"دا رابردوو ئێستا ئاوێتە دەبن و ئەگەر لێكدیش جیا بكرێنەوە ئەوا تەنیا لە رووی چۆنیەتی و رواڵەتەوەیە نەك لە باری ماهیەت و كرۆكەوە.
گومانی تێدانییە كە بیروباوەڕی پرۆست لەم بارەیەوە لە بیروباوەڕی برگسون-ی فەیلەسوفی هاوچەرخی فرانسەوییەوە. لە روانگەی هەردووكیانەوە، زەمان لە رووی چەندییەتییەوە بایەخی خۆی لە دەست دەدات و تەنیا بایەخی چۆنی پەیدا دەكات.
٢- دیتن و رووداو نووسینەوە:
لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، ئەو رۆمانانەی لە قاڵبی دیتن و نووسینەوەی رووداواندا دەنووسران پتر لە رۆمانانی سایكۆلۆژی رەواجیان هەبووە. نووسەرانی ئەم بابەتە رۆمانانە دەیانویست بە جۆرێك چیرۆكەكانیان رێك بخەن كە بتوانێ بە راشكاوی سووچێكی كۆمەڵگە نیشان بدات، بۆیە زیاتر بایەخیان بە رەوشی گشتی كۆمەڵگە یان سەردەم دەدا تا بەهەست و دنیای دەروونی تاك. بەرهەمی ئەو نووسەرانە هەندێ جار لایەنی شیكردنەوەی داب و نەریت و رێ و رەسمان دەگرێتەخۆو هەندێ جار لە قاڵبی "رۆمانی كۆمەڵایەتی"دا بەرجەستە دەبێ. جا لەم بوارەدا ئەو بابەتانەی كە دەتوانرێ بخرێنە بەرباس و لێكۆڵینەوە، هەمە جۆرترو زیاترن لە بابەتێن رۆمانی سایكۆلۆژی. لە ژیانی ئەرستۆكراتییەوە بیگرە تا دەگاتە ژیانی شارستانی و دێهاتی و تەنانەت دەربەدەری و ماڵ بەكۆڵی، هەمووی بابەتی بەردەستی نووسەرانی ئەم تەرحە رۆمانانەن. ئەم نوورانە بە زۆری شێوەی كاری خۆیان لە پێشەنگانی ریالیزم و ناتورالیزمەوە وەرگرتووە. لە نێو ئەم نووسەرانەدا، ئەوانەیان كە سەفەری شوێنانی دووریان كردووە بە بابەت شوێنی گرنگیان پڕ كردۆتەوە وەكو: پیرلوتی، و برایانی تارو لە فەرەنسا، و كیپلنیگ لە ئینگلیستان.
گەورەترین نوێنەرانی ئەم قوتابخانەیە لە سەدەی بیستەمدا "نیودور درایزر"ی نووسەری "تراژیدیای ئەمریكایی"یە لە ئەمریكاو "ژول رومن"ی نووسەری "جوامێران"ـە لە فەرەنسا. لێ شاكاری ناو ئەم جۆرە رۆمانانە، بە باوەڕی زۆربەی رەخنەگران، رۆمانی "ماڵباتی تیبو"یە كە رۆمانێكی دە بەرگییەو نووسەری هاوچەرخی فەرەنسی رۆژیە مارتین دوگار نووسیوویەتی.

## سەردەمی رۆمان

گەلێگ لە شارەزایان، وەكو جۆرج سیمنونی رۆماننووسی هاوچەرخی بەلچیكی باوەڕیان وایە كە دەكرێ سەدەی بیستەم بە "سەردەمی رۆمان" ناو ببرێ، وەكو چۆن بۆ نموونە بە سەدەی هەڤدەیەمیان دەگوت "سەردەمی تراژیدی". هەڵبەتە نكۆڵی لەوە ناكرێت كە پێش سەدەی بیستەم رۆمانانی گەورەو بێ هاوتاو نەمری وەكو: "تریستان وایزوت" و "مانون لسكو"و " شازادە خانم كلو"و "سورو رەش"و "دێری پارم"و "باباگۆریو"و "كوزین بت"و "مەدام بوڤاری"و "دیڤید كاپر فیلد"و "ئارەزووە گەورەكان"و "جەنگ و ئاشتی"و "تاوان و سزا"و "برایانی كارامازۆف" هەبوونە. لێ ئەو زەمانە، رۆمان هێشتا رێ و رەسمی

تەواوەتی و شێوە نووسینی تایبەتی خۆی پەیدا نەکردبوو و بەترس و لەرزو دوو دڵییەوە بە ڕێگەی تاقیکردنەوەدا دەڕۆیی. بەڵام دەتوانرێ بگوترێ کە ڕۆمان لە سەدەی بیستەمدا ڕێگەی خۆی دۆزییەوەو لە فۆرمی "کلاسیك"ی خۆی نزیك بووەوە. ئێستا ڕۆمان لە هەموو وڵاتانی دنیادا بە لای کەمەوە لە سەدا نەوەدی ڕێژەی بەرهەمی ئەدەبی چاپکراو پێك دێنێ، شیعرو شانۆنامەو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە بە ڕێژەیەکی زۆر کەمتر دێن. جۆرج سیمنون گوتەنی: "لە ڕۆمانی ڕوسییەوە تا ڕۆمانی ئەمریکایی، لە ڕۆمانی فەرەنسییەوە تا بەرهەمێن ئەمریکای باشوورو فنلەندا، هەست بە بزووتنەوەیەکی مەزن و پڕ گوڕو تین و تاڕادەیەك نا مەعلوم دەکرێت، جا ئەمە تەخەمورێکە کە بێگومان شەرابێکی زۆر بە قووەتی لێ پەیدا دەبێ، شەرابێك پیاو بە عاریدا بدات، و ئەم شەرابە،... ئەم داوای هەقی ژیانەو ئەم ویستی لە دایکبوونەی پڕێکی نادیار، هەمان ڕۆمانی سبەینێیە. واتە هەوێنی سەردەمی ڕۆمانەکە خەریکە دەمەیێ".

بە باوەڕی جۆرج سیمنون، ڕۆمانیش ئێستا بە دوو ئاراستەی گەورەو جیهانگیردا دەڕوات: یەکێکیان "ڕۆمانی ڕووداونووسی"یە کە مەبەستی تۆمارکردنی وردی ڕووداوەکانە کە لە ژێر کاریگەری ڕۆمانانی دە بەرگی وەکو: "تراژیدیای ئەمریکایی"ی تیودور درایزەرو "گەڕان لە زەمانی لەدەست چوو"ی پرۆست و "ماڵباتی تیبو"ی ڕۆژیە مارتن دوگار هاتۆتە ئاراوە، ئەویتریان "ڕۆمانی قەیراناوی"یە کە زیاتر لە تراژیدیاوە، بە تایبەتی تراژیدیاکانی "شەکسپیر"ەوە نزیکەو، مەبەست و ئامانجی، نیشاندانی قەیرانی دەروونی قارەمانە سەرگەردانەکانە. ئەم جۆرە ڕۆمانە لە بنەڕەتدا لە فەڕەنساوە سەری هەڵداو پاشان چوو بۆ ئەمریکاو ئێستا بەسەر ڕۆمانی ئەو وڵاتەدا زاڵە. نوێنەرانی گەورەی ڕێبازی دووەم لە فەڕەنسادا "ژۆلین گرین و جورج برنانوس–ن".

لە کۆتایی وتارەکەیدا ئەم ئەنجامگیرییە بەدەستەوە دەدات: "ڕۆمانی قەیرانی یان ڕۆمانی ڕووداونووسی، یائەم یا ئەو جۆرە ڕۆمانە چ فەرقێك دەکات؟ ئەوەی گرنگە ئایا ئەمە نییە کە ڕۆمان لە هەموو زیادەیەك تەتەڵە بکرێ و تەنیا ڕەگەزە سەرەکییەکانی بمێنێتەوەو ببێ بە ئەو زاری دەربڕین و زمان حاڵی قۆناغی ئێمەو هەمان ئەرکی تراژیدیای ڕۆژگارانی کۆن لە ئەستۆبگرێ؟

"ئایا سەردەمی ڕۆمان، ڕۆمانی یەکپارچە، ڕۆمانی پاك و خالیسە، باڵاترین قوللەی هونەرو ئەدەب، دوورە یان نزیك؟ نازانم، لێ دڵنیام کە ئەو ڕۆژە هەر دێ!".

## چەند هەوڵێکی چکۆڵەو کەم دەوام

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا دەستەیەك لە شاعیران و نووسەران کەوتنە بیری دامەزراندنی قوتابخانەێن فەلسەفی و ئەدەبی تازەو دەیانگوت ئەدەبیاتی جیهان دەبێ لەسەر پایەو بناغەی فیکری نوێ بێتە دامەزراندن. لێ مەیدانی چەلەنگی ئەم دەستەیە پەرەی نەسەندو لە

خۆیانو لەو چەند کەسە کەمەی دەورو بەریان تێ نەپەڕی. ئێستا بە کورتی باسی هەر یەکێك لەم قوتابخانانەو دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانانە دەکەین.

## ناتوریزم

دیارترین پێشەوایانی ئەم قوتابخانەیە بریتین لە: سەن جورج بوئلیەو ئوژین مۆنفور کە لە ۱۸۹۷/۱/۱۰داو لە رۆژنامەی ڤیگارۆدا بەیاننامەی خۆیان بلاوکردەوە، شاعیرانی "ناتوریست" هەم ساردیو زبری شێوازی "پارناس"و هەم وردەکاری و دیقەتکارییە بێ بنجو بناوانەکانی "سیمبۆلیزم"یان رەتدەکردەوە. مەبەستیان ئەمە بوو کە گۆڕانێك لە شێوەی غەزەلدا دروست بکەنو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە کەوتنە هەولی دۆزینەوەی سەرچاوەیەکی ساغلەمو دەولەمەندی ئیلهام. لە بەرهەمەکانی خۆیاندا ژیانو ئەڤینو سروشتو کارو ئازایەتیان ستایش دەکرد، هەر چەندە نەیانتوانی قوتابخانەکەیان جێگیر بکەن، لێ لە دەرێی قوتابخانەکەدا جۆش و خرۆش و کەلکەلەیەکیان هێنایە ئاراوە کە لە شیعری شاعیران "ئانادونۆئای"و "فرانسی ژام"دا رەنگی داوەتەوەو بەرجەستە بووە.
گەلێك لە شارەزایانو رەخنەگران "خوانە زەمینییەکان"ی ئەندریە جید بە یەکێك لە بەرهەمەکانی ئەم قوتابخانەیە دەژمێرن.

## ڤێریزم

ئەم قوتابخانەیە کە لاسایی کردنەوەو لێکدانی هەردوو قوتابخانەی ریالیزمو ناتورالیزمی فەرەنسییە لە ئیتالیاهاتە ئاراوەو هەر لەوێدا گەشەی کردو پاش چەند سالێك بێ ئەوەی بگاتە هیچ ولاتێکی دیکە هەر لە وێدا دامرکایەوەو خەفە بوو. دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە نووسەرێکی بە توانای خەلکی سیسیل بوو بە نێوی "جیۆڤانی ڤێرگا– ۱۸٤۰– ۱۹۲۲" کە لە لاویدا هەندێ چیرۆکی میللی بلاوکردبووەوە، لێ لە کاملێدا کەوتە وەسفی قوولّ و فەیلەسوفانەی ژیدی خۆی. لەوەیە زۆری تاکی مرۆڤانی لە چیرکەکانی ئەودا کردبێتیە کارێك کە ڤێرگا بەرەبەرە فۆرمێکی تازە بە ریالیزمی فەرەنسییەکان بدات: بەم مانایەی کە شێوازی ئەو شارێی ریالیزمی ئیتالیای دۆزییەوەو بە تۆنو ئاهەنگێکی گەرمو توندو زبرو بێ پەردەوە شێوەی دەربڕینی نووسەرانی کۆنی ئیتالیای تێکەلّ بە فەلسەفەی ئەخلاقی تۆماس هاردی ئینگلیزی کردو زمانێکی سادەو گونجاوو بڕندەی داهێناو کۆمەلە چیرۆکێکی بەناوی "چیرۆکێن دێهاتی"و دوو رۆمانی چاکی بەو زمانە نووسی، ئەم بەرهەمانە نوێنەرو نموونەی شێوەو فۆرمی قوتابخانەیەکە کە وەچەی دواتر "ڤێریزم"یان پێدەگوت.
ئەم قوتابخانەیە کە بۆ ماوەی سی سالّ بە گومناوی مایەوە ئەمڕۆکە وەکو نموونەیەکی بینەزیری هونەری چیرۆکڤانی ئیتالیا سەیر دەکرێت. لە پەیڕەوکارانی دیکەی ئەم قوتابخانەیە دەکرێ ناوی: "لۆیچی کاپۆئانا"و "ماریوپراتزی"و "ماتیلدسیرانۆ"و لەوان دیارترو گرنگتر خانم "گراتسیادلدا" ببرێ.

# فوتوریزم

فوتـوریزم، کـه لـه وشـەی "فوتـور Futur" واتـه "ئاینـده"وه وەرگـیراوه، وەکـو "ڤیریـزم" هـەوەڵجار لـه ئیتاڵیا سـەری هەڵـداو بـەره بـەره گەییـه ولاتـانی دیکـەش. دامەزرێنـەری ئـەو قوتابخانەیـه شـاعیری نـاوداری ئیتاڵیـایی "مـارینتی ١٨٧٦- ١٩٤٤"بـوو. بـه بـاوەڕی "مارینتی" له سەدەی بیستەمدا، که سەردەمی مەدەنیەت و پێشکەوتنی پیشەسازییه دەبێ بۆ ئەدەبیاتیش شێوازو زمانێکی "میکانیکی" دروست بکرێ.

"فوتوریزم" له سەرەتادا دژی شێوازو باوەڕی "دانونزیو"ی شاعیرو ڕۆماننووسی ئیتاڵیایی (١٨٦٣- ١٩٣٨)و دژی ئاڵۆزبێـژی شـاعیرانی ئـەو زەمانـه هەسـتاو وێـڕای ئـەوەی لقێـك لـه سـیمبولیزم کـه لەسـەر بناغـەی ئیلـهامو مکاشـەفەو شـهود ڕۆنرابـوو، هـەموو جـۆره غەزەلکارییـەکی لـه شـیعر وەدەرنـاو شـێوازێکی پەخشـان ئـامێز هاتـه ئاراوه کـه دەیوسـت ڕەنگدانـەوەی هـەوڵ و کۆشـش و هـەراو هەنگامـەی ژیـانی پیشەسـازی نـوێ بـێ و جگـه لـه جموجـۆڵ و هەڵپـەی ژیـانی تـازەو کۆششـی پیشەسـازی و هاتوچـۆی ماکینـەو ئوتومبیـل و هاڕەی فڕۆکه، که هەر هەمووی نیشانەی دنیای (ئاینده)ن باسی هیچ ناکات. فوتـوریزم دژی هـەر جـۆره نیشـاندانێکی هەسـت و دەربـڕینی هەڵچـوونی دەروونـی شـاعیرو ڕەچـاوکردنی یاسـاکانی دەسـتووری زمـان و بەیانـەو داوای ئـازادی "وشـەێن نـا شـاعیرانه" دەکـات. جـا بـۆ نیشاندانی ئەم مەبەسته له خۆوه وشـەێن پچڕ پچڕو پێکـەوه نەگونجاوی لـه بابـەتی وشـەێن تەلـەگراف دروسـت دەکـات. فوتـوریزم، بـەر لـه شـۆڕشـی ئۆکتۆبـەر دزەی کـرده نـاو شـیعری ڕووسـییەوەو قوتابخانـەی سیمبولیزمی لـه پـێ خسـت و وێرانـی کـرد. فۆتـوریزمی ڕووسـی، ئەگـەر چـی لـه سـەرەتادا هەنـدێ لێکچـوونی لەگـەڵ فوتـوریزمی ئیتالیاییـدا هـەبوو، بـەڵام بەخۆشـی هەنـدێ تایبەتمەنـدی هـەبوو کـه بـەره بـەره لـه سەرچـاوه ئیتالیاییەکـەی جیـا دەکردەوه.

هەڵبەتـه گـەورەترین شـاعیری بـواری ئـەم شـێوازه لـه ئـەدەبیاتی ڕوسـیادا "فلادیمێـر مایاکوفسکی ١٨٩٢- ١٩٣٠" بوو که شێوازی ئەم قوتابخانەیەی کرده بیانوویەکی باشی دەستی خۆی بۆ بانگەشەکردنی شۆڕشگێڕی و بەباشترین ڕێگەی دەزانی بۆ نزیك کردنەوەی شیعر له زەوق و سەلیقەی عەوامی خەڵکی، مایاکوفسکی له شیعری ڕوسیدا کۆمەڵێك کێشی تازەو وشەو دەستەواژەی نوێ و تەنانەت لێکچوون و خواستنی سەیرو سەمەرەشی داهێنا. وشـەی بـاوو دەسـتەواژەی ڕۆژنامـەیی هێنایـه نـاو شـیعرەوەو ڕێسـتاکانی ڕستەسـازی و گەردان و ڕێزمانی زمانی ئەدەبی تێك شکاند.

فوتـوریزم بـەر لـه یەکـەم جـەنگی جیهـانی لـه ئـەوروپاداو تـا سـاڵی ١٩٢١ لـه ڕووسـیادا بـه تەواوەتی لەناو چوو و هیچ شوێنەوارێکی له پاش بەجێ نەما.

# کۆسمۆپۆلیتیزم

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن دوو شاعیرو نووسەری فەرانسەوی بەناوی (ڤالیری لاربوو ١٨٨١- ١٩٥٦)و (پۆل موران ١٨٨٨- )هێنرایە ناو ئەدەبیاتەوەو لەسەر ئەم بنەمایە رۆنرابوو کە هەموو خەڵکی- هەڵبەتە نەك خەڵکی یەك وڵات بەڵکو هەموو دنیا- پێویستە خۆیان بە هاوڵاتی یەکدی بزانن.

پەیڕەوانی "فوتوریزم"و ڕێبازو قوتابخانە نۆ باوەکانی دیکە، ئەگەرچی دەرهەق بە رابردوو و ئێستا یاخی بوو بوونو شاعیری شۆڕش بوون، لێ لە راستیدا نەك هەر خۆیان لە رۆژگاردا بە تەنیاو دوور خراوە نەدەزانی بەڵکو دەیانویست سوود لە هەر هەموو لەزەتەکانی دنیا – وەکو چۆن هەیە نەك وەکو چۆن ببێ- وەربگرن.

هەڵاتنو نەفرەتی ئەوانە لە وەچەکانی رابردوو لەبەر ئەمە بوو کە بوونی خۆیان بە شایستەی زەمانی ئێستاو شارستانیەتی پیشەسازیو رواڵەتپەرستی دەزانی. لە روانینی ئەم شاعیرانەوە، شیعر هۆیەکە وەکو هەموو هۆیەکانی دیکە کە بە کێشو ئاهەنگی خۆی دەتوانێ جوڵەو خێرایی ژیانی تازە دەربڕێو نیشان بدات. شاعیر لە سەرێتی کە فەتحی جیهان لەلایەن بەشەرەوەو دەستکەوتی تەکنۆلۆژی، کە نیشانەی توانای بەشەرو پێشکەوتنی خێرای بەشەرە، بە شیعر بەرجەستە بکات. چونکە هاتنەدی ئەم ئارمانجە تەنیا لە رێگەی سەفەرو ئامادەبوونی بەردەوامی شاعیر لە هەموو وڵاتانی دنیادا، مەیسەر دەبێت، شاعیر ناچارە لە کۆتو زنجیری نەتەوەیی رزگار بێو خۆی بە هاووڵاتی هەموو خەڵکی دنیا بزانێ. واتە خۆی بە خەڵکی هەموو دنیا بزانێو هەر ئەمەش سەرچاوەی یاساو رێساو پرەنسیپەکانی ئەم قوتابخانەیە پێك دێنێ.

"ڤالیری لاربو" خۆی یەکێك بووە لەو کەسانەی کە سەرانسەری تەمەنی لەشارانو وڵاتانی جیاوازدا بە گەڕانو سەفەر بردۆتەسەر. چەندین زمانی بێگانەی بە باشی دەزانی (کۆمەڵێك نووسینی بە زمانانی ئینگلیزیو ئەسپانیو ئیتاڵیایی هەیە) یەکەم کەس بوو کە بەرهەمی "جمیس جویس"و "باتلەر"و "کوانراد"ی تەرجەمەی فەرەنسی کردووە. "لاربوو" لە ساڵی ١٩٠٨دا شیعرەکانی بە ناوی "شیعرەکانی ئا.ئۆ بارنابوت" بڵاوکردەوە. "بارنابوت" میلیاردێرێکی لاوی خەڵکی ئەمریکای باشوورە کە بە دەوری جیهاندا دەگەڕێو بە دیتنی دەسەڵاتی بەشەر بەسەر سروشتدا مەست دەبێو شیعر دەڵێت. گاڵتە بەو کەسانە دەکات کە "سەفەر ناکەنو هەمیشەو بێ ئەوەی بێ تاقەت بن بەدیار گمێزی خۆیانەوە ژیان بەسەر دەبەن" بەڵام شیعرەکانی خۆیشی بە "نەرمە قۆڕەقۆڕی سك دەچوێنێ کە کەسەکە لێی بەرپرس نییە". بە دیتنی لەزەتی سەفەری ئاسانو ئاسوودەو خێرای ئەمرۆکەو بە دەیمەنی شارانو شارستانیەتانی جۆراوجۆرو بە دیتنی ڤیانو لەزەتی خەڵکان مەستو سەرخۆش دەبێ. لە ناو کەشتیدا دادەنیشێتو لە پڕێکا دەبینێ کە "دەرکۆکەی ژووری کەشتییەکە وەك جامخانەی موغازەیەکە دەریای تیا دەفرۆشن" لێ کە بۆ ژوورە شکۆدارەکەی خۆی لە ئوتێل دەگەڕێتەوە، دەکەوێتە بیری "شنەبای ئێوارەی سەر چەمەنانو بۆنی وێنجەی تازە

درەوکراو"و بیری دیداری شارەکەی خۆی دەکات. ئەنجام لە خۆی دەپرسێت مادامێکی شارستانیەتانی ماددی مرۆڤیان لە ژیانی دەروونیو ناوەوە بێبەش کردووە ئایا ئەرکو پەیامی شاعیر ئەمە نییە کە ئەم ژیانە دەروونیو ناوەکییە بۆ مرۆڤی وێڵو سەرگەردان بگێڕێتەوە.

شیعرو چیرۆكو کۆپلە کورتەکانی "بارنابوت" تا ساڵی ۱۹۲۳ بە بەردەوامی بڵاودەبوونەوە. سەرەنجام لاوی میلیاردێر خەمبارو مەلول، بەوپەڕی پاکیو بێگەردی ئاشقی کیژێکی خەڵکی ئەمریکای باشوور دەبیٚو بەختەوەری لە وڵاتی خۆیدا دەدوزێتەوە.

لە شیعرەکانی "لاربو"دا حەساسیەتی (ویتمن)و تەوس و سەتیری (باتلەر)و باوەڕی چڕوداری "نیتشە"و "جید"و ئیدراکی قووڵی "پروست" بە پاڵ یەکترەوە دەبینرێن.

## ئونانیمیزم

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن "ژول رومن ۱۸۸٥– "ی شاعیرو نووسەری فەرەنسییەوە دامەزراوە. ئەم نووسەرە پێشتر بە هاوکاری شەش شاعیرو نووسەری دیکەی وەك "جورج دوهامل"و "جورج شنوڤیر ۱۸۸٤– ۱۹۲۷"... کۆڕێکی بەناوی "گروە ابئی" دامەزراندو لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دژی تاکپەرستی سیمبولیستەکان هەستا بوونو دەیانویست شیعر بکەن بە مەسئولیەتی هاوبەشی سەدەی خۆیان. ئەوەی لە ناخی دڵی خۆیاندا دەیانبینی دۆستایەتیو خۆشەویستی ئاساییو بەسەر کردنەوەی شادیو رەنجە بەشەرییەکان بوو. "دوهامل" دەیگوت: "ئەگەر شارستانیەتی لە دڵی مرۆڤدا نەبیٚ لە شوێنێکی تریشدا نییە". بەمجۆرە شیعرێك هاتە ئاراوە کە پڕ بوو لە کەڵکەڵەی کۆمەڵایەتیو مرۆڤدۆستیو مەبەستو ئامانجی، بە پێچەوانەی شیعری سەدەی نۆزدەمەوە، بانگەشە نەبوو بۆ هزرو بیرێن گشتی بەڵکو گەرەکی بوو بە پشتیوانی مەحەبەتو سۆز ژیان بگۆڕیٚو شەرەفی راستەقینەی مرۆڤ ئاشکرا بکات.

زۆر نەبرد کە ئەندامانی ئەم کۆڕە لێکدی دوور کەوتنەوەو دوای چەند ساڵێك "ژول رومن" بە کۆمەکی "جورج شنوڤیر" بناغەی قوتابخانەی "ئونانیمیزم"ی داناو تا ساڵی ۱۹۱۳ چەندین کۆ شیعری وەکو "رۆحی مرۆڤان"و "ژیانی بە کۆمەڵ"ی بڵاوکردەوەو هەوڵیدا کە لە رێگەی شیعرەوە روحێك بۆ تیرەو گروپە بەشەرییەکان دروست بکات، روحێك کە لە هەمان کاتدا لە روحیەتی یەك بە یەکی ئەندامانی ئەو گروپە جیاواز بیٚ.

پرەنسیپو بنەماکانی "ئونانیمیزم" لە وردکردنەوەی بۆچوونێکی زۆر سادەوە دەست پێدەکات کە بریتییە لە: لە بوونی هەر یەکێك لە ئێمەدا کۆمەڵێك بیرو هەست هەن کە تایبەتن بە خودی خۆمان، هەروەها بیرو هەستێن دیکەش هەن کە کۆمەڵگەی ئێمەو گروپە بەشەرییەکانی دەوروبەری ئێمە (وەکو خێزانوماڵباتو کەسوکارو هاوکاران)و تەنانەت ئەندامانی کۆمەڵگای گریمانەییو بە رێکەوت (وەکو تەمەشاڤانانی شانۆنامەیەك یان هاوسەفەرانی ناو فارگۆنی قیتارێك) بەسەرمانیا دەسەپێنن. قوتابخانە هونەریو

فەلسەفییەکانی تائێستا دەیانگوت "تاك" بۆ ئەوەی بگاتە پلەی کەماڵ دەبێ کەسایەتی تاکی خۆی پەروەردە بکاتو لە دەست تێوەردانو کاریگەری دنیای دەرەوە پارێز بکات. لێ "ئونانیمیزم" لەبەر رۆشنایی بیربۆچوونە فەلسەفییەکانی (ئۆگست کونت)و تیوریییە کۆمەڵایەتییەکانی "دورکهایم ١٨٥٨- ١٩١٧" ئەم مەسەلەیە ئاوەژوو دەکاتەوەو کۆمەڵگە بە سەرچاوەی پەرەسەندنو هەڵکەوتنو گەشەکردنی هێزە فەردییەکان دەزانێ: گروپە کۆمەڵایەتییەکان دەسەڵاتیان بەسەر هەموو ئەندامانی گروپەکەی خۆیاندا هەیە، ئەو دەسەڵاتە، سەرەڕای بەخشینی ئەقڵی ساغڵەمو داوەری دروست دەربارەی پرسە مرۆڤایەتییەکان، هەستی هاندەری هێزی دەستەجەمیو هاوکاریو برایەتیش بە مرۆڤ دەبەخشێت.

کلاسیزم سەرو سەختی لەگەڵ تاکدا هەبوو، شاعیرانی سیمبۆلیست لە گۆشەی تەنیایدا لە فکران رۆدەچوون، لێ ئۆنانیمیزم روو دەکاتە ئەندامانی کۆمەڵگەو دەڵێت: "بیرو بیرکردنەوەی ئێوە دەبێ بیروبیرکردنەوەی دەستەیەك بێ نەك تاکێك"، چونکە ژنو مێردێك، کۆڕێکی دۆستانە، کۆمەڵێکی جیا، هەر کە لە ئەنجامی ئیمانو ئەڤینەوە بێتە جۆش و خرۆش، روحێکی هاوبەش دەخوڵقێنن کە خودی "خودایە".

دەتوانرێ بگوترێ کە دەستوورو یاساو رێسای ئەم قوتابخانەیە لە سەرچاوەی باوەڕەکانی تۆلستۆیو "بەتایبەتی مەسیحیەتی گوێڕایەڵانەی ئەو" بەیتەکانی "ویتمن" (شاعیری دیموکراسی پیشەسازی)و شیعرێن "ئەمیل وران"ی (شاعیر شارو گوندان)و تێورییەکانی کۆمەڵناسانی وەکو "دورکهایم)و "گوستاف لوبون"و فەلسەفەی ئایدیالیزمەوە ئاوی خواردۆتەوەو پاراو بووە.

"ژول رومن" لە کتێبەکانی دیکەیدا، بە تایبەتی لە رۆمانی "جوامێران"دا تەنیا بە ناساندنو وەسف کردنی ئەم تاقە روحەی کۆمەڵگەوە ناوەستێ، بەڵکو مێژووەکەشی دەڵێتو چارەنووسیشی دیاری دەکات.

## وردە قوتابخانانی دیکە

چەند قوتابخانەیەکی دیکەش لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا وەکو بریسکەیەکی خێرا درەوشانەوەو زوو ئاوا بوون، هەندێ لەو قوتابخانە تەمەن کورتانە بریتیین لە: "قوتابخانەی رومن" (کە زیاتر خەریکی سیاسەت بوو تا ئەدەبیاتو، رزگاری لە گەڕانەوە بۆ رابردووی دووردا دەبینی). و قوتابخانەی "ڤێرلیبریزم" (لایەنگری شیعری ئازاد) بوو و "هومانیزم"و "کلاسیسزم"و "رۆمانتیزمی نوێ"، بەڵام هیچ یەکێك لەم قوتابخانۆکانە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە کە نووسەرانو شاعیرانی گەورە لە دەوریان خڕببنەوە.

# کوبیزم
# پێشەکی رووداوە ئەدەبییەکانی پاش جەنگ

وەکو لە فەسڵی پێشودا ئاماژەمان کرد، ئەو قوتابخانە تازانەی کە پاش قوتابخانەی سیمبولیزم لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هاتنە ئاراوە، تاوەکو سەدەی بیستەمو جەنگی جیهانی یەکەم درێژەیان کێشا. چەندین نووسەری گەورەی وەکو "ژۆل رومن"و "ئاندریە جید" کە لە بواری رۆمانو شانۆنامەو لێکۆڵینەوەدا ناوبانگیان دەرکرد، کاری ئەدەبی خۆیان بە شیعر دەست پێکردبوو. لە ئەنجامدا مشتومڕێکی توند دەربارەی هونەری شیعرو تەنانەت جەوهەرو چۆنیەتی شاعیری دەستی پێکرد کە دەشێت بنەماکانی ئەو مشتومڕانە لەم خاڵانەدا کورت بکرێتەوە:

١- ماهیەتو چۆنیەتی "ئیلهامی شاعیرانە" چییە؟ ئایا شیعر دەبێ دوا پلەی تەجەلی هێزی ئەقلانی بێ یان لەگەڵ عیرفانو ئیشراقدا ئاوێتە ببێ؟ ئایا شیعر جۆرە تاقیکردنەوەیەکی مەزهەبیو ریازەتە؟ یان گەمەیەکی بێ هودەی وشەو کێشو ئاهەنگە؟ "ژۆل رومن" لە کتێبی "داهێنەران"دا بیۆگرافی شاعیرێك دەنووسێتەوە کە بەگوێرەی رێکەوت کۆمەڵێك وشەی لە فەرهەنگان دەرهێناوەو لە پاڵ یەکدیدا ریزی کردوونو بابەتێکی تازەی بۆ شیعر دانان کەشف کردووە. "دادئیزم" لە مەوە پەیدا دەبێ.

٢- ئایا شیعر دەبێ ببێ بە "عەرەبانەی فیکر"و بیرو باوەڕی قووڵی فەلسەفی بەرجەستە بکات؟ یان تەنیا خەریکی دروستکردنی ئاهەنگی خۆش بێو مانا بکات بە پاشکۆی مۆسیقای پەیڤ؟ ئا لەمەوە مشتومڕی "شیعری خالیسە" دەست پێدەکات.

٣- ئایا شیعر دەبێ، لە هەموو حاڵێکدا، مانای روونو دیارو رەوانی هەبێ یان بەشێوەی مالارمیە بخزێتە ناو هزرو بیری ئاڵۆزو تاریکەوە؟ بە واتایەکی دی ئایا شیعر دەبێ بە جۆرێ بێ کە جەماوەرێکی زۆری خەڵکی لێی حاڵی ببن یان دەبێ بۆ ژمارەیەکی کەمو هەڵبژاردە بێ؟ "پول ڤالیری" لایەنگری پرەنسیپی دووەمە. واتە شیعر دەبێ بۆ کەمینەیەکی تایبەتو هەڵبژاردە بێ.

٤- ئایا شیعر دەبێ هەر هەموو دابو نەریتو یاساو رێسا ئەدەبییەکان رەفز بکاتو پەیڤو زمانێکی تازە بدۆزێتەوەو شێوەیەکی دیکەی دەربڕینو گوزارشت کەشف بکاتو تا کۆتایی درێژە بە بیدعەتەکانی "رامبۆ" و "لافورگ" بداتو لە کۆتو زنجیری زمانی باوو دەربڕینو دەستەواژەی رۆژ بخەلەسێو لە وڕینەی پەیڤاندا نقوم ببێ؟ بنەماکانی قوتابخانەی "سوریالیزم" لێرەوە هەڵدەقوڵێن.

٥- سەرەنجام، ئایا شاعیر دەبێ پابەندی کێشو قافیەی کۆن بێ یان روو بکاتە شیعری ئازادو تەنانەت کێش و قافیەو عەروزو بەحران وەلاوە بنێو جگە لە پەخشانێکی ریتمدار چ شتێکی دی نەڵێ؟

ئەم مەسەلانە لە زۆر کتێباندا خراونەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە لەوانە کتێبی: "هونەری شیعر ١٩١٣"ی پول کلودل و "نامەیەك دەربارەی سنعەتی نەزم-١٩٢٣"ی ژول رومن و شنوڤیر، "شیعری خالیسە- ١٩٢٥"ی ئابەبرمون، و "بەیاننامەی سورریالیستەکان" و ئەو وانانەی کە پول ڤالیری لە قوتابخانەی (کۆلیژی دوفرانس) دەیگوتنەوە، بە تایبەتی نامەی "پێشەکییەك بۆ هونەر ی شیعر"٠

هەڵبەتە وەڵامی هەمەجۆرو ناکۆکی ئەو پرسیارانە دراوەتەوە٠ ژمارەیەك لە شاعیران لە پێشی پێشی ریزی توندڕەوانەوەن و دەستەیەکی دی پەیڕەوی ((خیر الامور اوسطها)) دەکەن و هەندێکی دی بۆ پاشەوە گەڕاونەتەوەو بیروباوەڕە کۆنەکانیان بە گوێرەی حەزو زەوقی خۆیان تەفسیرو شرۆڤە کردووەو لە ئەنجامدا قوتابخانەێن "کلاسیسزمی نویٚ"و "رۆمانتیزمی نویٚ"یان هێناوەتە ئاراوە. بەڵام توندڕەوترین بۆچوون و وەڵام هی قوتابخانەی "کوبیزم"ـە کە بەر لە یەکەم جەنگی جیهانی سەری هەڵدا. و ئێستا دەێینە سەر باسی ئەم قوتابخانەیە.

## کوبیزم لە نیگارکێشیدا

کوبیزم پێش ئەوەی بێتە جیهانی ئەدەبیاتەوە، لە بواری نیگارکێشیدا دەستی پێکرد. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هێشتا پرەنسیپەکانی قوتابخانەی "ئیمپریسیونیزم" بەسەر دنیای نیگارکێشیدا حوکمڕانی دەکرد. قوتابخانەکانی دواتر، وەکو قوتابخانە ئەدەبییەکان، روویان کردە تێورییە توندڕەوەکان و پێکدادانی نێوان لایەنگرانی نوێ و لایەنگرانی کۆنیان بێدارکردەوە. توتابخانانی "پێشڕەو" گاڵتەیان بەلاسایی کردنەوەی دنیای دەرەکی و شرۆڤەی موو بە موو و یاساو رێسای کۆنی پلۆت و نەخشە دەکرد. قوتابخانەی "ئیکسپریسیونیزم" دەیویست هەستە تایبەتییەکانی هونەرمەند، ئەگەر سەیرو سەمەرەو عەجیب و غەریبیش بیٚ، نیشان بدات. قوتابخانەی کوبیزم کە هونەری "مجەڕەدە" هەوڵ دەدات روانینی خۆی بۆ شتان و تەنانەت بۆ بوونەوەرانیش لە فۆرمی ئەندازەییدا نیشان بدات. دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە "بیکاسۆ"و "براك"و "دیرین"و ژمارەیەك لە لایەنگرانی ئەوان بوون.

بە کورتی و پوختی دەتوانریٚ ئەم قوتابخانەیە بەمجۆرە پێناسە بکریٚ کە کوبیستەکان دەخوازن لە نەخشاندنی هەر دیمەنێکدا جگە لەو بەشەی کە بەچاو دەبینریٚ بەشە پەنهان و نا دیارەکانیش نیشان بدەن و هەموو روو و رەگەزە بنەڕەتییەکانی هەر شتێك لەیەك کاتدا بەرجەستە بکەن. بەمجۆرە، کوبیستەکان نیگارکێشی بە تەواوەتی لە حەقیقەتی واقیع دوور دەخەنەوە، واتا نموونەی ئەو تابلۆیەی کە نیگارکێشی کوبیست خستویەتیٚ سەر پەردە هیچ کاتێك بەو شێوەیە لە دنیای دەرێی تابلۆکەدا نابینین.

بۆ نموونە با ئەم تابلۆیە لەبەرچاو بگرین: لەم تابلۆیەدا پایپێك و گیتارێك کە نیوەی دیارەو پێچکەی قیتارێك و سمێڵی شوفێری قیتارەکەو نیوەی رووی ژنێك-ی نیگارکێش دەبینریٚ. هەر هەموو ئەم شتانە ئاوێتەی یەکتر کراون و تەلی تەلەگراف و تیشکی هەتاویشی بۆ زیاد کراوە. ئەم

تابلۆیە ناوی "خۆرئاوا لە ئەتوی"دایەو ئاشکرایە کە نیگارکێش ویستویەتی هەستە جیاوازەکان سەبارەت بە یەك سات، لەیەك شوێندا، واتە لەیەك تابلۆدا کۆبکاتەوە.
یەکەم کەس کە زاراوەی " کوبیزم"ی بەکارهێنا "هنری ماتیس"ی نیگارکێش بوو. دەڵێن "ماتیس" رۆژێ بەدەم تەماشاکردنی یەکێك لە تابلۆکانی "براك"ەوە دەڵێت: "ئۆ! تۆ تەمەشای ئەو وردە شەشپالوانە بکە!" لەوە بەدواوە ئیدی ئەم زاراوەیە بە باڵای ئەم جۆرە نیگارکێشییەدا بڕا.

## کوبیزم لە ئەدەبیاتدا

یەکەمین شاعیر کە بەسەرکەوتوویی کوبیزمی هێنایە ناو ئەدەبیاتەوە "گیوم ئاپولینر ١٨٨١-١٩١٨" بوو کە بە یەکێك لە هەوادارانی جددی کوبیزم لە بواری نیگارکێشیدا دەژمێردراو کتێبێکیشی هەیە بە ناونیشانی "نیگارکێشانی کوبیست". "ئاپولینر" پێشتر لایەنگری قوتابخانەی سیمبولیزم بوو و پاشان بەگەرمو گوڕیو جۆشو خرۆشی لە رادەبەدەرەوە پەیوەندی بە هەموو قوتابخانە "پێشرەو"ەکانەوە دەکردو نەخشەو پلانی تازەی بۆیان دادەڕشتو بنەمای نوێی دادەناو بە زەبری بلیمەتی شیعری و کاریگەری قسەو فرە بەهرەییو تازەخوازی خۆی رێگەی سەیری بۆ شاعیرانی لاو دەکردەوە. هەڵبەتە دەبێ ئەو بە پێشەوای بێ چەندو چوونی هەر هەموو شێوازە تازەو توندڕەوەکان بژمێردرێ. چونکە هەموو ئەو شاعیرانەی کە پاش ئەو بناغەی قوتابخانەیەکی تازەیان دانابێ لەژێر کاریگەری بیروباوەڕو شیعرەکانی ئەودا بوونە.
"ئاپولینر" لە ساڵی ١٩١٠دا هاتە سەر ئەو قەناعەتی کە شاعیریش، وەکو نیگارکێشی کوبیست، وا چاکترە لە بری نیشاندانی یەك لایەنی شتێك، هەر هەموو لایەنەکانی ئەو شتە نیشان بدات: بەم مانایەی کە بەشەکانی شتە دەرەکییەکان "تەجرید" بکاتو ئەگەر نەتوانێ، ئەوا بەلای کەمەوە تەرتیبو تەنزیمی شتەکان تێك بداتو پاشان ئەو بەشانە سەر لە نوێ لە پاڵ یەکدیدا ریز بکات بێ ئەوەی بە پەیوەندی لۆژیکیو یادەوەری و هەستو تەسەورو سەلماندن پێکیانەوە ببەستێ. بەمجورە شاعیر دەتوانێ بگاتە "سورریالیتە"و رێبازێکی تایبەتی بۆ خوڵقاندنەوەی دوو بارەی جیهان بەدەست بێنێ. قوتابخانەی سورریالیزم لەو شوێنەوە هەڵدەقوڵێ. تەنانەت زاراوەی سورریالیزم-ش خودی "ئاپولینر" دایهێناوەو دروستی کردووە. (پێشتر، لەساڵی ١٨٤٦دا، بۆدلێر وشەی "سور ناتورالیزم"ی بۆ نیگارکێشی تازە پێشنیاز کردبوو).
تایبەتمەندی ئەم جۆرە شیعرە ئەمەیە کە دەست پێشکەری کارەکە بە وشە دەسپێرێ، وێنەی زەینی بەدەر لە هەر پەیوەندێکی لۆژیکی، گەرم گەرم لە بیرەوە هەڵدەقوڵێ (لەبەر ئەمە پێویست بە خاڵبەندی نامێنێ) بدعەتو هونەرێکی تایبەتی لە ریزکردنی پیتەکانی چاپخانەدا دێتە ئاراوە تا بۆ چاویش لەزەتو دەرکێکی تازە پەیدا ببێ (جۆری چاپکردنی هەندێ پارچە شیعری ئاپولینر، بەپێی بابەتو ناوەڕۆك، بەشێوەی دڵو دڵۆپە بارانو پەڕەسیگارو سەعاتو بۆینباخ-

ه)و شاعیر لە بونیادی رستەو یاساکانی دەستووری زمانو هەڵبژاردنو بەکارهێنانی کێشی دەگمەنو ناباودا ئازادی ئازادە.

هەر چەندە لە ئەنجامی بەرپا بوونی جەنگی جیهانی یەکەمو مردنی لە نکاوی ئاپۆلینردا، کوبیزم بایەخو ئیحتوباری خۆی لە دەستدا، بەڵام ئەو رێچکە تازانەی کە ئاپۆلینر لە شیعردا گرتبوونییە بەر، لەلایەن شاعیرانی ئایندەوە لاسایی دەکرانەوەو قوتابخانانی تازەی وەکو "سورریالیزم" کە درێژەی کوبیزم بوو، ئیلهامیان لە شیعری "ئاپۆلینر"ەوە وەردەگرت.

لە نێو ئەو شاعیرانەی دیکەدا کە لەسەر ئەم قوتابخانەیە حەساو بوون دەکرێ ناوی ئەمانە ببرێ: ئاندریە سالمون، ماکس ژاکوب، پیر ریڤێردیو جان کوکتو.

# دادائیزم

قوتابخانەی "دادا" یا "دادائیزم" زادەی ئەو نائومێدیو پەشێویو پەرێشانیو ئاژاوەیە بوو کە لە ئەنجامی وێرانکاریو مرۆڤکوژیو بێدادی یەکەم جەنگی جیهانییەوە سەری هەڵداو دروست بوو. زمانحاڵی کەسانێکە کە ئومێدیان بە جێگیریو بەردەوامی هیچ کارێك نییەو هیچ شتێك لە ژیاندا بە پایەدارو مکومو جێگیر ناژمێرن. مەبەستی پەیڕەوکارانی ئەم قوتابخانەیە جۆرە یاخی بوونێکە دژی هونەرو ئەخلاقو کۆمەڵ.

دەخوازن بە شەرییەتو لە پێشەوە ئەدەبیات لە ژێر نیری ئاوەزو لۆژیكو زمان ئازاد بکەن! جا بەم حاڵەشەوە نابێ چاوەنۆڕی ئەو بکرێ کە لایەنگرانی دادئیزم شێوەی کاری خۆیان بە زمانێکی روونو مەفهوم ئەنجام بدەن، چونکە بناغەی ئەم قوتابخانەیە لەسەر نەفی بووە بۆیە ناچار بووە شێوەی کاری خۆیشی نەفی بکات.

لەبەر ئەوەی سەروکارمان لەگەڵ سەیرترین قوتابخانەدایە، بۆیە ناچارین بەخێرایی چاوێك بە رابردوودا بخشێنینەوەو ئەو رەوتو رێبازانەی کە دوای سیمبولیزم لە شیعری ئەوروپاییدا هاتوونەتە ئاراوە، جارێکی دی، بە کورتی تەماشای بکەینەوە تا تێ گەیشتنی هۆیەکانی سەرهەڵدانی قوتابخانەکانی دیکە ئاسانتر بێ.

## چاوخشانێك بە رابردوودا

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، گەلێك لەو شارەزایانەی کە سیمبولیزمیان بە دوا بەرەنجامی هێزی ئەقڵی مرۆڤانی دەزانی لە بەرانبەر ئەم "رۆشنبیران"ـەدا وەستانەوەو ئاڵای مخالەفەتیان هەڵکرد. "شارل لویس فیلیپ"ی نووسەری ئەم زەمانە، هاوار دەکات کە "ئێمە ئێستا پێویستمان بە هۆڤیانو وشەێن هۆڤی هەیە"و ئاندریەجید لە "خوانی زەمینی"دا، ئەو کاتەی کە گەشتیارە لاوەکە دەخوازێ بەپێی پەتی بەدەوری جیهاندا سەفەر بکات، لە دووی "هەستی تازە" دەگەڕێ. نووسەرانو شاعیرانی دی بەناوی "نیشاندانی هەموو ژیان"ەوە قسە دەکەن. "والت ویتمن" کە بەڕای ئەو "شیعر ئامانجێکی بالاترو فریشتەیی تری لە ژیانی واقیعی" نییە، بە زەبری غەزەلخوانی شاعیرانی خۆی پەرستنی ژیان لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنێو هەمیشە پرسیارەکەی نیتشە دەخاتەوە روو کە "ئایا قووڵترین غەریزەی هونەرمەند بەرەو هونەر دەڕوات یان بەرەو ژیان؟" هەندێکی دیکە بیر لە دۆزینەوەی ئیمکاناتی شاعیرانەی تایبەت بە دنیای تازە دەکەنەوە: ستایشی فەتحی جیهانو ماشینانی جوانی نوێ کە نیشانەی توانای بەشەرییە، دەبێتە سەرچاوەی ئیلهامی شیعری "بلزساندرارو ئاپولینرو لاربو" قوتابخانەی ریالیزم بەشێوەی مەرامێکی کۆمەڵایەتی لە قوتابخانەی (ئونانیمیزم)دا تەجەلی دەکاتو دەبێتە شرۆڤەکاری ئەم مەبەستەی کە "شیعر دەبێ واقیع بناسێت چونکە واقیع ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ

بە دڵو بەگیان کۆششی تیا دەکات". شاعیر کە بە ژیانی دەستەجەمی مرۆڤاندا هەڵدەڵێ پێویستە یارمەتیان بدات تا "رۆژێ لە رۆژان ئەو ژیانە دەستەجەمییە بێتە دی".

ئەم شیعری پەرستنی واقیع و کۆمەڵگەو کارو ژیانی تازەیە دەبێتە دیاردەیەکی عالەمگیرو جیهانی. لە ساڵی ١٩١٣دا قوتابخانەی "ئیماژیزم"ی ئینگلیز هەوڵدەدات کە وێنەیێن زهنی بەر لەوەی لە زەیندا پێك بێن، بگرێو بە زەبری دەربڕین بەرجەستەیان بکات: ئەم قوتابخانەیە، واقیع لە چوارچێوەی "هەستی هەنووکەیی و خۆبەخۆ" دادەگرێت. لە ئەمریکادا "کارل سەندبێرگ"ی حەماسەویژی مەدەنیەتی پیشەسازیو، "روبرت فراست"ی شاعیری سروشت، دەکەونە عەودالڵو سۆراخی "گوزارشتی بابەتگەری". "ریلکە" کە شیعرەکانی لە سەرچاوەی سیمبولیزمی پەتیو دەروونییەوە هەڵدەقوڵان بەرەبەرە واقیعیەتی دنیای هەست پێکراو کەشف دەکاتو نەگبەتی گۆشەگیری ژیان لە پایتەختە تازەکاندا کەشف دەکات. "فوتوریزم" شیعری "ئەنتی غەزەلخوانی" لە جێی "سیمبولیزمی ئیشراقی" دادەنێو نەوای مەدەنیەتی تازە بەگوێی ئیتاڵیای وێرانەدا دەدات. لە رووسیادا شیعری ریالیستیو کۆمەڵایەتی جێی سیمبولیزمو دەربڕینی دەستکردو هونەری باڵا دەگرێتەوە.

گۆرانی شیعرەکانی "بلوك" گەواهی ئەم ئیدیعایەیە: شاعیر دوای ئەوەی لە "نەژادی ژن"دا بۆ سەرچاوەی ئیلهامی خۆی دەگەڕێ، ئەنجام لە ژینگەی دزێوی مەیخانەکانی دەوروبەری شارەوە سەر دەردێنێ (بەتایبەتی لە پارچە شیعری "ژنی نەناسدا"و لە بەیتی "دوازدە دانەدا ١٩١٨"، کە لە یەك کاتدا هەم واقیعی زبرو بێ پەردەی شۆڕش شرۆڤە دەکاتو هەم لەگەڵ هەر سازو ئازازێکدا دێتە دەنگو گفتوگۆی سەربازانو نەعرەتەی مەستانو جنێوی بێ سەروبەران دەڵێتەوەو پاشان تا دوا پلەی شیعرێن بەزمیو رەزمی هەڵدەکشێت. شیعری رووسی پاش شۆڕش، یەخسیری "ئیماژیزم"ی ئینگلیسو ئەمریکاو "فوتوریزم"ی ئیتاڵیا دەبێ.

نووسەر کە وەکو هەر مرۆڤێکی دی، لە گێژاوو قەیرانی شارستانیەتی سەدەی بیستەمدا هەڵدەسووڕێ ناتوانێت چاو پۆشی لە کاریگەری ئەم قەیرانە بکات. لافو گەزافی پەیامی کۆمەڵایەتی شاعیر، دیسان قوتابخانەی رۆمانتیزم بە شێوەیەکی تازە دێنێتەوە مەیدانو جێگەی ئومێدی ناکامی "رەهاجۆیی" دەگرێتەوە. (شتفان گیورگی)ی شاعیری ئاڵمانی، بانگەشە بۆ باوەڕێکی تازە دەکات: شاعیری ئایندە کە بۆ خۆی نوێنەری تواناو شکۆو باڵادەستییە دەبێ مرۆڤایەتییەك دروست بکات کە لە سەرووی ئەم مرۆڤایەتییەی ئێستاوە بێ. واتە لەم مرۆڤایەتییەی ئێستا باڵاتربێو مژدەی دەرکەوتنی خودایەکی تازە بدات.

لە شیعری کۆمەڵگەپەرستی قوتابخانەی "ئونانیمیزم"وە تا شیعری جەماوەری (مایاکوفسکی)، تا شیعری ئاراگۆنو ئیلوار کە زادەی پێداویستییەکانی کاتو شوێنە، لە بەرهەمێن "مك نیس"ی ئیرلەندیو "سپندەر"ی ئینگلیزییەوە (کە بزاڤی "شیعری نوێ"و "نووسینی نوێ" یان بەرپا کردووە) تا شیعرێن "روفائیل ئالبرتی"ی ئەسپانیاییو "پاپلونیرۆدا"ی شاعیری شیلی. بزووتنەوەیەکی شاعیرانەی گەورەو عالەمگیر بەدی دەکرێو هەست پێ دەکرێ.

دادائیزم لە نێو ئەم بزاڤە شیعرییە تازانەدا، بە مەبەستی عینادی دەگەڵ جیهانی شیعرو ئەدەبدا، سیمای پێکەنیناوی خۆی هێنایە بەرەوەو بۆ ماوەی چەند ساڵێك هەراو هەنگامەیەکی سەیری بەرپاکرد. ئەم "قوتابخانەیە"، ئەگەر بشێت ناوی قوتابخانەی لێ بنرێ، لە بنەڕەتدا مناڵێکی نوقستانو شێواو بوو کە دەبووایە بە ناچاری لە نێو رووداوەکانی ئەمشەوە ئاوسەدا، و بە تایبەتی لە ژینگەی بۆرانی جەنگی جیهانی یەکەمدا، لە دایك ببێ.

## کاریگەری جەنگ

جەنگی جیهانی یەکەم، باڵە خوێناوییەکانی خۆی بەسەر ئەوروپادا کێشا. بڵاوکردنەوەی کتێبو گۆڤاران وەستا. لە مەیدانانی شەڕدا، لە نێو جەستەی بێ گیانی سەربازاندا، سیمای خوێناوی نووسەرانو شاعیرانی گەورەش دەبینرا: (گیوم ئاپۆلینرو شارل پگیو ئالن فورنیە) بوونە قوربانی جەنگ.

لە کتێبێکدا بە ناونیشانی "گوڵبژێرێك لە بەرهەمی ئەو نووسەرانەی کە لە جەنگدا مردوون" چاپی ١٩٢٤، ناوو دەست خەتی ٥٠٠ کەس لەو شاعیرو نووسەرانەی کە لە جەنگدا کوژراون، تۆمارکراوە. لە زەرف دوو ساڵی یەکەمدا ئەدەبیاتی هەموو ئەوروپا دووچاری ئیفلیجی بوو. مێشکی خەڵکی جگە لە رووداوی ترسناكو هزرو بیری شێواوو کارەسات ئەنگێز جێی هیچی تری تیا نەدەبووەوە.

بە هەرحاڵ، جەنگ نەیتوانی گۆڕانێکی گرنگ لە هونەرو تەکنیکی نووسەرایەتیدا بەرپا بکاتو ئەو بنەمایانەی کە پێشتر چەسپی بوون بشڵەقێنێ. بۆیە ئەو رۆمانانەی کە دەربارەی جەنگ دەهاتنە نووسین لەسەر بنەمای هەمان شێوەو تەکنیکی بەر لە جەنگ دەنووسران. ئەو مەسەلانەی کە جێی بایەخی نووسەران بوو بریتی بوون لە هەندێ مەسەلەی بنەڕەتیو سادەی وەکو چارەنووسی بەشەریەتی گیرۆدەی دەستی مەرگو نابوودی: بابەتی رۆمانان بریتی بوو لە هەوڵو کۆششو ترسو لەرزو پەرێشانیو مەرگو خەبات لە پێناوی سەرکەوتندا. هەندێ لەوبەرهەمانەی کە بە جوانیو چاکی پەردە لەسەر دزێویو کارەساتەکانی جەنگ لادەبەن بریتین لە: "ئاگر"ی هنری باربۆسو، "ژیانی شەهیدان"و "تەمەدون"ی جورج دوهاملو "خاچێن دارین"ی رولان دورجلسو بەیتی بەنێوبانگی "مەرگی قارەمانێك"ی ریچارد ئالدینگتون.

لێ، لە هەڕەتی جەنگدا، وەچەیەکی تازە دەهاتە ئاراوەو کۆمەڵگەیەکی تازە دروست دەبوو: ئەو لاوانەی کە لە باوەشی خێزانو ژینگەی قوتابخانە دەهێنرانە دەرێو یەکڕاست بەرەو مەیدانەکانی جەنگ راپێچ دەکران، جگە لەو دیمەنە تیژ تێپەڕو بێ سەروبەرو سامناکانەی کە چوار ساڵی رەبەق بە بەرچاویانەوە بوو، جگە لە زەبرو زەنگی هەوسار پچڕیو، جگە لە نەفرەتو نەفرینی کۆمەڵگە بەشەرییەکانو بێ قەراری مەدەنیەت چ شتێکی دیکەیان نەدەبینیو مامەڵەیان لەگەڵ هیچی دیدا نەدەکرد. نووسینی بانگەشەیی هەموو شوێنێکی پڕ کردبوو و ئەم "زمانبازییە" قیزەوەرە، هەموو جۆرە نووسینێکی لەبەرچاو خستبوون. درۆو وێرانیو پەشێویو ئاژاوە هەر چوار دەوری تەنی بوون. بۆیە هەقیقەتو واقیع لەبەر چاوی ئەوان جگە لە

تارمایی و تاپۆیەك چ شتێکی دی نەبوو و، زۆربەیان دوا چارەیان لەوەدا دەبینییەوە کە بچنە خەڵوەتی ناخی خۆیانەوەو لە دەرونی خۆیان رابمێنن و قوولببنەوە، پاش کۆتایی جەنگ و هێور بوونەوەی رواڵەتی بارودۆخەکان، لەو دەمەدا کە چاوەنۆڕی ئەوە دەکرا بە بۆنەی سەرکەوتنەوە، جۆرە ئەدەبیاتێکی کلاسیکی و قارەمانیەتی و سوارچاکی بێتە ئاراوە، لە پڕ جۆرە (خودجۆیی)یەك لە دنیای ئەدەبیاتدا پەیدا بوو کە دەکرێ ناوی (رۆمانتیزمی نوێی) لێ بنرێ.
لێ ئەم قۆناغە جۆرە حاڵەتێکی تەقینەوەیی و ناگەهانی ئەوتۆی گرتبووە خۆ کە تەسەور دەکرا چارەنووسێکی تاریك لەبەردەم ئەدەبیاتی ئەوروپادایە، ئەو پەشێوییە فیکری و رەشبینی و هەستی تۆڵەسێنی و پەریشانییە روحییە یاخی گەریەی بەسەر هەموو قوتابخانەو شێوازە ئەدەبییەکانی رابردوودا زاڵ بوو، وەچەی لاوانی بەرەو ئاژاوەو سەرگەردانی و بێ سەروبەری لە ئەدەبیاتدا برد: هەست دەکرا کە دنیایەکی تازە لە دایك دەبێ، کە لەو دنیایەدا هەموو شتێك – سیاسەت و ئابووری و تەنانەت فیکریش– مەغشوش و تێکەڵ و پێکەڵە، ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بارە بەسەر چارەنووسی تاکەوە، ئیدی چ شتێك بۆ دۆزینەوەو کەشفکردن نەماوەو هیچ کارێك ناکرێ جگە لە هات و هاواری یاخی بوون و ناڕەزایی. ئەم یاخی بوون و هەراو هەنگامەو ئاژاوەیە، یەکەمجار لە قاڵبی قوتابخانەیەکی وێرانکاری تیژتێپەڕدا بەناوی "دادائیزم" لە ئەدەبیاتدا سەری هەڵدا.

## دامەزراندنی گروپی دادا

نەخشەی قوتابخانەی "دادا" یەکەمجار لە پاییزی ساڵی ١٩١٦دا لە گۆشەی دوکانێکی بیرەفرۆشی لە شاری زوریخ–ی سویسرادا لەلایەن لاوێکەوە بەناوی "تریستان تزارا" و چەند هاوڕێیەکییەوە کە بریتی بوون لە (هانس ئارپ)ی خەڵکی ئالزاس و دوو کەسی ئەڵمانی هاتە دارشتن.
"تزارا" بۆ ئەوەی ناوێك لەم قوتابخانەیە بنێ، هەستا فەرهەنگێ لاروس–ی هێناو چەقۆیەکی لە گیرفانی دەرهێناو ئەڵلاخوایی پارچەیەکی لە نێو لاپەڕەکاندا بڕی. ئەو پیتانەی کە بەسەر پارچە کاغەزەکەوە مابوون، لێکی دان و وشەی "دادا"یان لێ پێکهات و دامەزرێنەرانی ئەو شێوازە نوێیە کردیان بە ناونیشانی قوتابخانەکەی خۆیان. تریستان تزارا چەند گۆڤارێکی دامەزراند بە ناوی "مەیخانەی ڤولتێر" و "دادا" و "بنیادەمخۆر". هەروەها تزارا یەکەمین بەرهەمی "دادایی" بڵاوکردەوەو پاشان لە ساڵی ١٩١٩ بەدواوە مەڵبەندی چالاکی و چەلەنگی دادا بۆ پاریس گواسترایەوە.
لەم بەینەدا، ئەو کوبیستانەی کە درێژەیان بە رێبازی "ئاپولینر" دەدا، خۆیان لەم گروپە نزیك کردەوەو شاعیرانی وەکو "ئاندریە بریتون" و "ئاراگۆن" و "ئیلوار" و "فیلیپ سوپو" و هەندێکی دیکە پەیوەندییان بەم یاخیانەی جیهانی ئەدەبەوە کرد. "فرانسیس پیکابیا"ی نیگارکێش و شاعیری ئەسپانیایی کە لە ئەمریکا دەژیا، بەپەلە خۆی گەیاندە فەرەنسا و چووە کۆڕی دادیستەکانەوە. لە هەمان ساڵی ١٩١٩دا نووسەرانی گۆڤاری "ئەدەبیات"ش یەك دڵ و یەکزمان

پـەیوەدییان بـە گروپـی داداوە کـردو گۆڤارەکـەی خۆیـان بـۆ بڵاوکردنـەوەی هـزرو بـاوەڕی دادائیسـتەکان تـەرخانکرد. ئـەم گروپـە سـەیرو سـەمەرەیە پـاش ئامـادەبوونی تـەواو کەوتنـە کۆڕگرتنو بە هەراوهوریاوە دەستیان کردە ناساندنو نیشاندانی قوتابخانەکەی خۆیان.
یەکەم کۆڕی گوتاربێژی ئەم گروپە لە ١٩٢٠/٢/٥دا گیرا. لەم کۆڕەدا بەیاننامەی قوتابخانەی دادا، کە لەلایەن "فرانسیس پیکابیا"وە نووسرا بوو، خوێندرایەوە، ئەمەش دەقی بەیاننامەکەیە:
"تێ ناگەن کە ئێمە چ دەکەین؟ وا نییە؟ دۆستانی ئازیز! ئێمـە خۆمـان لـە ئێوە کـەمتر لـەم بابەتـە تێدەگەین. چەند خۆشە! هەقتانە. حەزم دەکرد جارێکی دیکە لە هەمێزی پاپدا بخەوم. هەمدیس تێناگەن؟ منیش تێ ناگەم. چەند مایەی گریانە!".
خەڵکەکە کە گوێیان لەم بەیاننامە سەیرە بوو لە قاقای پێکەنینیان داو بە گاڵتەیان زانی.
دووەم کۆڕیان لە ١٩٢٠/٣/٢٠دا بە گەرمو گوڕییەکی زیاترەوە سازدرا، کاردانـەوەی ئامادەبووان بە رادەیەك توندبوو کـە کـار گەییـە جنێودانو تـێ هەڵدانو هێزی ئینزیبـات ناچار بـوو بکەوێتـە بەینەوەو بە زۆر هۆڵەکە چۆڵ بکات. کۆڕەکانی دواتر کە لـە هـەمان ساڵدا گیران هێدی تـرو ئارام تـر بوون، لـێ وتارەکـانی تریسـتان تـزارا، کـە بـە زمـانی تایبـەتی دادا پێشکەش دەکران، لـە نێو هاواری نارەزایی خەڵکیدا دامرکانەوە.
لێرەدا جێی خۆیەتی بەشێك لەو شەرحەی کە خودی تریستان تزارا دەربارەی کارەکانی گروپی دادا نووسیویەتی نەقڵ بکەین. تزارا کە دوای نەمانی قوتابخانـەی دادا بـوو بـە سوورریالیست، لـە ساڵی ١٩٤٨دا نامەیەکی بەناوی "سوورریالیزم لە دوای جەنگ" بڵاوکردەوەو بەرەڤانی لە دادئیزم وەکو "پێشەکییەك بۆ سوورریالیزم" کردووەو دادائیزمی بە شۆڕشێك لە بواری ئەدەبو کۆمـەڵو، راپـەرێنێك لـە بەرانبـەر بـەدکارانو گەوجانـدا دانـاوە. ئەوسـا دەربـارەی لایەنـە پێکەنیناوییـە حەیابەرەکانی دادائیزم دەنووسێت:
"لێرەدا لایەنە پڕ هەراو هەنگامەو نیمچە حەیابەرەکانی داداش فەرامۆش ناکەین. چونکە ئەویش یەکێك بوو لـە فاکتـەرە شاعیرانەکانی دادا. لـە بیرمـە کـە لـە سـاڵی ١٩٢١دا نمایشێکمان لـە هـۆڵی "گـاوۆ"دا هـەبوو. خـەڵکی هـەموو هەسـتابوونە سـەرپێو دەسـتیان بـەرزکردبووەوەو هاواریـان دەکردو جنێویان دەدا. نماییشە راستییەکە لە هۆڵەکەدا ئەنجام دەدراو ئێمەش هـەموو لـە دەوری تەختـەی شـانۆکە وەسـتابووینو تەمەشـای هۆڵەکـەمان دەکـرد. بەرنامەکـەمان بـریتی بـوو لـە شـانۆنامەیەك بـەم نێوەڕۆکـە: دوو کـەس لەسـەر تەختـەی شـانۆ رووبـەڕووی یەکـدی دەبـوون، یەکەمیان دەیگوت "نووسینگەی پۆستە لەو بەرانبەرەیـە" دووەم وەڵامـی دەدایـەوە: "جا مـن چـم لە دەست دێ"و پـەردە دادەڕایەوەو شانۆنامەکە تـەواو دەبوو. هـەروەها شـانۆنامەیەکی دیکـەی ئاندریـە بریتـونو فیلیـپ سـوپو لـە بەرنامـەدا بەناونیشـانی "بـێ رەحمـەت..." کـە تـەنیا پـەردەی یەکـەمی ئـەنجام درا. لـە پـەردەی دووەمـدا بـە گـوێرەی ئـەو بەرنامەیـەی کـە لـە پێشا چاپکرابوو پێویسـت بـوو نووسـەرانی شـانۆنامەکە بێنـە پـێش پەردەکـەو خۆیـان بکـوژن! هـەروەها لـەم بەرنامەیـەدا راگەیـەنرا بـوو کـە دادائییـەکان بەبـەر چـاوی خەڵکییـەوە سـەری خۆیـان دەتاشـن. ریمبـون دیسـنی لـە کاتێکـدا خـۆی لـە نێـو رەحەتییـەکی گـەورەی مقـەوایی نـابوو، لـە دەسـت

پێشکەرییەکی سەیردا سەمایەکی فەرامۆش نەکەردەنی پێشکەش کرد. خەڵکی نەك هەر تەماتە بەڵکو بۆ یەکەمجار لە دنیادا چزلیکیان گرتە تەختەی شانۆکەو زۆربەی ئەم شتانە دەکەوتنە ناو رەحەتییە مقەواکەوە. "ئەم داهێنان و دەستپێشکەریانە خەڵکی زۆر تورە دەکرد. تەماشاڤانان بوون بە چەند بەشێکی جیاوازەوە: هەندێك پێیان وابوو کەئێمە لیبۆکانی لێهاتووین، دەستەیەك بە گەوجانی راستەقینەیان دەژماردین و، لەم بەینەدا دەستەیەکی کەمیش هەبوون کە تا رادەیەك پشتیوانیان لێدەکردین، لەوانە "پول ڤالیری و ژاك ریڤیر" لێ ئێمە نا ئومێد نەدەبووین، چونکە ئێمە کە بە ئارەزووی خۆمان تا ئەو رادەیە پایەی خۆمان دێنایە خوارەوە کە ببین بە نیشانەی تیرو توانج و جنێوان و هیچ لەوە نەدەپرینگاینەوە کەخۆمان بکەینە قوربانی تەوس و توانج و بێ ئابڕوویی، لە هەمان کاتدا جۆرە سەرکەوتنێکمان بۆ خۆ وەدەست دێنا: لە نووسینی زۆربەی هاورێیانی ئێمەدا روونی و دروستییەك هەبوو کە هەڤرکانی ئێمەی قاییل دەکردو لایەنگرییان لێدەکردین. چ پێویست بوو کە تەنیا لایەنە وێرانکارییەکەی ئەم راپەرینەی ئێمە بدینن؟.."

## شێوەی کاری دادا

لە سەرەتادا وا دەهاتە بەرچاو کە دادائیزم درێژەی کوبیزمە لە واری ئەدەبیاتدا، لێ زۆری نەبرد کە کەوتە هێرش بۆ سەر کوبیزم و هەموو رێبازو قوتابخانە ئەدەبی و هونەرییەکان و بە دەنگی بەرز باسی "نابووتی ئەقڵ"ی دەکرد.

راستە دادائیزم لایەنی ئەدەبی هەبوو و لە جیهانی ئەدەبدا سەری هەڵداو پەیدا بوو، لێ دەبێ ئەوە بزانرێ کە ناتوانرێ تەنیا لە روانگەی ئەدەبییەوە هەڵسەنگێنرێ. بەڵکو دادا لە بنەڕەتدا رەوتێکی فەلسەفی تەوس ئامێز بوو کە بۆ رەخنەگرتن لە وەزع و حاڵی ژیانی سەردەمی جەنگ و پاش جەنگ هاتبووە ئاراوە، بە تایبەتی بۆ رووبەڕووبوونەوەی بەرێوەبەرانی فشەکەری ئەدەبیات هاتبووە ئاراوە. دادا نکۆڵی لە بایەخی هەموو شتێك دەکرد. نووسەری دادایی دەینووسی: "دنیا چییە؟ ناشیرین و جوان کامەیە؟ گەورەو بەهێزو لاواز چییە؟ کارپانتیەو رنان و فوش کێ بوون؟ نایان ناسین، نایان ناسین!" کار گەییە ئەوەی کە کاتێ لە داداییەکانیان دەپرسی دادا چی دەڵێت، وەڵامیان دەدایەوە: "دادا هیچی ناوێ!".

دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە تەنیا لەیەك شتدا رێك بوون ئەویش حاشاکردن بوو لەو دنیایەی کە هەبوو: ئەو دنیایەی کە لەسەر پایەی جەنگ و پیاوکوژی و مێگەلایەتی رۆنرابوو و میچەکەی بە پوش و پەلاشی ئەقڵ و ئاوەز گیرابوو. هونەرمەندانی دادا ئەدەبیاتیان بەوە تاوانبار دەکرد کە شتێکی دەستکرد بووەو داوای گوێ رایەڵی بۆ دەستووری فەرمانڕەوایان دەکرد، زانست و ئەخلاقیان بەبێهودە دەژمارد، وەکو گوتمان دەیانویست بنیادەم لە کۆت و زنجیری هەر جۆرە جەبرو زەبرو زەنگێك رزگار بکەن و، لەسەرەتاوە، ئەدەبیات لە ژێر نیری ئەقڵ و هۆش و تەنانەت زمانی باویش ئازاد بکەن. جا ئەگەر بەم پێیە بێ ئایا نووسین پێویستە؟ شاعیرانی دادا پێیان وایە پێویستەو نووسین لە پێناوی تازەکردنەوەو چەسپاندنی خەونان و کەشفی "ویژدانی پەنهان" لە رێگەی وشەێن "ئازاد" و "دوور لە هەر جۆرە پەیوەندییەکی لوژیکی" بە سوومەند

دەزانن. دادایی‌ەکان، بۆ رزگار بوون لەو داوانەی کە "ئوپۆزتونیزمی" کۆمەڵگە لە ژیانی رۆژانەدا لەسەر ڕێی خەڵکی دەینێتەوە، دەستوورێکی تەندروستیان دەرکرد: "دروست کردنی ریسوایی بەمەبەستی دروستکردنی ریسوایی".
محەمەد عەلی جەمال زادە لە کتێبی "هزاربیشە"دا (ل ١٧٥) ئەو دەستوورەی کەتریستان تزارا لەکتێبی (دژەسەر)دا بۆ نووسەرایەتی داناوە بەم شێوەیە نەقڵ دەکات:
"رۆژنامەیەك هەڵگرەو وتارێکی لیٚ هەڵبژێرەو ئەو وتارە بە مقەست پارچە پارچە بکەو ئەو پارچە بڕاوانە سەر لە نویٚ ببڕە، تا هەر پارچەیەك لەیەك وشە زیاتری پێوەی نامێنیٚ. ئەوسا ئەو پارچانە بخە کیسەیەکەوەو کیسەکە بجوڵێنەو پارچەکان دەربێنەو لە پاڵ یەکدا ریزیان بکەوە...)
ئەمەشە دەقی نموونەیەکی ئەو شێوازە نووسینەیە، کە تزارا بە خۆی (دروستی کردووە):
"بلورێك لە هاواری پەرێشان دادەنیٚ لەسەر رووی پەڕەیەك کە خەزان. تکا دەکەم نیوە دەربڕینی من مەشڵەقێنە.
غەیری بڕبڕەدار. ئێوارانی ئارامێکی حوسن‌و جەمالی کیژێکی کە ئاوڕشێنی ڕێگەی بە گوڵاو داپۆشراو شێوە دەگۆڕیٚ"

## کۆڕی ( خەتم )ی دادا

هەڵبەتە ئەم ڕێبازە تەوس ئامێزو گاڵتینەیە نەیدەتوانی بەردەوام بیٚو بمێنیٚ. کەسانێك کە بە خۆیان دژی هەر جۆرە ریٚو رەسم‌و دەستوورێك بوون نەیاندەتوانی پابەندی هیچ دەستوورێکی دیکە بن، چونکە وەکو گوتمان بونیادی ئەم ڕێبازە بریتی بوو لە نەفی، بۆیە دەبوایە خودی خۆیشی نەفی بکات. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٢٠دا بەڕێوەبەرانی ئەم ڕێبازە بە ئاشکرا رایانگەیاند کە قوتابخانەی دادا "دژی ئەدەبیات"و "درۆی ئەدەب"ـە. هەروەها لە بەیاننامەیەکیاندا دەڵێن: "دادای راستەقینە ئەوەیە کە دژی داداش بیٚ".
ئەم قوتابخانە ئەدەبییە بەئاشوب‌و ئاژاوەیە، وەکو قوتابییەکی لاسار کە لە پڕێکا لە هەموو بنەمایەکی زانستی یاخی بیٚو مامۆستاکانی خۆی بەر دەمرێژی جنێو بدات‌و لە ئەنجامیشدا خۆی بکوژیٚ، لە ساڵی ١٩٢٢دا لە چالاکی‌و چەلەنگی وەستاو بەدەم دوا وڕینەو گیانەڵاوە گیانی سپارد. فرانسیس پیکابیا بە هەمان خێراییەوە کە هاتبوو سواری کەشتی بوو و بۆ ئەمریکا گەڕایەوە. ئاندریە بریتون کە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی دادائیزم بوو، سوپوو ئاراگون‌و ئیلواری لەگەڵ خۆدا بردو قوتابخانەی سورریالیزمی دامەزراند. تریستان تزارا کە هەر خۆی و ناوی قوتابخانەکەی مابووەوە، باروبنەی پێچایەوەو دوای سورریالیستەکان کەوت. ئاقیبەت شاگردانی قوتابخانەی "چوار هونەر" بە تەنتەنەو سەنسەنەو سازو سەمتوورەوە ئارمی دادایان فڕیٚ دایە روباری "سین"ـەوە بەو جۆرە کۆتاییان پیٚ هێنا.

بەمجۆرە ئەو قوتابخانەیەی کە نوێنەری سەنگەلایی فیکریو قەیرانی روحی یەك وەچە بوو. لە نێو چوو و شوێنەکەی خۆی بە "سورریالیزم" کە روخسارێکی پەسندترو بەجیٚ تری هەبوو. سپارد..

# سورریالیزم

هەڵبەتە دوای جەنگی جیهانی یەکەم رەوش‌و رەوت‌و رێبازو ئامانجە تازەکانی شیعر زۆر لێکدی جیاواز بوون‌و وا دەهاتە بەرچاو کە هەر شاعیرێك بە رێگەیەکی تازەدا دەڕوات‌و کەس دەفتەری کەس ناخوێنێتەوە. گەلێك لە شارەزایان پێیان وابوو کە جیهانی شیعر، پاش "هەرەسی قوتابخانەکان" کەوتۆتە ناو گێژەنگی ئاژاوەو هەرایەکی بێ سەمەرو بێ ئامانجەوە. هەڵبەتە مایەی سەرسوڕمانە کە لە پڕێکاو لە ساڵی ١٩٢٢دا قوتابخانەیەکی تازە بەهەموو تایبەتمەندییەکانی قوتابخانەکانی دیکەوە –واتە بەمژدەدەران‌و پێشڕەوان‌و دامەزرێنەران‌و بەیاننامەوە هەڤرکی ناوخۆو رەفز کردنەوە– دێتە مەیدان‌و ناوی "سوریالیزم" لە خۆ دەگرێت.

ئایا دەتوانرێ سورریالیزم بە قوتابخانەیەکی شیعری بژمێردرێ؟ ئێمە قوتابخانەی شیعری دەزانین. گومان لەوەدا نییە کە سورریالیزم وەکو گەلێك لە قوتابخانەکانی دیکە پەلوپۆی دەسەڵات‌و کاریگەری خۆی بۆ هونەرەکانی دیکەش هاویشتووەو لە هەر چوارنکالی جیهاندا جێ پێیەکی بۆ خۆی کردۆتەوە. گومانی تێدا نییە کە جگە لە دەستوورو یاسای ئەدەبی خۆی، بانگەشە بۆ فەلسەفەو سیاسەت‌و شێوەیەکی ژیانی تازەش دەکات. بەڵام پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە هەوڵدەدەن زیاتر لە رێگەی شیعرەوە جیهانبینی خۆیان پیادە بکەن‌و "شۆڕشی" خۆیان بەرپا بکەن. بۆیە دەبێ بەر لە هەر شتێك لە قەڵەمڕەوی شیعردا بۆ سەرچاوەو سەرەتاو مێژوو و کاریگەری ئەم قوتابخانەیە بگەڕێی.

ئەم قوتابخانەیە لە کاتێکدا سەری هەڵداو تەشەنەی کرد کە قوتابخانەکانی دیکە دووچاری شکست بوو بوون، بۆیە ئەمە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ قوتابخانەی نێوبراو، و کار گەییە ئەوەی کە فەڕەنسای بێشکەی سورریالیزم لە دوای دووەم جەنگی جیهانی (لە ساڵی ١٩٤٥) چاوێك بە رابردووی شیعری خۆیدا بخشێنێتەوەو ئامارو هەڵسەنگاندنی پێویست لەو بارەیەوە رێك بخات، ئەنجام دەرکەوت کە لە هەر دە شاعیری هاوچەرخ نۆیان سەر بە قوتابخانەی سورریالیزم بوون.

سورریالیزم زمانحاڵی بارگرژییەکانی دنیای تازەیە. بانگەوازی یاخی بوونە. هاواری ناڕەزایی سەدەی بیستەمە لە هەمبەر سەنگەلاییەکانی شارستانیەتی تازە.

رەخنەگران‌و شارەزایان‌و مێژوونووسانی ئەدەبی کە یاساو رێسا کۆنەکانی دنیای ئەدەبیان بە پایەدارو نەگۆڕ دەزانی لە ساڵی ١٩٢٥دا هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوون کە کاریگەری شۆڕشی ئەو قوتابخانەیە تا چەند ساڵێکی دی ئەو پەرەسەندنە جیهانییە بە خۆوە دەبینێ. ئەوڕۆ، مێژووی ئەدەبیات بە ناچاری دەبێ دوا فەسڵی گرنگی خۆی بۆ سورریالیزم تەرخان بکات.

## هۆیەکانی پەیدا بوونی سورریالیزم

ئەگەر دەستبەرداری سەدەکانی ناڤین و مارکیز دوساد بین، ئەوا دەبیّ لە رۆمانتیزمدا بۆ رەگ و ریشەی سورریالیزم بگەڕێین. چونکە ئەو بزاڤە شیعرییەی کە لە سەدەی نۆزدەمدا سەری هەڵدا مەعنای روون و رەوان و مەفهومی لە قەڵەمڕەوی شیعر وەدەرناو رەواجی بە ئالۆزکاری و تەمومژدا رەنگی لە رۆمانتیزمدا بوو. لەم قۆناغەدا، شاعیرانی وەکو (ئالفرەودوویینی) هەوڵیاندەدا شەقڵی فەلسەفی بە بەرهەمەکانی خۆیان بدەن و بە باوەڕی "بۆدلێر" دەبوایە ڤیکتۆر هۆگۆ بە تەلیقنکاری "نهێنی ژیان" بزانریّ.

بۆدلێریش بەخۆی شرۆڤەی یەکێتیی سروشتی دەکرد (کە چۆن لە سروشتدا بۆن و رەنگ و دەنگەکان یەکانگیرو ئاوێتە دەبن) و بۆ هەلاّتن لە سنوورو سنووردارییەکانی جیهان، مەستی ئەفیون و حەشیشەی لە زوهدو تەقوای عەبوسانە پیّ باشتر بوو.

شیعرەکانی بۆدلێر بەرادەیەك کاریان لە رامبۆ کردبوو کە تا کۆتایی تەمەنی لە نێوان "ڤیانی موتڵەق" و "یەخسیری لە دۆزەخی جیهانی"دا هەر لەقەفرتێی بوو. حاڵەتی سەرسامی لە جیهانی بیّ کۆتایی هەم لە بەرهەم و هەم لە ژیانی رامبۆدا بەرچاو دەکەوت و دەکرێت رامبۆ لە رووی یاخی بوونەوە لە چارەنووسی بەشەر، بە پێشڕەوی سورریالیزم بزانریّ. سەربوری رامبۆ نیشاندەری ژیانی بوونەوەرێکە کە ناچێتە ژێر باری درۆو دەلەسەو ریاو ریاکاری کۆمەلاّیەتی و هەوڵدەدات بە زەبری شیعران مرۆڤان کۆت و زنجیری خۆی ئازاد بکات و درێوی واقیعیان پیّ نیشان بدات.

بەلاّم گێژاوەکانی دنیای شەڕ کۆتاییان نییەو کەشف و دۆزینەوەی ئەم گێژاوانە هەستی ئازادی و توانای یاخی بوون لە بەرانبەر خوا لە مرۆڤدا بێدار دەکاتەوە. "لوتر ئامون"ش کە یەکێك بووە لە مژدەدەرانی سورریالیزم، ئەم یاخی بوونە، ئەم یاخی بوونەی دەتوانیّ بمانخاتە دنیای سەرسامییەوە، ستایش دەکات.

بەمجۆرە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەو تەسەورەی کە چالاکی شاعیر هۆیەکە بۆچوونە ناو نهێنییەکانی "سروشتێکی بالاّتر" لە ناو عیرفانی هەڵقوڵیو لە "یاخی بوونی رامبۆ"وە گەشە دەکات و هەر لەبەر ئەمەشە کە لە هەموو رووە جۆراو جۆرەکانی بیرو بیرکردنەوەدا رووبەڕووی شکستی فەلسەفەی "رەسەنایەتی ئەقڵ" دەبینەوە. گۆڕان و گۆڕینی جیهان برەو دەسەنیّ و جێگەی گریمانەی "پایەداری و بەردەوامی مادە" دەگرێتەوە.

برگسون لە بەرهەمە فەلسەفییەکانی خۆیاندا سنووری توانای هۆش دیاری دەکات و ئەوە نیشان دەدات کە دەسەلاّتی هۆش تەنیا لە قەڵەمڕەوی مادەدایە، ئەمە لە کاتێکدا کە "کەشف و شهود" توانای دەرکی سەرچاوەی ئەسڵی بوون بە مرۆڤ دەبەخشێت. ئەم فەیلەسووفە بەر لە فرۆید، سەرنجی خەڵکی بۆ خەون و حاڵەتی جۆراوجۆری گواستنەوەی فیکر لە دوورەوەو بەرجەستە بوون و تەجەلیاتی (نامەعقول)ی هێزە دەروونییەکان راکێشاوە.

هەر لەم قۆناغ و سەروبەندەدا کۆمەڵێك بەرهەمی ئەدەبی تازە بلاّودەبنەوە کە باسی نەخۆشییە دەروونییەکان و کاریگەرییان لەسەر دەروون و چارەنووسی بەشەر دەکەن و ئەوە نیشان دەدەن کە

رەفتاری ئادەمی خۆی لە خۆیدا نا مەنتیقییە، پێش ئەمەش دۆستوفسکی ئەوەی شەرح و شرۆڤە کردبوو کە لە ناخ و ویژدانی هەر کەسێکدا کۆمەڵێك مەیل و ئارەزووی ناکۆك و نەیار هەیە.

جا نەك هەر پرەنسیپە سایکولۆژییەکان لە ئەنجامی ئەم دۆزینەوەیەدا هەرەس دێنن بەڵکو زانستە سروشتییەکانیش لە ئەنجامی کەشفی دنیایەکدا کە هەموو شتێکی لێك دابڕاوە دەگۆڕێت. بۆیە ئەدەبیات هەوڵدەدات "یەکیەتیی بوونی ئادەمی" لە نێو سیماو رووە دەروونییە زۆرو زەبەندەکانی مرۆڤ خۆیدا بدۆزێتەوە. وەکو چۆن نیگارکێشی بەپێی قوتابخانەی کوبیزم کە وەسفی شێرازە پچڕانی واقیعە، لە هەوڵی ئەوەدایە کە لە پشت رواڵەتە فریودەرەکانەوە، جەوهەرو ماهیەتی بوونەوەران و شتان بدۆزێتەوە.

کارسەند بێرگ-ی شاعیری ئەمریکایی، پێناسەیەکی تازەی شیعر دەکات: "شیعر دەفتەری بیرەوەری گیانداری دەریاییە کە لەسەر زەوی دەژی و حەز دەکات بۆ ئاسمانان بفڕێ.... گەڕانی هیجاو دەنگانێکە کە لە دەروازەو دەرگای دنیا نادیارو نەناسراوەکان بدات" و بەمجۆرە "مەودای چوارەم" بە موڵکی تایبەتی شیعر دەزانێت.

هەنگێ شاعیرە لەودیوی رۆحانیەتی سیمبولیزم و سنووررداری ریالیزمەوە دەکەوێتە تاقیب و عەودالی "واقیعیەتی بالاتر" یانی واقیعیەتێکی "کۆکەرەوە"ی ئەوتۆ کە هەموو شتێك لە کلاوڕۆژنەی بنجبڕی هەست پێکراوو مادد‌ییەوە دەبینێ. بەلام نەك هەر دژی ئەو شتە نییە کە بۆدلێر پێی دەگوت "بزاڤی غەزەلخوانی رۆح"، بەڵکو لە ناخەوە پابەندو وابەستەیەتی. هەندێ لە شاعیران لەواری خوڵقاندنی ئەم هەستی "کۆکەرەوکاری" و"قوڵگەری"یەدا سەرکەوتووتر بوونە.

ئەگەر "ئاپولینر" شاعیرێکی گەورەبێ لەبەر ئەوەیە کە سادەترین گوزارشت و نیشاندانی واقیعی رۆژانەو تەنانەت بازاڕیش، لە ژێر دەستی ئەودا دەبێ بە شیعرێکی جامیع-ی ئاوێتە بە خەون و خەیاڵ و یادگارو ئەفسوونی پەیڤ و ریتم و ئاهەنگی وشە.

لەلایەکی دیکەوە پۆل کلۆدیل دەیەوێ بە شیعرو شانۆنامە-کانی ژانری ئەدەبی جۆراوجۆرو تۆنی تایبەتی هەر یەکێکیان ئاوێتەی یەکدی بکات و داڕشتنی عامیانە بە شێوازی بەرزو تەنز بەغەزەل و تاسەی داهێنەرانەی هونەر بە تەوس و توانجی داهێنان تیکەڵ بکات.

تەوس و شۆخی، بە شێوەی "وێرانکردنی کۆمەڵگە" لە ژیان و بەرهەمی (ئارتور کراڤان)دا دەبینرێ، ئەم پیاوە سەرکێش و بە ئاژاوەیە کە پیشەی بۆکسێن بووە لە چەندین وڵات و میللەت قاچاخ بوو، بە هەر شوێنێکدا تێدەپەڕی یەك دنیا ریسوایی و بەدناوی لە دووی خۆی بەجێدەهێشت. لە نێوان ساڵانی ١٩١٢- ١٩١٥دا گۆڤارێکی بەناوی "ئێستا"وە دەردەکردو هەمووی لە عەرەبانەیەکی دەستی دەکردو بە خۆی بەنێو کۆچەو کۆڵاناندا لێی دەخوڕی و گۆڤارەکەی دەفرۆشت. بەم کارە دەیویست گاڵتە بە کتێبخانەو کتێب فرۆشی بکات. لەم گۆڤارەدا، بە توندی گاڵتەی بە شێوەکاران دەکرد و رەخنەی لێدەگرتن و قارەمانانی وەرزشی پێ چاتر بوو لەوان، چونکە پێ وابوو قارەمانانی وەرزش بەلای کەمەوە غەریزەو مەیلە سەرەتاییەکانی بەشەر بە هەموو توانایەکەوە نیشاندەدەن.

پاش جەنگی جیهانی یەکەم، ژاك ڤاشە کە ئاندریە بریتون ناوی نابوو "وەستای گوێنەدان بە هیچ شتێك" بە شێوەیەکی ئالۆزو نا مەعلوم خۆی کوشت. کاریگەری ئەو بەسەر سەرهەڵدانی سوورریالیزمو بە تایبەتی بەسەر خودی ئاندریە بریتون–ەوە حاشا هەڵنەگرە.
پیێر رووردی، کە یەکێك بوو لە پێشەنگانی سوورریالیزم، لە ساڵی ١٩١٧دا، گۆڤاری (باکووری باشووری) دامەزراندو ئاپۆلینرو ماکس ژاکوبو ئاراگۆن–ش هاوکاریان لەگەڵدا کرد.
لەو گۆڤارەو بەتایبەتی لەگۆڤاری "ئەدەبیات"دا –کە لە راستیدا "دژی ئەدەبیات" بوو– مەسەلە بنەڕەتییەکانی سوورریالیزم دەخرایە بەر بەسو لێکۆڵینەوە.
لە یەکەمین ژمارەی ئەم گۆڤارەدا، ئاندریە بریتونو فیلیپ سوپۆو ئاراگون پرسیارێکیان بەم نێوەرۆکە خستەڕوو: "بۆ دەنووسن؟" دەیانویست لەو ڕێگەیەوە ئەوە نیشان بدەن کە راڤەو شرۆڤەی جۆراو جۆر لە نووسیندا ئەوەندە گرنگ نییە چونکە مەسەلەی گرنگتری وەکو "چەمکی ژیانی مرۆڤانی" هێشتا چارەسەر نەبووەو، چونکە نووسین بە مەبەستی قازانجی شەخسی ئەنجام دەدرێ بۆیە چ بایەخێکی نابێ.
ئەم سوکایەتی کردنە بە هونەرو رەتکردنەوەی ئاوەزە کە بە تاقیبی "موتڵەق" ئاوێتەیە لە ئەمریکاشدا بەرچاو دەکەوێت. لە ساڵی ١٩١٢دا مارسیل دوشامپ کاری توندڕەوی گەیاندە ئەوەی کە شتە دەستکردەکانی وەکو عەلاگەی جلو پێچکەی عەرەبانە، وەکو کاری شەخسیو هونەری ئیمزا بکاتو بە خەڵکانی تری پێشکەش بکات.
"دادائیزم" ئەنجامی حاڵەتی رۆحی کەسانێك بوو کە لە ئاکامی داروخانی جیهانو ئادەمییانەوە روویان کردبووە دنیای نائومێدیو باوەڕیان بە هیچ کارێکی جێگیرو پایەدار نەبوو.
پەیڕەوانی ئەم قوتابخانەیە زۆر بە قووڵی هەستیان بەو پەرێشانیو پەشێوی و سەنگەلاییە دەکرد کە لە جەنگ کەوتبووەوەو چالاکی و چەلەنگییان لە رای ئەوەدابوو "دەستووری ژیان" بدۆزنەوە. جا ئەمانە نەك هەر بەرهەمەکانیان، بەڵکو رەفتاریشیان "دادا"یانە بوو. ژیانی ئەوان یاخی بوونێکی بەردەوام بوو دژی هونەرو ئاکارو ئەخلاقی کۆمەڵگە. دادائیزم وەکو گوتمان، جگە لە نەفی کردنو سڕینەوەی خۆی چ شتێکی دیکەی پێنەدەکرا، بەڵام پاش ئەوەی زەینانی لە کۆتو زنجیری خورافاتی کۆن رزگار کرد، راپەڕینی پۆزەتیفی سوورریالیزمی لێکەوتەوە.

## سەرەتاو دەستپێکی سوورریالیزم

پاش ئەوەی دادائیزم بەو فەزاحەتەوە مەیدانی چۆڵ کرد، کۆنە کارگێڕانو بەڕێوەبەرانی دادائیزم لە ساڵی ١٩٢١دا لە دەوری ئاندریە بریتون، کە بە خۆیشی سەردەمانێك یەکێك بوو لە دادائیستەکان، خڕبوونەوەو نەخشەو پلانی قوتابخانەیەکی تازەیان داڕشت.باسی زانستیو وردی "واقیعیەتی باڵاتر" جێگەی ریسوایيو یاخیگەریەتی بێ سەرو بەری گرتەوە. ئاندریە بریتون بە یارمەتی ئاراگۆنو پۆل ئیلوارو فیلیپ سوپوورو بیردسنوسو بەنجامین پرەو هەندێ شاعیرو نووسەرێن دیکە کەوتنە کەشف کردنی دنیای پشتەوەی هەستو ویژدانی پەنهانو نادیار. ئەوە بوو قوتابخانەی سوورریالیزم بەشێوەیەکی فەرمی لە ساڵی ١٩٢٢دا دامەزرا.

وشەی "سورریالیزم" یەکەمجار لەلایەن گیوم ئاپۆلینر-ەوە بەکار هاتووەو ناوی شانۆنامەیەکی خۆی بووە بە ناونیشانی "Les Mamelles de Tirelas -١٩١٦"و "بەدرامایەکی سورریالیست"ی ناو بردووە. هەڵبەتە کە ئەو زاراوەیە یان وشەیەی بەکار هێناوە، بەو مەبەستە نەبووە کە بیکات بە بناغەی ئەو قوتابخانە تازەیەی کە ئێستا باسی دەکەین، بەڵکو دەیوست بەم وشەیە جۆرە شیعرێکی خەیاڵی و فانتازی بێ وێنە نیشان بدات. ئیدی ئاندریە بریتون و فیلیپ سوپۆ ئەم زاراوەیەیان لە ئاپۆلینر-ەوە وەرگرت، بەڵام بەم مەبەستە نا کە لاسایی ئەو بکەنەوە، بەڵکو مەبەستیان لەم وشەیە هەمان چالاکی دەروونی و ئەقڵی خەون ئاسا بووە کە رۆژانێك ژراردو نرڤال پێی دەتگوت (سوپەر ناتورالیزم".

هەڵبەتە سەرهەڵدانی سورریالیزم رێکەوتی ئەو قۆناغە بوو کە تیۆرییە سایکۆلۆژییەکانی سیگموند فرۆید دەربارەی شعوورو لاشعور، بە تەواوی بیروهۆشی خەڵکیان مژول کردبوو. ئاندریە بریتون و ئاراگون کە بەخۆیان وەکو فرۆید پزیشکی نەخۆشییە دەروونییەکان بوون، سوودیان لە لێکۆڵینەوەکانی فرۆید وەرگرت و بناغەی قوتابخانە تازەکەی خۆیان لەسەر چالاکی لاشعور دامەزراند.

هەر لە ساڵی ١٩٢١دا هەردووك ئاندریە بریتون و فیلیپ سوپو یەکەم کتێبی سورریالیستی-یان بەناونیشانی "مەیدانە موگناتیسییەکان" بڵاوکردەوە. لەساڵی ١٩٢٢ەوە تا ساڵی ١٩٢٤ لێکۆڵینەوەی تازەی ئەو جووتە دەربارەی "سروشتی باڵاتر"و "لاشعور" بەبەردەوامی لە گۆڤاری "ئەدەبیات"دا بڵاودەبووەوە. هەر زوو چەندین شاعیرو نووسەری دیکەش پەیوەندییان پێوە کردن و هاتنە ریزی ئەوانەوە لەوانە: ئانتونین ئارتودو ماکسیم ئەلکساندرو پیرناڤیل.

لێ ئاندریە بریتون کەوتە پاکسازییەکی "تصفیە" بەربڵاوو هەموو ئەو پەیڕەوکارو موریدانەی کە تینوی شۆرەت و ناوبانگی ئەدەبی و سیاسی بوون دووری خستنەوە، چونکە قەناعەتی وابوو کە چەلەنگی و چالاکی سورریالیستی دەبێ لە هەمان کاتدا لە هەموو رەنگە وابەستەگییەك یان لە هەر شەقڵ پەزێرییەك ئازاد بێ. خۆی گوتەنی "ئەو کەسانەی کە لەبەر هەر هۆو بیانوویەك-ی کەم و زۆر ئاشکرا شایستەگی ئەم ئازادییەیان نەبێ" دەبێ دوور بخرێنەوە. بەمجۆرە جان کوکتو، و جان پۆلان و رامون رادیگەو ژول رومن و ئاندریە سالمون و پۆل ڤالیری، بە گوناحی ئەوەی کە فرۆشی دوا کتێبیان لە نیوە بەبانەوە بووە، وەلاخران!

لە ساڵی ١٩٢٤دا لە پڕ چالاکی و نێوبانگی سورریالیستەکان گەییە لوتکەی دەسەڵاتی خۆی: لە شەقامێکی گەورەی پاریسدا بنکەیەك بە نێوی "نووسینگەی لێکۆڵینەوەی سورریالیستی" کرایەوەو "یەکەمین بەیاننامەی سورریالیزم" بە پێنووسی ئاندریە بریتون و یەکەمین ژمارەی گۆڤاری "شۆڕشی سووریالیستی" کە گرنگترین بڵاوکراوەی ئەم گروپەیە بە سەرپەرشتی پیرناڤیل و بەنجامین پریە بڵاوکرایەوە. بابەت و نێوەڕۆکی ئەم گۆڤارە، کە تا ساڵی ١٩٢٩ بەردەوام بوو، بریتی بوو لە بیروباوەڕە تایبەتییەکانی ئەم قوتابخانە نوێیە، هەر لەو گۆڤارەدا گەلێك راپۆرو لێکۆڵینەوە لەمەڕ "خەون"و یەکەمین نموونەێن "نووسینی خۆبەخۆ" و وەڵامێن

تایبەت دەربارەی "خۆکوژی"و "ڤیان"و هەروەها چەند نووسینێکی هێرشئامێز دژی ئاناتول فرانس و پول کلودڤیل بڵاوکرایەوە.

لەگەرمەی جەنگ وشۆڕشی مەراکیشدا"١" سووریالیستەکان لایەنی کۆمۆنیستەکانیان گرت و لە ئەنجامی ئەمەوە ئیدی هاواری نارەزایی لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە . لێ بریتون ئومێدی گەورەی بە (( تروتسکی)) بوو و خۆی گوتەنی لایەنگری (( کۆمونیستانی مرۆڤدۆست)) بوو بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەرگیز ئەندامیەتی تەواوەتی حزبی کۆمۆنیستی قەبووڵ نەکرد. یانی نەبوو بە ئەندامی تەواوی حزبی کۆمۆنیست. دەیگوت هونەرمەند هێندە پێویستی بەخۆیبوونی تەواوی خۆی هەیە کە هەرگیز ناتوانێ باوەڕو ئایدولۆژیای گروپێکی تایبەتی بەتەواوی قبوولْ بکات . لەبەر ئەمە لە ساڵی ١٩٢٥دا ئاندریە بریتون و پیرناڤیل، پاش شەڕە قەڵەمێکی توند لە گۆڤاری ((شۆرشی سووریالیستی))دا، لێکدی جیابوونەوەو پیرناڤیل روویکردە حیزبی کۆمۆنیست چونکە پێی وابوو باری دەروونی و جۆری بیرکردنەوەی هەر کەسێك بەندە بە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کەسەوە.

## بەیاننامەی سووریالیزم

گوتمان "یەکەمین بەیاننامەی سووریالیزم" لە ساڵی ١٩٢٤دا لەلایەن ئاندریە بریتونەوە نووسراو بڵاوکرایەوە. بریتون لەم بەیاننامەیەدا بەمجۆرە قوتابخانەی سووریالیزم پێناسە دەکات: " سووریالیزم ئۆتۆماتیکیەتی مێشکێکە کە دەخوازێ لە رێگەی زمان یان قەڵەم یان هەر ئەوزارێکی دیکەوە، رەوتی واقیعی کاری بیرکردنەوەو هزرین نیشان بداتو دەربڕێ. سووریالیزم چەسپاندنی هزرینە بێ حوکمی ئەقڵو بەدەر لە هەر جۆرە پابەندییەك بە یاسایْن جوانیناسی و پرەنسیپی ئەخلاقی".

سووریالیستەکان بۆ وراژاندنو هەڵێنجانی ئەم (واقیعیەتە تەواوە)ی کە لە قوڵایی لاشعوردا پەنهانە چەندین ئەوزاری پراتیکی دەخاتە روو کە سادەترینیان "نووسینی خۆ بەخۆیە": واتە نووسەر دوای ئەوەی زەینی خۆی خستە حاڵەتێکی نیمچە هۆشیاریی خەون ئاساوە، ئیدی جڵەوی هزر بە قەڵەم دەسپێرێ تا بە ئارەزووی خۆی بۆ هەر کوێیەکی گەرەك بێ تاوی بدات. جاهەر بەو مەبەستە ئاندریە بریتون لە "یەکەمین بەیاننامەی سووریالیزم"دا ئەم دەستوورە بە نووسەران دەدا:

"لەشوێنێکدا دانیشن کە بە تەواوەتی بۆ تەرکیزی هزرتان لە باربێ، ئەوسا کاغەزو قەڵەم بگرنە دەست. خۆتان بخەنە حاڵێك کەهەر کاریگەرییەك قبوولْ بکەن. دەربارەی هونەری خۆتانو هونەرێن کەسانی دی بیرمەکەنەوەو ئەوانە لەبیری خۆتان ببەنەوە. لەبەر خۆتانەوە ئەوە دووبارە بکەنەوە کە ئەدەبیات رێگەیەکی مەترسیدارەو مرۆڤ بۆ هەموو شوێنێ رادەکێشێت. بێ ئەوە پێشوەختە بابەتێکتان دا بێتە چاو بەلەز دەست بە نووسین بکەن. یەکسەرو بەخێراییەکی ئەوتۆ بنووسن کە دەرفەتی دووبارە خوێندنەوەی ئەو شتەتان نەبێ کە نووسیوتانە. رستەی یەکەم لە خۆیەوە دێو پاشان رستەێن دیکە، کەپەیوەندییان بە زەینی هۆشیارەوە نییە، بەڵکو لە قووڵایی

لاشعوردا خزیونەتە پاڵ یەكو پەنهان بوونە، چاوەڕوانی ئەوساتە دەكەن كە لە دنیای دەرەوەدا دەربكەونو بەرجەستە بىن، ئەو رستانە دوا بە دوای یەكو بە شێوەی ئۆتۆماتیكی دێنە سەر كاغەز".

ئاشكرایە كە لەو تەزرە نووسینەدا پێویست بە خاڵبەندی نییە، بگرە زیانیشی دەبێ چونكە تەگەرە دەخاتە سەر رێگەی رەوتو رەوشی سیكۆلۆژیو هزری نووسەر. ئەگەر بە رێكەوت دووچاری گرفتو دوو دڵییەكی توند بوونو وشەیەك هەندێ گوماناوی هاتە بەرچاوتان ئەوا لە دوای ئەو وشەیەوە پیتێكی رێكەوتەكی وەك "I" دووبارە بكەنەوە. ئەو وشەیەی كە دەبێ بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی لە دوایەوە بێ هەر دێتو بەمجۆرە پەخشان یان شیعرەكەتان بەردەوام دەبێو كۆتایی دێت.

هەندێ ئەوزاری دیكەش لەبەر دەستی نووسەری سووریالیستدا هەیە كە حازرو ئامادە لە تەبیعەدا هەیە. بۆ وێنە "خەون" كە تەجلیو دەركەوتەی لاشعورە، بە باشترین هۆو سەرچاوەی مەعریفەت دەژمێردرێ بە مەرجێ بتوانرێ پاش رابوون لە خەو، لە زەیندا دووبارە زیندوو بكرێتەوە. (گۆڤاری "شۆڕشی سورریالیستی"، بۆ ماوەی پێنج ساڵان، زۆربەی لاپەڕەكانی خۆی بۆ راڤەو شرۆڤەی خەونانی گێردراوە تەرخان كرد).

هەروەها نەخۆشیانی دەروونی، بە تایبەتی ئەو نەخۆشیانەی كە وڕاوەێن زەینی دەهاڕوژێنێو بەم شێوەیە بابەتی بەناو لۆژیكی دەگەڵ بابەتانی هەڵقولاو لە چەند فیكرێكی شێتانەوە تێكەڵ دەكاتو واقیعێكی نوێ دەخولقێنێ، ئەمە هۆ یان ئەوزارێكی دیكەیە كەخودی سروشت خستوویەتی بەردەستی نووسەرانی سورریالیست.

ئاندریە بریتون لە ساڵی ١٩٢٩ "دووەم بەیاننامەی سووریالیزم"ی بڵاوكردەوەو هەڵوێستو رەوشی سیاسی ئەم رێبازەی روون كردەوە ئەو دەعوایەی تۆمار كرد كە سووریالیزم لە بناغەو بونیادا، لە شێوەكانی ئێستای جوانیناسی جیاوازە، چونكە تویژەری سووریالیزم بە قووڵی بە ژیانی سایكۆلۆژی تاكدا رۆدەچێت، هەموو شتێك لەوێندەر بە پەشێویو ئاڵۆزیو مغەوەشی دەبینێو لەبەر ئەمە لە روانگەی ئەوەوە بایەخو پەیوەندی نێوان كاروباران، چەمكی ئاسایی خۆ لە دەست دەدەن. "خاڵێكی دیاریكراو لە زەیندا هەیە كە لەو خاڵە بەولاوە، مەرگو ژیان، حەقیقەتو خوازە، واقیعو خەیاڵ، رابردوو و ئایندە، هەورازو نشێو، ناكۆكی خۆیان لە دەست دەدەن. جا هاندەری چالاكیو چەلەنگی سووریالیزم هەوڵو ئومێدی دیاریكردنو دۆزینەوەی ئەو خاڵەیە".

سورریالیستەكان بەم شێوەیە رێبازێك بۆ لێكۆڵینەوە لە ناخی پەنهانو شاراوەی "من" دادێننو ئەوە بە هۆو ئەوزاری راستەقینەی زانینو "مەعریفەت" دەزانن. ئەم مەعریفەتە دەكاتە چی؟ ئەو وەڵامەی كە لە بەیاننامەی سووریالیزمو بەرهەمێن سووریالیستەكاندا بەدی دەكرێو دەخوێنرێتەوە ئەمەیە كە مەبەست لە مەعریفەت، رووخاندنی ئەو دیوارەیە كە كەوتۆتە نێوان ئاوەزو شێتییەوە.

## پرەنسیپەکانی سووریالیزم

سووریالیزم ڕێبازێکی متمانە بەخۆی ئەوتۆیە کە تەنیا پەیڕەوکاری یەك هەڵوێستو یەك ڕێ قبووڵ دەکات. ئەم ڕێبازە چەندین فەلسەفەی تایبەتی خۆی هەیە:

١- فەلسەفەی زانستی کە هەمان "دەرونیشکاری" فرۆیدە.

٢- فەلسەفەی ئەخلاقی کە دژی هەر جۆرە قەراردادو سازشێکە.

٣- فەلسەفەی کۆمەڵایەتی کە دەخوازێت لە ڕێگەی شۆڕشی "سورریالیستیەوە" بەشەریەت ئازاد بکات.

هەڵبەتە بۆ گەییشتن بەو مەبەستو ئاڕمانجانە کۆمەڵێك ڕەوشو ڕێباز دەخاتەڕوو کە بە کورتی بریتییە لە:

١- **تەوسو تەنز**: لە روانگەی کەسێکەوە کە ئارەزووی گەییشتن بە "بێ کۆتایی" هەیە، دیتنی ئەو حەقارەتو بچووکیو پوچییە دنیاییەی کە ژیانی پێدا دەگوزەرێ، تەنیا هەستی ڕیشەخەنو تەوسو تەنز دەبزوێنێ. بەر لەوەی کە ڕێگەیەکی تازە نیشان بدەین پێویستە یەکەمجار بکەوینە وێرانکردنی ئەم دنیا گەندەڵە، و ریشخەنو تەوس بۆ جێ لەقکردنی درۆوڕیا باشترین چەکە بۆ رزگاری لە کوتو بەندو لەمپەری کۆمەڵایەتی ئایا توانای پەنابردنەبەر ژارخەنی تەوسو تەنز ئامێز بە بەهرەیەکی گەورە حەساو ناکرێ؟ سووریالیستەکان لەم ڕچەو ڕێگەیەوە خۆ بە قوڵایی لاشعوردا دەکەن. کەسێك بەم چەکە تەیاربێ دەتوانێ وەکو تەمەشاڤانێك بڕوانێتە ژیان.. لە بەرانبەر ئەودا (-وەکو چۆن لە قەرەقۆباز بازیدا-) قەرەقۆزانێك لە هاتوچۆدان کە هەڵسووکەوتو رەفتارو ئاکاریان بە جلو بەرگی خوازراوو درۆینەو ویقاری پوچەڵو رواڵەتی خەڵەتێنەر رازێنراوەتەوە. ژیانی راستەقینە، بۆ کەسێك کە بتوانێ بە خەمساردیو بێ موبالاتی تەماشای بکات، رواڵەتی سەنگینو لایەنی جددی خۆی لە دەست دەداتو دەبێ بە مایەو بابەتی پێکەنینو گەپجاڕی. لەبەر ئەمە، تەوسو تەنزو ژارخەن بەندە بە پچڕینی پەیوەندییان بە واقیعی دەرەکییەوە، روانگەو رەسەدخانەی پیاوێکە کە لە بانیژەی خۆیەوە تەمەشای هەراو هەنگامەی جیهان دەکات.

لێ دۆزینەوەی لایەنە پێکەنیناوییەکانی ژیانو تەوس کردن بەپەیمانە کۆمەڵایەتییەکان دەبێتە مایەی یاخی بوون لە سیستەمی باو. پاش لێکۆڵینەوەکانی فرۆید دەربارەی لاشعور، ئەوە ساغ بووەتەوە کە تەوسو تەنزو ساتیر جگە لە وێنەی گۆڕدراوی روحی سەرکێشو یاخیو دژ بە قبوولکردنی خورافاتو پڕوچووچی کۆمەڵایەتی چ شتێکی دیکە نییە: پێکەنین سەرپۆشی نائومێدییە. فرۆید وەکو نموونە گوتەی پیاوێکی مەحکوم دەگێڕێتەوە کە لە یەك ڕۆژی بەهارا بەرەو پای قەنارەی دەبەن، کە دەگاتە پای سێدارەکە هاوار دەکات: "ساڵی خۆش لە بەرهارەکەیدا دیارە!".

تەنزو تەوس هێزو توانامان لە هەنبەر گوشاری ئەو دەردو ڕەنجەی لەسەرمانەو لەسەرمان بووە زیاد دەکات، بۆیە لەو ڕووەوە بایەخێکی بالاّی هەیەو دەتوانیّ ڕزگارمان بکاتو ورەمان بەرز بکاتەوە. لەبەر ئەوە توێژەر پێویستە خۆی لە شتەکان جیا بکاتەوەو نەك لە ڕوانگەی شەخسییەوە بەڵکو وەکو چۆن هەن ئاوها تەمەشایان بکات. ئەو دەمە دەبینیّ کەشتو کاروبارەکان، فۆرمی جیاوازو چەمکی جۆراوجۆریان هەیەو ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پایەو بناغەیان –بەپێچەوانەی تەسەوری باوەوە– لەسەر بنەمایەکی مکوم نییە.

لیّ سووریالیستەکان لەم قوناغی جوداییو لێك ترازانەی ڕواڵەتی شتانە، کە ئەگزیستانسیالیستەکان تا مەفهومی عەدەمی موتڵەقی دەبەن، هەندیّ پرەنسیپی تازە بۆ جوانیناسی دادەنەن. یەکێك لە نووسەرانی سوورریالیست دەڵێت: "جوان دەشێت لە یەکانگیری مەکینەیەکی درومانو چەترێکی سەرمێزی شیکاری بێتە ئاراوە. چونکە شتێکی دەستکردو ئامادە کە ئاڕمانجو مەبەستی سوودمەندییەکەی وەك بڵێی بە شێوەیەکی بنجبڕو هەمیشەیی دیاریکرا بیّ (چەترەکە) کە بخرێتە بەرانبەر شتێکی دیکە کە ئاڕمانجو مەبەستی سوودمەندییەکەی لە شتەکەی پێشوودا زۆر جیاوازو دوور بیّو ئەم بەرانبەرییە بە ڕواڵەت پوچو بیّ مانا دەنوێنیّ (مەکینەی خەیاتی)و لە شوێنێك دابیّ کە هەردووکیان هەستی غوربەتو بێگانەیی بکەن (لەسەر مێزی شیکاری) لە ئەنجامی ئەم ڕێکەوتەدا، سوودمەندی بوونی ناسنامەی خۆی لە دەست دەداتو لە ئەنجامدا لایەنی موتڵەقی دروێنەی ئەو، بەهۆی هەندیّ فاکتەر یان دەخالەتکردنی کارێکی ڕێژەییەوە، دەگۆڕیّ بۆ "موتڵەقێك"ی تازە کە هەم حەقیقییەو هەمشاعیرانە". بۆیە حاڵی پەیکەرێك کە لە چالێکدا کەوتبیّ لەگەڵ حاڵی هەمان پەیکەردا کە لەسەر پایەی خۆیو لە مەیدانی گشتی شاردا دانرابیّ لە ڕووی بایەخەوە فەرقی زۆرە. هەروەها دەستێك کە لە بازوو جیاکرابێتەوە چەمکەکەی دەگۆڕیّ.

بە باوەڕی ئاراگون، چەمك بەخشینی مەجازی و ئیحتوباریو سەیر بە شتو کاروباران، بە هیچ جۆریّ گەمەیەکی منالاّنە نییە. ئەم کارە ئەنجامی شێوەیەکی فەلسەفی تایبەتییە کە دوو لایەنی هەیە، لایەنی نێگەتیفو لایەنی پۆزەتیف: هەوەڵجار دەبیّ واقیع بروخێنریّ تا لە نێو دارو پەردووی ئەوەوە، واقیعێکی تازە سەر هەڵدات کە واقیعی هەوەڵین قاوغی ڕواڵەتیو دەرەکی ئەو بووگە.

بەم پێیە تەوس و تەنز ڕێگە بە مرۆڤ دەدات کە پەیوەندینیە باوو ئاساییەکانی نێوان شتو دۆزو وشەکان تێك بشکێنیّو لە دەلاقەیەکی دیکەوە بڕوانێتە دنیا. تەنز دەبیّ دژی هەر جۆرە هەلپەرستیو مێگەلایەتییەك "گەر دەتەویّ ڕیسوا نەبی بەگەڵ جماعەت بکەوە" دەست بەکار بیّو پەیوەندیو نزیکایەتی "نامەنتیقی" لە نێو ئەو کاروبارانەدا چیّ بکات کە بە حوکمی عادەتو ڕاهاتن لێکدی دوور کەوتوونەتەوەو لە ئەنجامدا مرۆڤ بگەیەنێتە دەرکی "واقیعی بالاّتر".

## ٢-جیهانی حەیرمان:

سووریالیزم، بە حوکمی رەخنەگرتن لە واقیع، یەك ریّو یەك دەنگ بەگەڵ ئەو بزاڤە تازەیە دەکەویّ کە لە قەڵەمڕەوی زانستدا سەری هەڵداوە،و دەیەویّت بونیادی جەبری (حەتمیەت) مەنتیقی و یاسای هۆو ئەنجام ویّران بکات.

هەر کەسیّك بچیّتە جیهانیّکەوە کە "پیّکەنین"و "راز" شەقڵی "غەرابەت"ی خۆیان لە دەست دابیّ، وەکو پۆل ئیلوار بۆی بەدیاردەکەویّت کە "هەموو شتیّك قابیلی بەراوردو شوبهاندنە لەگەڵ هەموو شتیّکدا، هەموو شتیّك رەنگدانەوەو نیشانەو لیّکچونو ناکۆکی و گۆڕانو روودانی خۆی لە هەموو شویّنیّك دەدۆزیّتەوەو، ئەم گۆڕانکاریو دروستبوونەوەیە لە ژمارە نایەتو هیچ مەرزو سنووریّکی نییە" تەسەوری ئەم "تەتابوقە هەمەلایەنە" تویّژەی ریالیست ناچار دەکات کە هەمیشەو لە هەموو شویّنیّ لە ژیانی رۆژانەو لە هەر رەوت و رەوشیّکی ئاساییدا، بۆ فاکتەری رەواندنەوەی دیاردەو رووداوە باوەکان بگەڕیّو شتی غەریبو سوپەر ناتورالیزم بە بەشەر ئاشنا بکات یان شتە غەریبو سوپەر ناتورالیزمەکان بە ئاشنا بزانیّ.

لەم دنیا وەهمو خەیاڵ ئامیّزەدا، سەیرترین رووداو، ئاساییو سروشتی دەنویّنیّ: گیانی رەخنەگر لە کار دەوەستیّ، گوشارو تەنگانە نامیّنیّ: ئەم دنیا ئەفسون ئامیّزە قەڵەمڕەوی (واقیعی بالاتر)ە، بە گوتەی ئاراگون "لەو دیو دنیای واقیعەوە، هەندیّ پەیوەندی دیکە هەن کە زەینی بیّدار دەتوانیّ دەرکیان بکات،و بایەخو بەهای ئەم پەیوەندییانە لە واقیعی دەرەکی کەمتر نییە وەك: ریّکەوت، خەیاڵ، خەون، ئەم پەیوەندییە جۆراو جۆرو جیاوازانە بەزاراوەی لۆژیك، لە یەك "رەگەزی نزیك"دا کۆدەبنەوەو دەسازیّن".

ئاراگۆن بە خۆی لە کتیّبی "جووتیّری پارسی"دا ئەو خەرمانەیەی کە دەوری شتانی ئاسایی داوەو مرۆڤ وا لیّدەکات لە شتی باو لابدات، نیشان دەدات، لە ژیّر قەڵەمە جادوو ئامیّزەکەی ئەودا کوچەو کۆڵانو دوکانو موغازان دەگۆڕیّنو ئەو قفلانەی لە دەرکەی "بیّ کۆتایی" دراون دەکاتەوە. دەڵیّی غەرابەتی گەڕەكو ماڵەکەن لە دیوی دووەمی دراوی واقیع دایە. هەڵبەتە رووی دیارو ئاشکرای ئەم دراوە چونکە لایەنی فۆرمیو بابەتی هەیە ئاسانتر بە دەست دەکەویّ.

توانای دەرك کردنی ئەم "جیهانی حەیرمانە" بەهرەیەکی گەورەیەو دەبیّ هەوڵ بۆ پاراستنی بدریّ، چونکە "هەر پیاویّك کە بە ریّگەی ژیاندا بڕواتو سات بە سات ریّگەکە ئاسانترو هەموارتر ببینیّ، هەر پیاویّك کە رۆژ بە رۆژو ئاسانتر خوو بە دابە باوەکانی جیهانەوە بگریّو بەرەبەرە زەوقو دەرکی کاروباری نائاساییو ناباو لە ملی خۆی بکاتەوە" بەزوویی ئەم بەهرەیە لە دەست دەدات.

لەبەر ئەمە سورریالیستەکان لە دنیای واقیع دوور دەکەونەوە تا خۆ بە جیهانی خەیاڵو ئاپۆیاندا بکەن "چونکە تەنیا لەم جیهانە وەهم ئاسایەدا، ئەقڵی نەگەییوی بەشەر دەسەڵاتی خۆی لە دەست دەداتو بنیادەم دەتوانێ قووڵترین پەشێوی بوون دەرك بکاتو نیشان بدات"

کەواتە لە هەر شوێنێ نێروی خەیاڵ، بە دوور لە کۆتو بەندی روحی رەخنەگرو زەینی ئیرادگیر، دەربکەوێ، واقیعیەتی باڵاتر روو دەنوێنێ. یەکێ لە نووسەرانی ریالیست دەڵێت: "چەند جیهانی حەیرمان بەرەبەرە لە کۆتی لەمپەران ئازاد بێ ئەوەندە لایەنی سەرسامی "واقیعیەتی زاتیو خۆڕسکانە" دەگرێتە خۆ... ئیعجازی جیهانی حەیرمان لەمەدایە کە زۆر بە ئاسانی لەگەڵ کاروباری ئاساییو رۆژانەدا تێکەڵ دەکرێ" کەچی ئاندریە بریتون گوتەنی: "نهێنی سورریالیزم لەمەدایە کە ئێمە دەزانین شتێکی دیکە لەو دیوی دیاردەو رواڵەتەکانەوە پەنهانە".

## ٣- خەون:

جیراردو نرڤال کە پێشڕەوی راستەقینەی سورریالیزمەو ئەو بە دانانی زاراوەی "سوپەر ناتورالیزم" نزیکترین چەمکی بۆ سورریالیزم دۆزییەوە، وەکو ئاندریە بریتون دەڵێت: "روحی سوورریالیزم چوو بووە پێستی نرڤال"ـەوە. لە هەموو بەرهەمەکانیدا دووپاتی کردوەتەوە کە واقیعی خەیاڵ لە جیهانی بێداری کەمترنییە. بە باوەڕی ئەو خەون رێگە بە بنیادەم دەدات کە بچێتە ناو خۆیەوەو "مەعریفەی باڵا" بە دەست بێنێ. ئەم تۆژینەوە زانستییە، واتە وەیاد هێنانەوەو شیکردنەوەی چالاکی خۆبەخۆی زەینی مرۆڤانی، رێبازی کاری سوریالیزمە.

ئەگەر واز لە زەین بهێڵرێ ئەوا لە دنیای وەهمو شەبەنگو ئاپۆیاندا، کە بوونەوەرانو شتانی ئەو دنیای وەهمو ئاپۆیانە لە حاڵەتی چاوەڕوان نەکراوانو بە رەنگێن خەوناوی رازێنراو نەتەوە، دەکەوێتەکار. ئەم دنیایە، وەکو برگسون گوتوویەتی لە خاڵی بەرانبەرو دژ بە واقیعیەتی عەمەلیدایە، چونکە بزوێنەری کاری ئێمە لە دنیای واقیعدا، سوودو قازانجی هەنووکەییە، ناچارین کارگەلێك هەڵدەبژێرینو دەرك دەکەین کە سوودێکی تێدابێ، لێ ئەگەر لەم جیهانە جیابینەوەو چاوپۆشی لێ بکەین هەنگێ دەچینە قەڵەمڕەوو ئاسۆیەکی دیکەوە کە لە وێنەێن زەینیو بیرەوەری "سەرکوتکراو" پێك هاتووەو، لە قەڵەمڕەوی حوکمڕانی هەر جۆرە لۆژیکێك دەمانباتە دەرێ، لە روانگەی "فرۆید"ـەوە ئەو جۆرە دنیایە نیشاندەری ئارەزوو و مەیلە نا ئاگاو حەزە نەگوتەنییەکانی ئێمەو مرۆڤ دەتوانێ لە رێگەی وردکردنەوەو شیکردنەوەیانەوە، بگاتە رادەی خۆناسینی تەواو. بەمجۆرە، پەیڕەوانی فرۆید ئەم دنیا دەروونییە دەوڵەمەندە وەلاوە دەنەنو بە هۆیەکی دەزانن بۆ وەدەست هێنانی شێوەیەکی باشتری ژیانو سەرکەوتن لە جیهانی واقیعدا. لە کاتێکدا ئەم کارە بەلای سووریالیستەکانەوە دەکاتە کەم کردنەوەی "بوونی تەواو" حاڵبوکی بایەخی ژیانی خەو لە ژیانی بێداری کەمتر نییە ئیدی بۆچی ئیلهامو موکاشەفاتی ئەو ژیانە پشت گوێ بخەین؟ ئاندریە بریتون دەڵێت: "رەنگە خەونەکەی دوێنێ شەوی من درێژەی خەوەکەی پێرێ شەو بێ، بەڵام ئایا ئەم خەونە ئەمشەوش بەهەمان گوڕوتینی شەوانی پێشوو بەردەوام دەبێ؟". چونکە زەین تەنیا هەندێ لایەنی پەراگەندەی خەونی دوێنێ شەوی پێ

دەپارێزرێ‌و یەکێتی خەونەکەش تێك دەشکێنێ، لەوەیە جیهانی بێداری نموونەو سێبەرێکی ئەم "ژیانە لاوەکی"یە بێ. رەنگە "دیاردەی واقیعیەت" لە یەکانگیری تیشك‌و پرشنگی خەون‌و بێداری چێ بووبێ.
ڤیان لە کوێندەرەوە دەست پێدەکات؟ بۆچی کەسێك دڵ بە یەکێکی دی دەدا؟ لەوەیە ئەوەی لە دیدی ماشوقەوە دەی بینیم رێك هەمان "نوکتەی نهێنی" بێ کە ئێمە بە دنیای خەونی لە دەست چوو دەبەستێتەوە. "سلڤادرو دالی" لە کتێبی "ژنی نەدیدەنی"دا دەڵێت: "بەبێ ئاگایی رۆژ بە سۆراخی وێنەێن لە دەست چووی خەونان دەگوزەرێنم، بۆیە کە وێنەی خەونەکانی خۆمان دەدۆزینەوە پێمان وایە پێشتر ئەوەمان ناسیوەو دەڵێین تەنیا بە دیتنی ئەو یان تەماشاکردنی ئەو غەرقی خەون دەبین".
بەم پێیە خەون کە رواڵەتی دنیای "فەرامۆشکراو"و "سەرکوتکراو"و قەڵەمڕەوی واقیعی بالاترە ئایا ئاندریە بریتون گوتەنی: ناکرێ بۆ چارەسەری مەسەلە بنەڕەتییەکانی ژیان بەکار ببرێ؟
لە جیهانی خەوندا هەموو شتێك سادەو ئاسان دەنوێنێ، هەموو شتێك تەبیعی جیلوە دەکات، گیروگرفتی نیگەرانی سازی "ئیمکان" ناخرێتە روو. زەینی قەبوڵکەر لە بەرانبەر سەیرترین رووداواندا تەسەوری ناکۆکی ناکات، مەگەر لە بێداریدا، ئەویش بە فەرمانی لۆژیکی سنووردارو کاڵ‌و کرچی ئێمە. لەوەیە "جیهانی واقیع" بەشێکی بچووکی نهێنییەکی گەورە بێ‌و،خەوو بێداری–ش جیلوەی ئەم "نهێنییە گەورەیە"بن.
بەڵام نابێ بە هەڵەدا بچین! مەبەستی سووریالیستەکان ئەمە نییە کە وەکو پاسکال بڵێین: "بەچ مەعلوم ئەم نیوەیەی تری ژیان، کە وا دەزانین بێدارین، خەوێکی دیکە نەبێ‌و سووکە جیاوازییەکی لە خەوی یەکەم هەبێ‌و، ئەو کاتەی کە تەسەور دەکەین خەوتووین لە راستیدا بێدارین؟" ئەمە کە بووە بە بیانووی دەستی فەیلەسوفانی خانەگومان تا واقیعیەتی جیهانی پێ رەتکەنەوە، بەلای سوریالیستەکانەوە هیچ بایەخ‌و ئیحتوبارێکی نییە، تەنیا ئەوە نەبێ کە ئاندریە بریتون گوتەنی: "لە کاتی خەودا وا تەسەور بکەین کە بێدارین‌و لە کاتی بێداریدا وا تەسەور بکەین خەوتووین". بەراورد کردنی "نیشانەکانی خەو" لەگەڵ "نیشانەکانی بێداری"دا ئەوە دەردەخات کەئەو دووانە ژیانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کردووەو حەقیقەتی ئەمیان لە حەقیقەتی ئەویان کەمتر نییە.
خەون، وەکو تێفکرین، یەکێکە لە ئەوزارەکانی زانین‌و مەعریفەت، و دەبێ لەو روانگەو پێودانگەوە راڤەو شرۆڤەو شی بکرێتەوە. خەون فەنبازی روح نییە بەڵکو یەکێکە لە چالاکییە ئیلهام بەخشەکانی زەین و، سووریالیزم لەم رووەوە لە فەلسەفەی هیندی نزیك دەبێتەوە. کە لە کتێبی "ڤیدانتا"دا سێ حاڵەتی بێداری‌و خەون‌و خەوی قووڵ بە جیا خراونەتە بەرباس‌و لێکدانەوەو هەر سێ حاڵەتەکە بە لایەنێن تەجەلی‌و بەرجەستەبوونی وجود ژمێردراون.
فەلسەفەی رۆژئاوا بەدوور خستنەوەی ئەو شتانەی کەلە قەڵەمڕەوی ئاوەز بە دەرن مەعریفەت‌و زانینی ئینسان‌و ناسینی جیهان سنووردار دەکات. داهێنانی سووریالیزم لەمەدایە کە بایەخی

خەونی نیشان داوەو هەم لە رووی سایکۆلۆژییەوەو هەم لە رووی فەلسەفەی میتافیزیکییەوە بایەخی خەونی بەلای کەمەوە بە ئەندازەی بایەخی بێداری زانیوە.

## ٤-شێتایەتی:

پچڕپچڕیو پەرێشانیو غەرابەتی خەونان، خەیاڵپڵاوی شێتان وەبیر مرۆڤ دەخاتەوە: دنیای شێتایەتی زەمینەیەکی یەجگار گرنگی خوێندنەوەو توێژینەوە بۆ ناسینی سایلکۆلۆژیای مرۆڤ. شێتان بە حوکمی ئەوەی لە واقیعی بێرونییەوە دوورن، بە باوەڕی فرۆید "لە بواری واقیعیەتی دەروونییەوە زۆر لە ئاقڵان ئاگادارترنو دەتوانن هەندێ شتمان بۆ ئاشکرا بکەن کەبەبێ ئەوان هەرگیز چارەسەر ناکرێ".

خەیاڵ، لە دنیای شێتاندا فەرمانڕەوای بێ هەڤرکە. زەینی شێتان بە نێو کاروباری ناکۆكو بێ سەروبەردا بە چابۆکی و سەرخۆشی تێ دەپەڕێ. زنجیرەی بیروهزرینی زەینی ئەوان تەنیا لەبەر چاوی خەڵکانی ئاساییدا پچڕپچڕو لێڵو مغەوەشە. چونکە شێتان عادەتی ژیانی رۆژانەیان لە دەست داوە، بەڵام جیهانی ئەوان هەمان زەبتو رەبتی دنیای ئێمەی هەس. توێژینەوەی وڕێنانی ئەوان ئاسۆی زانین دەکاتەوەو ئێمە لە واقیعی پراتیکیو سنوردار دوور دەخاتەوە. ئەم شێتانە کە کۆمەڵگە بەتۆمەتی سەرپێچی لە دابو نەریتان تڕۆی کردوون، لە دنیای وەهمو خەونو جێبەجێ کردنی داواکانی دەروونیدا دەژین، لێ توێژینەوە لە لاشعوری ئەوان کە لە کۆتی دەسەڵاتی ئاوەز ئازاد بووەو لە دوا ئەنجامدا هەموو کارێك لەوێندەر حەڵاڵو جایزە، جیهانێکی تازە لە ئێمە دەکاتەوە.

پێشتر گوتمان ئارمانجو مەبەستی سوریالیستان روخاندنی ئەو دیوارەیە کە کەوتۆتە نێوان شێتاتیو ئاوەزەوە. بەرهەمەکانی ئاندریە بریتوون و فیلیپ سوپو باشترین رێگەن بۆگەییشتن بەو مەبەستە. ئاندریە بریتون لە رۆمانە بەنێوبانگەکەی خۆیدا "ناجا- ١٩٢٨ بە تایبەتی ئەو مەسەلەیە دەخاتە روو: "ناجا" ژنێکی گەنجی نیگا سیحراوییە کە قارەمانی چیرۆکەکە جاری یەکەم لە شەقامێکی پاریسدا تووشی دەبێت. جارێکی دی لە کۆڵانێکدا دەیبینێتەوەو هەمدیس لێی گوم دەبێتەوە. چەند جارێکی دیکەش، وەك بڵێی چارەنووس پێشوەختەو بەوردی دیداری ئەوانی رێك خستبێ، دەیبینێتەوە. پاشان ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا دەکاتو ئیدی ئەو ژنە هزرو خەونەکانی ئەو دەخوێنێتەوەو، هەندێ پێشبینی بۆ دەکات کە راستو دروست دەردەچنو ئەو بەرەو دنیای رازئامێزی "دیداری کوتوپڕو ژوانی رێکەوتەکی سەیر" بکێش دەکات. قارەمانی چیرۆکەکە بە هەموو مقاوەمەتو پایەدارییەکی خۆیەوە، ئاقیبەت لە سایەی دەسەڵاتی ئەو ژنەدا باوەڕ بە رووداو رێکەوتانی مەحاڵ دێنێو گومان لە یەقینو حەتمیەتەکان دەکات. ئیدی زوو بەزوو لە بەرانبەر ئەودا دووچاری ترسو دڵە راوکێیەکی پیرۆز دەبێت. لێ "ناجا" دەکەوێتە گێژەنگی دنیای دەروونی خۆیەوەو لە روانگەی خەڵکانی دییەوە شێت دەبێتو دەیبەن بۆ شێتخانە. جا لێرەدا نووسەر مەسەلەی شێتایەتی دەخاتە روو و دەپرسێت کە بەڕاست

شێتایەتی چییە؟ کێ دەتوانێ مەرزی نێوان شێتایەتیو "نا شێتایەتی" دیاری بکات؟ ئایا ناتوانرێ بگوترێ کە "ناجا" گەییوەتە سەرچاوەی "زانینی حەقیقی"؟.
گوێ نەدانی شێتانە بەو رەخنانەی کە لێیان دەگرین ئەم گریمانەیە چێدەکات کە دنیای خەیاڵ هێزێکی مەزنی پێ بەخشیوون. لەزەتێکی وەها لە وڕێنەی لاشعوری خۆیان دەبینن کە هیچ ئیحتوبارێکی فەردیو شەخسی بە هەند ناگرن. کەواتە بەم پێیە خەیاڵو وەهم سەرچاوەی لەزەتێن ناچیزە نییە، قووڵترین کەیفی دەروونی لەوێندەرەوە سەر هەڵدەدات. یەکێك لە نووسەرانی سوریالیست کە لە ئەنجامی توندڕەوی لە "نووسینی خۆبەخۆ"دا دووچاری پەشێوەی زەینو پەرێشانی فیکر دەبێو بەپێی ئامۆژگاری دکتۆر دەبێ واز لەو کارە بێنێ، نامەیەك بۆ ئاندریە بریتون دەنووسێت: "لە وەڵامی پزیشکەکەدا گوتم کە من ڕێبازە روحییە نیگەرانی سازو ئومێد بڕەکانم لە رەوتو ڕێبازە لۆژێکیو دروستەکان پێ باشترە".
لە راستیدا ئەگەر کەسێك بەبێ رەچاوکردنی هەلومەرجەکانی ئاوەز لە بارەی وڕێنەی زەین مەست بێ، خەتەرێکی گەورە هەڕەشەی لێدەکات ئەویش ئەوەیە کە هەمیشەو بە حوسنو رەزای خۆی گیرۆدەی دەستی خەیاڵو شێتایەتی بێ، سووریالیستەکان چونکە رێگەی مقاوەمەت لە بەرانبەر وەسوەسەی لەزەتێن شێتی دەزانن تاسەر مەرزی تێکچوونی شعوران دەڕۆن. چونکە هەمیشە پەیوەندییەکانی خۆیان بە دنیای دەرەکییەوە دەپارێزنو لەبەر ئەمە دەتوانن بە حوسنو رەزا خۆ بخەنە بەختی ئەم "وەرزشە زهنییەوە"و تەنانەت لە مێشکی خۆدا شێتایەتی چێبکەنو، پاشان بگەڕێنەوە سەر حاڵی ئاسایی. ئەوزاری ئەم گەڕانەوەیە هەمان هێزی تەوسو تەنزە کە هەمیشە ئەوان لەلایەنی پێکەنیناوی شێتایەتی توند ئاگادار دەکاتەوە. بەم پێیە تەوسو تەنز نیگابانی "هەر هەموو زەینە"و بۆیە لە هەموو شێوەکانی سووریالیستیدا بەرچاو دەکەوێ.
بەمجۆرە یەکێك لە مەبەستەکانی سووریالیزم "چێکردنی حاڵەتێکی نزیك لە تێکچوونی شعورانە". واتە زەین دەبێ خۆی لە چنگی شتە خەیاڵیو قەراردادییەکان ئازاد بکات تا "ئۆتوماتیکییەتی مێشك" کە سەر کێشی ئاشکرا کردنە، بێتە قسە. ئاندریە بریتونو پول ئیلوار دەڵێن کە "تەجروبەی چێکردنی نەخۆشی دەروونی جێگەی غەزەلو قەسیدەو داستانو بەیتی بێ سەروبنو جۆرە سواوەکانی دیکەی ئەدەب دەگرێتەوە."
دەستپێشکەری ئەم شاعیرانە لە مەدایە کە هێزی خودکاری مێشك-یان لە رێگەتەجریبییەکانو، کاری بیرکردنەوەیان لە ژێر باری حوکمی پێداویستیانی پراتیکیو سوودی مادی ئازاد کردووە.

## ٥-شتێن سووریالیستی:

شێوانی هەست، مەرزەکانی زانیاری مرۆڤانی دەباتە دواوەو واقیعی دەرەکی لە بەهاو ئیحتوبار دەخات. لێ گەلێك لە شێتان وێڕای ئەوەی کە تەسلیمی خەیاڵاتی زەینی خۆیان نابن جیهانبینی تایبەتی خۆیشیان بەسەر شتەکانی جیهانی دەرەکیدا دەسەپێننو بەکار هێنانی سروشتی ئەم شتانە دەگۆڕن، شێوەی کارکردنی ئەوانە لە شێوەی کارکردنی سووریالیستەکان دەچێت کە بە زەبری تەوسو تەنز، رەنگی پێکەنیناوی بەشتان دەدەنو واقیع دەپشکننو زەین لە دنیای واقیعی بالاتردا دێننە جوڵە، لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا کە شێت لە روانینی خۆیدا تەواو وەستاوە،

بەڵام تۆیـژەری سووریالیسـت، پـاش جەولـەو گـەڕان بـە "ناوچـەی قەدەغـە"دا دەگەڕێتـەوە سـەر حاڵی ئاسایی خۆی.

ئیمتیازی شێتایەتی لەمەدایە کە نیشانی دەدات کە وێنەێن زەیـنی بـەچ ڕەوش و گۆڕانێك فۆرمی دەرەکی وەردەگرن و چۆن دەگەڵ واقیعی بابەتیدا تێکەڵ دەبن. بۆیە "سلڤادور داڵی".

لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: " سـووریالیزم ئـەوزاری دەرەجـە یـەکی خـۆی هەیـە بـە شـێوەی (ڕەوتـی شـێتی و ئیرادگـیری) کـە لـە یەکـەم هـەنگاوەوە توانیویـەتی لـە نیگارکێشـی و شـیعرو سـینەما و بونیـادی شـتە هەڵبـژاردەکانی سووریالیسـتی و مـۆدی ڕۆژو پەیکەرسـازی و مێـژووی هونـەرو تەنانـەت ئەگـەر پێویسـت بکـات، دەربـارەی ڕاڤـەو تەفسـیری مەتنـە موقەدەسـەکان-ش بـەکاری بێنیٚ".

بـەڕای ئـەو ڕەوت و ڕێبـازی بـەرکاری و سسـت و کاریگـەر پـەزێری تۆێـژەری سووریالیسـت دەبـیٚ جێگـەی خـۆی بـە ڕەوت و ڕێبـازی چالاك و کاریگـەرگوزار بسـپێرێت تـا بتـوانیٚ شـەقڵی عەمـەلی و فۆرمی مادی بە " دنیای وڕێنـە ئـامێزی دووره ئـەقڵی بابـەتی" ببەخشـێت. شـەقڵ و فۆرمانێك کـە تەنیا لایەنی زەینی و خەیاڵییان هەبیٚ ناتوانن "مەیل و حەزە دەرەکییەکانی ئێمە" وەدی بێنن.

کەواتـە دەبـیٚ وێنـەو فـۆرمی تـازە بهێنرێتـە ئـاراوە کـە لایـەنی بابـەتی و واقیعیـان هـەبیٚ. وەکـو تاقیکردنەوەی بزواندنی شێتایەتی "کە کاری ئیلوارو بریتـون بوون"و هـەروەها بونیـادی شـتێن سووریالیستی.

هەڵبەتـە لـەم پێودانگەوەیـە کـە سلڤادۆر دالـی پێشـنیازی دروسـتکردنی "ترومبیلانـی دێوئاسـا" دەکـات: ئەنـدازەو قـەوارەی ئـەم ترومبێلانـە سـیٚ هێنـدەی قـەوارەی ئاسـایی ترومبێلـەو کەرەستەکانی لە گەچ یان بەردە بەڵام وردەکاری ناسکترین و وردترین و بچووکترین سـەعاتی دنیا ناگـات بـە وردەکـاری پارچـەکانی ئـەو ئوتۆمبیلـە پێشـنیازکراوە. ئەوسـا دەبـیٚ ئـەم ترومبێلانـە بەخشڵی ژنان بڕازێنرێتەوەو لە گۆڕێك بنریٚ و گۆڕەکە لەگەڵ زەویـدا تـەخت بکریٚ و سـەعاتێکی دیواریی ناسك کە لە پوش دروست کرابیٚ لەسـەر مەزارەکـە دابنـریٚ تـا شـوێنەکەی بناسـرێتەوە. ئەم ئامێرە عەجیب و غەریبانەی سلڤادۆر دالی لە پێناسـەو باسـی (شـتی سووریالیسـتی)دا نـاوی بردوون ئەوە روون دەکاتەوە: "شتی سووریالیستی شتێکە کە کـەمترین کـاری میکـانیکی ئـەنجام بـدات و پشـت بـە خـەیالات و بەرجەسـتەکارییەك ببەسـتیٚ کـە لـە ئـەنجامی وەدی هـاتنی کـاری لاشعوری ئێمەوە هاتبنە ئاراوە".

ئاندریـە بریتـون پـاش دیـتنی خـەونێك، کەوتـە بـیری دروسـتکردنی ئـەم شـتانە، واتـە هاتنـە دی بابەتیانەی حەزو ئارەزووە سـەرکوتکراوەکان. ڕۆژێك لـە بازاڕی "سن مالو" چاوی بە کتێبێکـی سـەیر کـەوت: "سـۆز" ئـەم کتێبـە لـە پەیکـەری دارینـی جنۆکەیـەکی بـۆدراوی کورتـە بـالای ردێن سپیی درێژی تاسەر نووکی پیٚ هاتوو، دروست بوو بوو. تیرەی ئـەم پەیکـەرە ئاسایی بـوو و بـەم حاڵەشەوە ڕێگەی لە پەڕە هەڵدانەوە نەدەگرت. لیٚ، عەجایەب! پەڕەکانی لە بری کاغەز لـە خـوری زبـری ڕەش دروسـت کرابـوو! خێـرا کتێبەکـەی کـڕی، بـەڵام کـە لـە خـەو ڕابـوو کتێبەکـەی لەسـەر جێگەکـەی خـۆی نـەبینی بۆیـە لێـبڕا شـتانێك دروسـت بکـات "کـە جگـە لـە دنیـای خـەون لـە چ

شوێنێکی دیکەدا نەبینرێن، و نە سوودی مادیان هەبێ و نە لەزەتی مەعنەوی، بەڵام بشێت یارمەتی وێرانکردنی ئەم رازانەوە کارییە هونەرییە نەفرەت ئەنگێزە بدەن و ئەم بوونەوەرو شتە ئەقڵانیانە لە ئیحتوبار بخەن".
ئەم جۆرە شتانە، بەر لە شیعرو نیگارکێشی، خەڵکی ئاساییان سەرگەردان و حەیران کردووە، پیشانگەی بەرهەمێن سورریالیستی کە لە ساڵی ١٩٣٨دا کرایەوە تەمەشاڤانی دەهری کردو ژمارەیەکی دووچاری ورێنەو سەرسامی کرد.

## ٦- کەلاکی بەلەزەت:

سوود وەرگرتن لە هەموو ئەو ئەوزارو فاکتەرانەی کە بەکاری بڕینی پەیوەندی لەگەڵ زەینی بەردینی ئێمە بێ و دەرفەتی ئەوەمان بۆ بڕەخسێ کە زەخیرەی بێ سنوری دەرونی خۆمان بژمێرین بەجێ و سوودمەندە . بە هەر حاڵ پێویستە بۆشاییەك لە دەروونی خۆماندا دروست بکەین تالاشعورو ویژدانی پەنهان خۆبەخۆ بێتە زمان. هەموو کەسێك دەتوانێ بە تەنیا بگاتە ئەم گەنجینەیەو سوودی شەخسی لێوەربگرێ، هەروەها دەتوانێ هێزێن شعوری جەماعی لەیەك شوێندا بخاتە کارو سوودی زیاتر وەربگرێت.
ئەم مەبەستە لە ڕێگەیەکی سادەوە کەناوی (کاغەز وازی )یان لێناوە دێتە دی: چەند نەفەرێك لەدەوری یەك دادەنیشن و پارچە کاغەزێکی بچووك دەست بەدەست لەناو خۆیاندا دەگێڕن. هەر کەسەو لەسەرەو نۆرەی خۆیدا وشەیەك لەسەر ئەو کاغەزە دەنووسێت یان خەتێکی پێدا دەکێشێت. ئەنجام کۆمەڵە رستەیەکی عەجیب و غەریب یان نیگارێکی ناواقیعی بەدەست دێ. یەکەمین نموونەی ئەم وازییە کە ئێستا بایەخی دەقی کۆنی وەرگرتووەو ناوی خۆی کە لە دوو ووشەی یەکەمی وازییەکەوە هاتووە، بەم جۆرە کارانە داوە، ئەم رستەیەی خوارەوەیە کە بەهەمان شێوازی سەرێ دروست بووە:
(( کەلاکی بەلەزەت، شەرابی تازە دەخواتەوە ))
ئیدی بە پەیرەوی هەمان ڕێباز کە دەتوانێ بەهێزترین وێنەی ریالیستی پەتی دروست بکات، گەلێك رستەی سەیرو سەمەرەی وەکو ئەوانە دروست بووە: (( سەدەفی سنگال، نانی سێ رەنگ دەخوات... بوخاری باڵدار، باڵندەی گێلی خەڵەتاندووە)). هەروەها زۆر تابلۆو نیگاری سەیری وەکو مرۆڤێك کەسەری قرژاڵ بێ هاتۆتە ئاراوە. پۆل ئیلوار شەرحی ئەو شەوانە دەکات کە بەجۆش و خرۆشەوە. لە کاری ئەفراندنی کەلاکێن بەلەزەتدا سەرف کراوە. هەر یەکێك لە ئێمە دەیویست جەزبەیەکی زیاتر، یەکێتیەکی زیاتر، بوێرییەکی زیاتر بەم پارچە شیعرە دەستە جەمییە بدات. هیچ غایلەیەك، هیچ یادێکی هەژاری و بێزاری بە لاپەڕەی شعوری ئێمەدا تێنەدەپەری. ئێمە لەگەڵ وێنەکانی زەیندا قومارمان دەکرد بەڵام چ دۆڕاوێك لە گۆڕێ نەبوو...
ئەگەر کەسێك لە نێوماندا پرسیارێکی بکردایە، پەشێوی یان ئاسوودەیی بیری تەنیا لای وەڵامەکە بوو. واتە هیچ خەمێکی نەبوو تەنیا خەمی وەڵامەکە نەبێ. پرسیارەکەی لەسەر

کاغەزێك دەنووسی و بەکەسی نیشان نادا، لە راستیدا گرفتی خۆی بۆ خۆی دەردەبڕی و، لە ناکاودا کەسێك لە نێو کۆمەڵەکەوە بەوپەڕی دڵنیاییەوە وەڵامی دەدایەوە.
ئەو پرس و وەڵامانەی کە لەم جۆرە گەمانە کەوتوونەتەوە، بۆ نموونە بەم شێوەیەیە:

- بەهار چییە؟
- چرایەکە کە خۆراکی گو ئەستێرەیە.
- مانگ چییە؟
- مینا فرۆشی کیشوەری عەجایەبان.
- ئایا سورریالیزم لە بیناکردن و وێرانکردنی ژیاندا بەیەك ئەندازە دەوری هەیە؟
- گوڵێکە جگە لە گوڵ هیچ شتێکی دیکە لە پێکهاتەی بەکار نەبراوە.

کەواتە "کەلاکی بەلەزەت" توانای ئەوە بە بنیادەم دەدات کە لە چنگی واقیعی خەمین و مەینەتبار ئازاد ببیّ و تا قووڵایی جیهانی پچڕان و سەرسامی بڕوات و شۆڕبێتەوە. کەسانێك کە بێنە ناو ئەم گەمەیەوە دەتوانن لە دەستی کەسایەتی تەقلیدی رزگار بن و ئۆتۆماتیکیەتی مێشك بچالاکێنن.

## ٧- نووسینی خۆبەخۆ:

هەڵبەتە ئاڕمانجی ئەو شێوە جۆراجۆرە سوریالیستیانەی کە راڤەمان کردن، وەدەرنانی ئەزموونی شارستانیەتە تا (ئادەمیزاد لە خۆیدا) بەسروشتە سەرەتاییەکەی خۆی دەربکەویّ و بتوانێت هەموو هێزە سایکۆلۆژییەکانی خۆی وەربگرێتەوەو بەڕاستی ئازاد ببیّ.
لاشعور کە لە حاڵاتی خەوو شێتییەتیدا لەکۆت و بەندی چاودێری (زەینی بێدار) ئازاد دەبیّ خۆبەخۆ جیلۆە دەکات و (نووسینی خۆبەخۆ) پەیامەکانی تۆمار دەکات.
بەمجۆرە ئاندریە بریتون حاڵەتی نێوان خەوو بێداری وەرگرت و کەشفی کرد.... بە شێوەیەکی لاشعوری دنیایەك رستە لە زەینیدا پێکهات و ئەم رستانەی بە ((رەگەزی دەرجە یەکی شیعر)) زانی. دەیگوت ئەم جۆرە رستانە بنجبڕی و حەتمیەتی ریزپەڕ بۆ زەین دروست دەکات و رێك وەکو ئەو وشانە وایە کە لە پشت پەردەی نمایشەوە دەگوترێن. لە ((یەکەمین بەیاننامەی سورریالیزم))دا ئەوە دەگێڕێتەوە کە شەوێك، بەر لە خەوتن، گوێی لە رستەیەکی سەیر بوو کە هیچ پەیوەندییەکی بە چالاکی بێدارییی ئەوەوە نەبوو، رستەیەك بوو بە مکوڕ بوونەوە خۆی "بە پشت جامی پەنجەرەی زەیندا دەدا. شەوێکی دیکەش خەونێکی دیارو روون هاتبووە خەوی و کەبێدار بوو بووەوە وای هاتبووە خەیاڵ کە بێگومان ئەم خەونەی لە شوێنێکدا بە چاوی خۆی دیتووە. لە ئەنجامی ئەم جۆرە ئەزموونە شەخسییانەدا کەوتبووە بیری ئەوەی کە حاڵەتی پەزێرایی و قبوولکردن بە ویست و بەرنامە لە خۆیدا دروست بکات و رەوتی خۆبەخۆیی ئەم کاریگەرییە دەروونیانە بخاتە سەر کاغەز. وەکو چۆن فرۆید دەروون نەخۆشەکانی دێنایە قسەکردنی نا ئاگایانە، ئاندریە بریتون-ش لێبڕا کە ئەم ئەزموونە دەرهەق بە خۆی بەکار بێنیّ و

هێنده به خێرایی لاشعور بێنێته قسه كه زەینی ئیرداگیر نەتوانێ دەست بخاته كاروبارییەوەو داوەری بكات تا (فیكری نوتقدار) بێ هیچ كۆسپ‌و لەمپەرێك بێته قسه.

هەڵبەته بۆچوونه ناو ئەم (حاڵی بێخودی)یەوه دەبێ له دەستورو ویسته دنیاییەكان دوور بكەوێتەوه. ئاندریه بریتون و فیلیپ سوپو بەم رێگەیه لاشعوری خۆیان هێنایه قسان و به تەقریری ئەو كتێبی (( مەیدانه موگناتیسییەكان))یان كه ((یەكەمین بەكارهێنانی ئەم ئیكتیشافه)) بوو، نووسی: هیچ فەسڵێكی ئەم كتێبه دەلیلێكی بۆ كۆتایی خۆی نەبوو تەنیا ئەمه نەبێ كه رۆژ گەیی بووه كۆتایی‌و رۆژێكی دی، كارێكی دی (یانی فەسڵێكی تازه) دەستی پێدەكرد، چونكه مێشكی ئۆتوماتیكی سەربەخۆ چالاكییەكی دیكەی دەست پێدەكرد.

ئەم كتێبه به بۆنەی لێكچوونی خواستنی جوان‌و چاوەڕوان نەكراوو تەنزئامێزەوه شۆرەت‌و ناوبانگێكی بێ وێنەی پەیداكردووه.

ئەمەش چەند نموونەیەكه لەو جۆره رستانه: "زندانی ئێمه به كتێبانی دڵخواز دروست كراوه، بەڵام به هۆی ئەم هەموو بۆنه ئاشقانەیەوه كه دەمانكاته خەو ئیدی ناتوانین هەڵێین... هەموو كەس دەتوانێ بەم راڕەوه خوێناوییەدا، كه گوناهەكانمان له شێوەی وێنەی بەلەزەتدا پێیا هەڵواسراوه، تێ بپەڕێ، به هەر حاڵ رەنگی كەوەیی لەم وێنانەدا له هەر رەنگێكی دی زیاتر بەرچاو دەكەوێ".

ئاندریه بریتون دەربارەی ئەم رێبازه دەڵێت: "بۆ تۆ كه دەنووسێت، ئەم رەگەزانه به رواڵەت ئەوەنده نامۆو نا ئاشنا دەنوێنێ وەكو بۆ هەر كەسێكی دی. بۆیه خۆت لەم رەگەزانه دووره پەرێز دەگرێ" یەكێك له شاگردانی سورریالیزم كه قیروسیای كردووەو ئەم رێبازەی لەسەر خۆی جەڕباندووەو بۆمانی دەگێڕێتەوه كه هەستێن نەناسراو بەرەبەره دەوری روحی داو له نێو لافاوو بۆرانی دەنگاندا گیرۆده بوو و زەینی به ئاسمانێكی نا ئاشنادا كەوته فڕین‌و لاپەڕەی شعوری سپی بوو و هزری بەسەر وشەكاندا بوری‌و سەرەنجام توانی به ئاسانی هونەره زمانەوانییەكانی سوریالیزم چێ بكات. جیابوونەوەو دابڕان له دنیای دەرەكی هێنده خەسته ئەگەر پیاو دەست له نووسین هەڵگرێ دەڵێی له پڕ له خەوێكی قووڵ رادەپەڕێ: "چاوان ئیدی لەگەڵ شتی ژینگەدا ناسازێن‌و لەرزه دەكەوێته پێ".

به مەبەستی دەرك كردن‌و تۆماركردنی چالاكی ناخودئاگا، قۆناغێكی "هیپنوتیزم"ش دەستی پێكرد. هیپنوتیزم یەكێ بوو لەو داوانەی كه سوریالیزمی بەدنیای عەجایەبانەوه گرێ دەدا.

سوریالیستەكان دەیانویست ئەو وەڵامانەی كه كەسێك له حاڵی خەوی موگناتیسیدا دەیداتەوه تۆمار بكەن‌و ئەو وەڵامانه لەگەڵ ئەو رستانەدا كه له جیهانی بێداریدا له رێگەی "نووسینی خۆبەخۆ"وه وەدەستیان هێنابوو له بەرانبەر یەك دا بنەن‌و پەیوەندی نێوانیان كەشف بكەن. گۆڤاری "ئەدەبیات" ئەنجامی ئەو ئەزموونانەی به بەردەوامی بڵاودەكردەوه. دسنوس‌و كروڤیل‌و پرێه لەو نووسەره سوریالیستانه بوون كه بەر تاقیكردنەوەی خەوی موگناتیسی كەوتن‌و بریتون‌و ئیلوارو ئیرنست-ش شایەدی ئەم ئەزموونانه بوون له ساڵی ١٩٢٢ به دواوه گەلێك كۆڕی وتار خوێندنەوەی گرینگ دەربارەی هیپنوتیزم گێڕا.

بەڵام ئاندریە بریتون باوەڕی وایە کە نووسینی خۆبەخۆ دەبێ هەمیشەو لە هەموو حاڵێکا نزیکە دەستی هەموو کەسێك بێ‌و بەم پێیە لەگەڵ خەوی دەستکردو موگناتیسیدا جیاوازی هەیە، جا بەم حاڵە ئەو پێناسەیەی کە یەکێك لە زانایان دەربارەی هیپنوتیزم کردوویەتی دەکاتە: "هۆیەکی بێ چەندو چوونی ئاسانکردنی تەڤگەری هێزە دەروونییەکان‌و بە تایبەتی قەریحەی هونەری: یەکەم لە ڕێگەی تەمەرکوزی زەین لە کارێکدا کە دەبێ ئەنجام بدرێ، پاشان بە رزگاری تاك لە چنگ ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی کە بەردەمی بنیادەم دەگرن‌و بە جۆرێ دەروون‌و گیانی دەشێوێنن کە هەندێ جار کاری دەرکەوتنی تواناو بەهرە پەنهانەکان بە تەواوەتی رادەگرن".
زەین پێویستە بە تەواوەتی حاڵەتی پەزێرایی‌و کارتێکراوی هەبێ‌و جگە لە تۆمارکردنی ئەم "ئیملا جادوو ئامێزە" هیچ کارێك ئەنجام نەدات‌و هێزە بێدارو هوشیارەکانی ناخ خامۆش‌و بێ دەنگ بکات. هەر جۆرە هەوڵ‌و تەقەللایەك بۆ فامین‌و حاڵی بوونی ئەو شتەی کە دەینووسین بێ ماناو نابەجێیە: دەبێ واز لە وشەکان بهێنرێ تا ئازادانە بە دووی یەکدا بێن. لەگەڵ ئەم حاڵەشدا ئاراگۆن گوتەنی: " پیاوێ کە قەڵەمی بەدەستەوە گرت خۆی بەوە دەزانێ کە بۆ دەربڕین‌و نیشاندانی نهێنییەکی ژیانی نامۆو نا ئاشنا تەرخانەو لەم پێودانگەوە تەسەور دەکات هەر درۆو دەلەسەیەك بە ژێر قەڵەمەکەیدا هاتبێ نووسیویەتی، هەڵبەتە بێ خەبەران دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەم کارە بناغەو بنەمای نییە... لە سوریالیزمدا هەموو شتێك یاساو دروستی‌و ئیحتوباری حەتمی‌و زەروری خۆی هەیە. مانای رستەکان لە دەرێی بوون‌و هەستی نووسەردا قاڵبی خۆ وەردەگرن باشترین شێوەی نووسینی خۆبەخۆ بە تایبەتی لە ڕێگەی دیالۆگی نێوان دوو کەسەوە دەگاتە سەمەر، چونکە پێکادانی دوو روح‌و دوو زەین‌و دوو زەوق، وێنەی چاوەڕوان نەکراوو جوانتر دەوروژێنێ، بە مەرجێ هەر یەکێك لە دوو لایەنی دیالۆگەکە لەگەڵ خۆیاندا گفتوگۆ بکەن‌و هەرگیز بەلای ئەوەدا نەچن کە کار بۆ رەفزکردن یان بۆ قەبوڵکردن‌و سەلماندنی قسەکانی لایەنی بەرانبەر بکەن. فەسڵی "کۆسپان"ی کتێبی "مەیدانەکانی موگناتیسی" بە هەمان شێوە نووسراوە.
ئەم رۆچوون‌و قوڵ بوونەوەیە بە قوڵایی ناخ‌و شعوری باتیندا بووەتە مایەی دروست بوونی وێنەێن شاعیرانە، چونکە شیعر لە نیگارکێشی پتر دەتوانێ ئەم ئەشکەوتە پڕ نهێنیانە بپشکنێ. شیعر لە کۆتی مادە ئازادترەو زنجیرەی فیکران لە (حاڵی بێخودی)دا باشتر نیشان دەدات‌و دەردەبڕێ. ئاندریە بریتون ئیلهاماتی پەیڤ لە رووی (چەمکی بابەتییەوە) زۆر بە دەوڵەمەندترو، لەبەر چاودا زۆر بە پایەدارتری دەزانێ لەوێنەێن نیگارکێشی، و تەنانەت هێرش دەباتە سەر "هێزی درۆینەو سروش‌و ئیلهامی شاعیرانە"و دەڵێت کە شیعری (لوتره ئامون)و (رامبو) سەرەتا خەڵقەندەی زەین‌و رۆنراو لەسەر (شتە زانراوەکانی ژیانی پێش لە دایك بوون) نەبووە، و ئەم دوو هونەرمەندە باڵادەستە تەنیا گوێیان بۆ ئەو دەنگە ناسك‌و پەیڤە ئاڵۆزانە گرتووە، کە لەکاتی نووسیندا، لە داڵانە تاریك‌و نوتەکەکانی هەستیانەوە هاتووەو خستوویانەتە سەر کاغەز: ئەوەی "درەوشانەوە"ی پێ دەگوترێ لە پاش ئەم قۆناغەوە دێ.

ئەم جۆرە "قووڵبوونەوە"یە بەناو تاریکستانی لاشعوردا جگە لە یارمەتی دانی دەرکەوتن‌و گەشەکردنی چەمکی مرۆڤانی‌و ناسینی خودی خۆت‌و جیهان چ سوودێکی تری نییە. حوکمی سوریالیزم ئەمەیە کە: "ئەو کەسانەی ئەم جۆرە ((هێزە زەینیە گرانبەهایەیان)) هەیە، پێویستە بە کۆمەکی ئەو چرایەی کە ئەم هێزە هەڵیگیرساندووە، هەم خۆیان بۆ تۆژینەوەی تەرزی کارو بونیادی ئەم دەزگایە (ئیلهام) تەرخان بکەن بە مەرجێ کە بە بەخششێکی ئاسمانی‌و شتێکی پیرۆزی نەزانن، و هەم دەبێ لەو دەمەدا کە متمانەی تەواویان بە خەسڵەتی نائاسایی ئەو هەیە، دوا داوو پەیوەندییەکانی بپچڕن‌و ئەو شتەی کە خەڵکانی دی هەرگیز جورئەتی تەسەور کردنیان نییە- ئیلهام بخەنە ژێر رکێفی فەرمانی خۆیانەوە."
رێگەیەك کە بە کۆمەکی "یاخی بوون"و "وێرانکردن" بکرێتەوە دەچێتەوە سەر "دنیای لەمە چێتران". لەم دنیایەدا هەر جۆرە مەستی‌و بێ ئاگاییەك جایزو حەلاڵەو زمانی دانیشتووانی ئەوێندەر هەمان زمانی نووسینی خۆبەخۆیە. جا لەم یەکانگیری‌و پێکادانە تریشقە ئاسایانەی وێنەو مانایانەوە، کۆمەڵە جوانییەکی سەیرو دەگمەن لە دایك دەبێ کە تەنیا هونەرمەندان لە عۆدەی دێن‌و دەتوانن شرۆڤەی بکەن و نیشانی بدەن. شاعیران، بە باوەڕی بریتون، لە قەڵەمڕەوو ناساندنی رووحدا، مامۆستای ئێمەی خەڵکی ئاسایی‌و عەوامن، چونکە لە سەرچاوەگەلێکەوە ئاو دەخۆنەوە کە هێشتا زانست پێ نەگەییووە.

## سوریالیزم‌و شیعر

بۆ چوونە ناو زۆنگاوەکانی قولایی ناخ‌و لاشعورەوە پێویست بە جورئەت‌و ئازایەتییەکی گەورەی بێ وێنە هەبوو، و ئەم کارەش تەنیا لە دەستی شاعیران دەهات، چونکە جوانی وێنە ناگەهانییەکانی زەین دەیتوانی ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەی کە جیهانی واقیع خستبوویە بەر پێی خەونەکانی ئەوان، بە شێوەیەکی کاتی فەرامۆش بکات. بە قەولی رنەکروڤیل "شیعر لەلایەکەوە بۆ لایەکی دی، لە فۆرمی شتێکەوە بۆ وێنەی زەینی ئەو شتە، لە وێنەی زەینی شتێکەوە بۆچەمکی ئەو شتە لە چەمکی شتێکەوە بۆ واقیعی دیاریکراوی دەرەکی ئەو شتە، پرد لێدەدا، دەپەڕێتەوە... شیعر رێگەی ئازادییە".
دەبێ ئازادی ئوتۆماتیکی‌و تەڤگەری بروسکەئاسای زەین، کە پرەنسیپی پەروەردەو فێرکردنی کۆن فەرامۆشی کردووە (چونکە نەیویستووە بە فاکتەری گەشەسەندنی بەهرە شاراوەکانی زەینی بزانێ) بێتە دی‌و بۆ ئەم کارەش لە یەك رێگە زیاتر نییەو ئەوەش دەربازکردنی شیعرە لە چنگی کۆت‌و بەندو لەمپەران‌و نەجاتدانی شیعرە لەنیری کۆیلایەتی ئەخلاق‌و لۆژیك.
لە روانگەی هونەرمەندێکەوە کە (جیهانی عەجایەبان) لە نێو جیهانی واقیعدا دەبینێ، سەرانسەری گێتی رەنگی شیعر بەخووە دەگرێت: بەیاننامەو ئاگادارییانی سەر کاغەزو بانگەشەو پارچە رۆژنامان کە بدرێنە دەم یەکەوە شیعر پێك دێنن، چونکە وەکو چۆن ئەگەر شتێك لە ماناو چەمکی زاراوەیی‌و باوی خۆی دابڕدرێ دێتە ناو جیهانی (واقیعی بالاتر)، وەکو چۆن لکانی رستەێن پەراگەندەو وێنەێن نا ئاسایی بە یەکترەوە زەین لە واقیع دوور دەخاتەوەو

بۆ دنیایەکی دیکەی دەبات. بە گوتەی تریستان تزارا "دەشێت شاعیر بیو شیعر نەڵێی... چلۆنایەتی شیعر لە کوچەو کۆڵانان، لە موغازەێن بازرگانی، لە هەموو شوێنێکدا هەیە".
سەرانسەر ژیان بابەتی شیعرە "دەشێت شتێکی بچووك بکریٚ بە هەوێنی شیعر: دەستەسڕێك کە دەکەوێتە سەر زەوی بۆ شاعیرێك حوکمی ئەو مەڵغەیەی هەیە کە دەتوانیٚ دنیای پیٚ بجووڵێنیٚ". ڕووداوێك چەند بچووكو کەم بایەخ بنوێنیٚ، بۆ کەسێك کە بتوانیٚ بیکات بە ئالەتی دەربڕینی دەنگی ناخو دەروونی خۆی، جیهانێکی پڕ لە سەرسامیو ڕازو نهێنی تێدایە. هەموو کەسێك شاعیرەو بە خۆی نازانیٚ. ئەوەندە بەسە کە چاو لە ئاسۆی سنووورداری خۆی وەربگێڕیٚ تابێتە ناو ئەم جیهانە عەجایەبەوە.
لەبەر ئەمە، بۆ نموونە شیعرێن پول ڤالیری کە مەسەلەێن ئەدەبیی بەدەر لە چەمکان لە چوار چێوەی تیۆریانی فەلسەفیو فۆرمێن ماتماتیکی دەردەبڕن، بووە مایەی ناڕەزاییو توڕەبوونی (نەیارانی تەگبیری ئەدەبی). سوریالیستەکان زۆر لەم بۆچوونەی ڤالیری قەلس بوون کە دەیگوت: "زۆرم پیٚ خۆشترە کە بەوپەڕی هۆشو گۆشو ڕۆشنبینییەوە بابەتێکی ناچیز بنووسم نەك بە کۆمەكو یارمەتی گیانانو دوور لە بوونی خۆم شاکارێك-ی نێو جوانترین شاکاران بئافەرێنم". لەبەر ئەمە بوو کە لە ساڵی ١٩٢١دا لەم شاعیرە جیابوونەوەو گوتیان: "شێتایەتی لە پایان بینیو نێرەنگو تەگبیر باشترە."
ئەم شاعیرە تازانە بەدەم سۆراخو تاقیبی "ژیانی ڕەسەن"ەوە گەیینە ئەم ئەنجامگیرییەی کە سڕینەوەو چاك کردنو دەستکاری لە شیعردا، واقیعی باڵاتر، کە بە دژواری دێتە دی، لەکەدار دەکات. پول ئیلوار دەڵێت: "خەیاڵ، پاکیەتی، توڕەیی، زەین، حیکایەتی پێشینان، مێژو مەرەکەب، دیمەنێن نەناسراو، بیرەوەرێن ناگەهانی، پێشگۆیی سۆزو گودازان، سووتانی فیکرو هەستو شتان، ڕووتی کوێر، هەنگاونانی ئاسایی بەرەو ئارمانجێن بیٚ فایدە کەگرنگترین فایدەیان هەبووە، پەراگەندەبوونی لۆژیك تا ڕادەی پووچی، سوود وەرگرتن لە پووچی تا ڕادەی ئاوەزی یاخی: ئەمەیە شیعر. بەڵام پیتێن بێدەنگو دەنگدارو وشەێن خۆشئاهەنگ ڕیز کردن چ بە شارەزاییو چ بە نابەڵەدی شیعر نییە. دەبیٚ فیکری ئاهەنگدار کە پێویستی بە تەپڵو دەفو دایەرەو کێشو قافیە (واتە کۆنسێرتێك بۆ گوێی کەران) نییە، بهێنرێتە قسە." بە گۆرەی ئەم باوەڕە هونەر بریتییە لە ڕزگاربوونی زەین لە کۆتو بەندو سنووورداری، تا (ئیلهامی خاڵیسە) بە کەماڵی ئازادی بجوڵێت. لیٚ "هونەر بۆ هونەر"ش بیٚ مانایە، هونەر خۆی لە خۆیدا مەبەستو ئارمانج نییە، چونکە ئاندریە بریتون دەڵێت: "ئێستا هەمووان دەزانن کە شیعر دەبیٚ سەمەرێکی هەبیٚ"، و پەیڕەوانی ئەو ئومێدەوارن کە لاشعورو نائاگایی، نهێنییەکانی واقیعی باڵاتر ئاشکرا بکات.
بەم پێیە شاعیری سوریالیست پابەندی ئیلهامەو بە پێچەوانەی باوەڕی پۆل ڤالیرییەوە کە دەڵێت: " لایەنی زۆری شانازی ئەگەر بەرانبەر بەلایەنی کەمی مەسئولیەت نەبیٚ بیٚ مانایە". ئاندریە بریتون دەیگێڕێتەوە کە یەکێك لە شاعیرە گەورەکان، پێش خەوتن تابلۆیەکی لە پشت دەرگای ژوورەکەی هەڵدەواسی کە لێی نووسرابوو: "شاعیر سەرقاڵی کارە". بۆ (تەمرینی شیعر)

که پۆل ڤالیری تاکیدی لەسەر دەکرد، چ سووکایەتییەك لەم بۆچوونە بالاترە کە "بە بچووکترین نووکە قەڵەمو سڕینەوەو چاك کردنەوە، شیرازەی پڕەنسیپی ئیلهامی بێ چەندوچوون لێك دەپچڕێ... چ گەوجێتیە کە ئەوەی خەونو خەیاڵ بە ترسو لەرزەوە "دروستی کردووە" بێتە سڕینەوە. چ شانازییەك لەمە گەورەترە کە نووسەر نەزانێ زمان چییە، قسە چییە، دەستووری نووسین چییە، هەلومەرجی کۆتایی هێنان بە قسە چییە، نە چەندو نە چۆنی بزانێت؟ لە روانگەی سوریالیستەکانەوە "لوتکەی هونەر لە تەمەڵی دایە".

بەم جۆرە دەبێ کۆششی ئیرادی وەدەر بنرێ. هێزی جیاکردنەوەو زانین، سەفای ئیلهام دەڕوشێنێ. سیمبولیزم شاعیرانو نووسەرانی فێری ئەوە دەکرد کە لە هەر کارێکی هونەریدا ئەوپەڕی "وردی" بەکار بێنن، لە کاتێکا سوریالیزم رایدەگەیەنێ کە نهێنی داهێنانو ئەفراندنی هونەری تەنیا لە حاڵەتی خەونو خەیاڵدا بوونی هەیە، و ئەم حاڵەتە دوا پلەی (سەلبی مەبەستو بەرژەوەندی) نیشاندەدات کە مەبەستو ئارمانجی چالاکییە زەینیەکانی مرۆڤە. ئیلهام بە باوەڕی ئاراگون، بریتییە لە "ئامادەیی تەواو بۆ قەبوڵکردنی رەسەنترین حاڵەتێن زەینو دڵی مرۆڤ، ئامادەییە بۆ قەبوڵکردنی واقیعی بالاتر".

بۆ تێگەیشتن لەم جازیبە جۆراوجۆرانەی کە بەرەو نهێنی جیهان دەڕۆن، یەکێك لە سوریالیستەکان ئەم پێشنیازە دەکات: با خوێنەر بۆ ساتێك تەسەور بکات کە زەینی ئەو بازنەیەکەو وێنەی ئاگایی (شعور)ی بێدار لە ناوەندی دایە، ناوچەکانی نێوان خاڵی چەقو هێڵی محیط دەکاتە قەڵەمڕەوی تەواوی لاشعور. سوریالیستەکان هەوڵدەدەن کە ئەم خاڵی چەقە لە نێوبەرن تا لەگەڵ (بێ نیهایەت)دا هاوتاو یەکسان بن. شاعیرانی سوریالیست کە جڵەوی خۆیان داوەتە دەست ئیلهامەوە دەیانەوێ لەو رێگەیەوە بگەنە یەکێتی جیهانو ببن بە پەیامنێری خودا. بە باوەڕی ئاراگۆن "ئەگەر بەوە قاییل بین کە شعورو ویژدانی ئاگا جگە لەسەرچاوەی شعوری پەنهان ئیدی نەیتوانیوە رەگەزەکانی مەعریفەتی خۆی لە هیچ شوێنێکدا بەدەست بێنێ، ئەوسا ناچارین دان بەوەدا بنەین کە شوێنی شعوری بێدار لە ناو شعوری پەنهاندایە".

لە سەرەتای ئەم فەسڵەدا گوتمان کە سوریالیزم زیاتر قوتابخانەیەکی شیعرییەو موریدانی ئەم قوتابخانەیە هەوڵیانداوە کە جیهانبینی خۆیان لە رێگەی شیعرەوە بەرجەستەو شرۆڤە بکەنو بەم شێوازە شۆڕشەکەی خۆیان پراکتیزە بکەن.

لە راستیدا شیعر بە کۆڵەکەی سەرەکی ژیان دەزانن، چونکە پێیان وایە کە شیعر دەبێو دەتوانێ گیروگرفتی ژیان چارەسەر بکات.

بە گوتەی یەکێك لە شاعیرانی ئەم قوتابخانەیە: "شیعر خۆی لە کۆنترۆڵی ئەدەبیاتو تەنانەت لە هەرێمی کاغەز دەرباز کردووە لە پڕ بەناو جەرگەی ژیاندا رۆچووە. شیعر ئیدی هونەر نییە، حاڵەتێکی رۆحییە، خودی ژیانە، خودی رۆحە. شیعر چۆنیەتی تێگەییشتنو هەستکردنە. بە کارهێنانی هەستەکانە، بە تایبەتی هەستی شەشەم، رێچکەو رێبازی مەعریفەتە."

کەسایەتی شاعیر لەنێو ئەم شەپۆلە لێوان لێوە گوم دەبێ. شاعیر، رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی جیهانە رازدارو نادیارەکانە.

ئاندریـه بریتـون دەڵێـت: "سـاڵانێك ئومێدم بـەم ڕەوتـی لافـاو ئاسـای نووسـینی خۆبـەخۆ بـوو تـا تەویلەی ئەدەبیات بە تەواوەتی لە پۆخڵەوات پاك بكەمەوە. جالەم ڕوانگەیەوە، ویستی شكاندنی لەمپەرەكان و كردنەوەی گرێیەكان داینەمۆی باتینی سوریالیزمە". زۆر زەحمەتە جیهـانی خـەون بـە زمـانی بـاو بێتـە دەربـڕین و نیشـان دان، چـونكە بـە زۆری دەبـێ مانـای نـە چـاوەڕوانكراو لـە وشـەكان دەربهێنـرێ. بۆیـە خوێنـەری شـیعرێن سوریالیسـتی دەبـێ لـە یەكـەم ڕوانینـدا بـە تـەمای تێگەییشتن نـەبێ، چونكە ناگاتـە هیچ كوێ، بەڵكو بە گوێرەی دەستووری سوریالیستان دەبـێ زەینی خۆی، لە حاڵەتی پەزێرایی و كارلێكراوی تەواودا، بە وشان بسـپێرێ تا مانـای مـەجازی و وێنـەێن زهـنی و چـەمكی قـووڵی شـیعر بەرەبـەرە "ببـزوون"، و ئەگـەر تـوانی بەوپـەڕی ویـژدان و شعوری خۆی لە ژەنگی زانیارێن دەستكردو داب و نەریتی ریشەدار پاك بكاتەوە هەنگێ شـەپۆلی ژیانی دەروونی بەسەریدا دەبارێ.

شیعریش، وەكو نووسینی خۆبەخۆ، ئەو توانایە بە مرۆڤ دەدا كە دنیایەكی تازە بدینێ و ڕەگـەزو توخمـەكانی لەگـەڵ ڕەگـەزو توخمـەكانی دنیـای عـەیان و واقیعیـدا بـەراورد بكـات و هاوسـەنگییەك چـێ بكـات. هـەر كـاتێ ئـەم ڕەگەزانـە بەڕێـژەی یەكسـان ئاوێتـەو تێكـەڵی یەكـدی بـوون هـەنگێ یـەكێتی شـیعر چـێدەبێ و خـۆی نیشـاندەدات. بـە گـوێرەی ئـەم پێـوەرە، جووتبـوونی فـۆرم و ناوەڕۆك، كە بنەمای جوانیناسی كانت بوو، لـە خەسـڵەتە ڕەسـەنەكانی شیعری سوریالیستییە.

لە شیعرێن سوریالیستیدا، نزیك بوونەوەی ڕەگەزانی جیاوازو دژ بەیەكتر پەیوەنـدی بـە ویسـتن و كۆششـی ئاگایانـەی شـاعیرەوە نییـە. ئاندریـە بریتـوون نكـۆڵی لـەوە دەكـات كـە لێكچـواندن و خواسـتنەكانی "تشـبیهات واسـتعارات" شـیعرێن پـیر ڕوردی زادەی فیكـری پێشـوو و ئامـادەیی ئیرادی بـێ. بۆ نموونـە ئەمانـە: "سـروودێك بـە جۆگـەدا دەڕوات"، "ڕۆژ وەك سـفرەی سـپی لێـك كراوەتەوە"، "دنیـا چووەتە نـاو كیسـەیەكی ڕەشـەوە- لـە ئـەنجامی نزیكبوونـەوەی بـێ پێشـەكی دوو وشە یـان دوو چـەمك لـە یەكـدی، لـە پـڕ نـوورێكی تایبـەتی دەدرەوشێتەوەو ئاندریـە بریتـون بەمە دەڵێت "نوورو روناكی وێنە" ئەم ڕەگەزانـە بـە مەبەسـتی خوڵقانـدنی كتوپڕی پزیسـكی نـور كۆنەبوونەتەوە، بەڵكو زادەی هەنووكەیی چالاكی سوریالیسـتی بوونـەو بـە شـێوەی جیـا بـەڵام لـە یـەك زەمانـدا لـە قـوڵایی شـعوری پەنهانـەوە هاتوونەتـە دەرێ. و كـاری ئـەقڵ تـەنیا پشـتیوانی و تۆماركردن و هەڵسەنگاندنی ئەم پزیسكە ئاسمانییە بووە.

گەڕان لە "ناوچەی قەدەغە"دا دەچێتەوە سەر دنیایەكی جوان و دڵڕفێن. ڕێبوارێك كە تاقە جارێك لـەم مەنزڵە لابدات ئیدی دەست بـەردار نـابێ تـا جـارێكی دیكـە لـەزەتی ئـەم دیـدارە نەبینێتـەوە. لەبەر ئەمەیە دەبـێ سوریالیزم بە هـۆی كاریگەرییە نهێنی ئـامێزو لەزەتـە تایبەتییەكانییـەوە بـە "بەنگێكی تازە" بێتە ژماردن، چونكە ئەم دنیایەی كە لەبەر چاوی بنیادەمی بەرجەستە دەكـات، زۆر لە جیهانی خەیاڵ ئەنگێزی بەنگ و حەشیشە دەچێت.

لە تۆ وایە هەموو ژیان داخڵی نەشئەو خـەیاڵێكی دینـامیكی ئـەوتۆ دەبـێ كـە كۆڵەكـەكانی ئـاوەز دەلەرزێنێ و دەرگاكانی (نادیار) دەكاتەوە.

ئاراگۆن له کتێبی "جووتیاری پارسی"دا دەڵێت: "من ئەم رووداوە گەورەیە بە هەموو خەڵکی دنیا رادەگەیەنم: ئالودەییەکی دیکە هاتگەتە ئاراوە، سەریەشەیەکی دیکە بۆ مرۆڤ پەیدا بووگە، ئەویش ناوی سوریالیزمی فەرزەنی سەرسامی و تاریکییە. وەرنە ژوورەوە ئێرە سەرزەمینی هەنووکەییە... ئەو ئالوودەییەی کە ناوی دەنەین سوریالیزم دەکاتە بەکار هێنانی بێ حیساب و پڕ جۆشی بەنگی وێنەێن شاعیرانە".

لە قەڵەمڕەوی واقیعی باڵاتردا، مرۆڤ لەسەر زەمینی چەمکێن روون و مانای باوو بابەتی ئاشکرا دوور دەکەوێتەوە.

لێ ئەم دابڕانە رواڵەتییەی وێنە زەینییەکان، تەنیا لە ناو پێوەری داب و نەریتی ئێمەدا، کە بابەتەکان بە ئاراستەی (پرەنسیپی بەرژەوەندی) خانەبەندی دەکەین، بوونی هەیە، واتە بوونی دەرەکی نییە. بە پێچەوانەوە شاعیر بە زەبری هەستیاری خۆی سەرچاوە باتینییەکان دەپشکنێ و لێکچوونە واقیعییەکان دەدۆزێتەوەو جامی ئەم جیهانی سەرسامی و عەجایەبە بە سەلامەتی ئێمە هەڵدەدا.

جا لێرەدا ئێمە دەگەینە ئەو گوتەیەی ویلیام بلیک کە دەڵێ: "ئەگەر زەوق و سەلیقەی پەیامبەری و شاعیری نەبووایە، ئەوا هزری فەلسەفی و زانستی زوو بە زوو دەگەییە ئەنجام و ئاکامی هەموو شتێك و بێ جووڵە بە دیار جامێکەوە دەمایەوەو دەرەقەتی چ کارێك نە دەهات جگە لەوەی کە هەمیشە بە دەوری بازنەی یەکنەواییدا بسوڕێتەوە.

چەند کۆمەڵگەی بە شەری گۆڕاوەو شارستانیەت پێشڤەچووە، ئەوەندە هزر بەسەر یەکسەری گۆیی "بە تایبەتی یەکسەری گۆیی شیعری"دا زالتر بووە. بەلای مرۆڤی سەرەتاوە خەون ئەوزاری مەعریفەتەو شاعیران پەیامبەری واقیعن.

لەوە بەم لاوە دیوارێکی گەورە دنیای دەرەکی و دنیای ناوەکی لێکدی دابڕیوەو خەون بووەتە ئەوزاری "وسیلە" دەربڕین و نیشاندانی نەخۆشییە دەروونییەکان.

جا هەنووکە دەبێ ئەم لەمپەرە دەستکردانەی کە مرۆڤ و بوونی مرۆڤیان دابەش کردووە لابچن، و ئەرك و پەیامی ئەم کارە گەورەیە بە باوەڕی تریستان تزارا لە ئەستۆی شاعیردایە. لەبەر ئەمە دەبێ "شیعر وەکو چالاکی زەین" جێی "شیعر وەکو ئەوزاری دەربڕین" بگرێتەوە.

شاعیری راستی تەبعێکی سەرکێش و یاخی هەیە، بۆیە وێڕای ئارەزووی ئارامی و تەنایی، بە تاقی تەنیا هەوڵدەدات کە بوونی خۆی لەگەڵ هێزە نا ئەقلانییەکاندا، کە بە باوەڕی سوریالیستەکان بناغەو بونیادی تەبیعەتی واقیعی ئێمە، ئاوێتە و یەکسانی بکات، شیعر لە سنووری ئەو وشەو وێنانەی کە پێکیان هێناوە، لە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان باڵاترە.

شیعر، چارەنووسی فیکرو هزر بە هەموو بەربڵاوی و لایەنە فرەکانییەوە دیاری دەکات و رەوتی کاری هزر لەمەداری خۆیدا دەسوڕێتەوە، ئەوسا لە سنووری هزر هێوەتر دەڕوات و ئەنجام حاشا لە بوونی هزر دەکات. ئەمەیە کرۆك و ماهیەت و پەیامی شیعر لە روانگەی سوریالیزمەوە.

## سوریالیزم و شانۆ

قەڵـەمڕەوی هـیچ یـەکێك لـە هونـەرەکان بـۆ سـوریالیزم نـامۆو بێگانـە نییـە. لـە سـەرەتای هـەر داهێنانێکی تازەدا لە هەر بوارێکدا بێ، شوێنەوارێکی دەسەڵات و کاریگەریی سوریالیزم بەرچاو دەکەوێ. لە ئەنجامی ئەو قەیرانە روحییەی ئێستادا خەڵکی رۆژ بە رۆژ پتر خوو دەدەنە دیتنی نمایشێك کە ژیان بە شێوەیەکی نا ئاسایی و ناباو نیشان بدات.

## یەکێك لە رەخنەگرانی هاوچەرخ دەڵێت:

"چوون بۆ شانۆ وەکو چوون بۆ لای نەشتەرگەر یان پزیشکی ددانی لێهاتووە". چونکە ئەمڕۆ کە کاریگەری و دەسەلاتی شانۆنامە بەسەر تەمەشاڤانەوە حیرەت ئەنگێزو "بە ئازارە".

هەوەڵجار گیوم ئاپۆلینر لە ساڵی ١٩١٧ بە شانۆنامەی "مەمکەکانی تیرزیا" شێوازێکی تازەی هێنایە ناو جیهانی شانۆوە، بەو مانایەی کە حەقیقەت و راستیەکانی ژیانی رۆژانەی بە جۆرێکی هێندە روون و زەق نیشاندا کە لایەنە پێکەنیناوی و تەوس و تەنز ئامێزەکان بەوپەڕی روونییەوە لەژێر پەردەی واقعی ماددی هاتنە دەرێ و کەوتنە روو. دیمەنی عەجیب و غەریب و چاوەڕوان نەکراو بە جۆرێ دوا بە دوای یەك دەهاتن لە تۆ وایە کاراکتەرەکان ئەوەی بە زەینیاندا هاتووە و لە خەیاڵیان پەروەردە بوو بەزار دەیڵێن و پراکتیزەی دەکەن. لە وەسفی ئەم شانۆنامەیەدا بوو کە نووسەر وەکو گوتمان، وشەی سوریالیزمی بەکار هێنا.

سوریالیستەکان، بە تایبەتی ئانتونن ئارتو باوەڕیان وابوو کە گۆڕین و چاکسازی شانۆ دەبێ هەوەڵجار لە دیمەن سازییەوە دەست پێ بکات.

پیر ئالبیر بیرۆ، لە ساڵی ١٩١٨دا شانۆنامەیەکی بەناونیشانی "Le Bondieu" نووسی، قەرار بوو ئەم شانۆنامەیە لەلایەن ژمارەیەکی زۆرەوە لەسەر دوو شانۆ کە لەسەر یەك بوون نمایش بکرێ. لەسەر یەکێك لە شانۆکان، ئەکتەرەکان جۆرە دەمامکێکیان لەسەر و تەرزە جلێکیان لەبەر بوو کە رەنگدانەوەی چەمکە رەمزی و هێماییەکان بوو. بۆ نموونە پۆشاکی یەکێك لە ئەکتەرەکانی شانۆنامە کە بریتی بوو لە تابووتێکی دروستکراو لە داری رەش و لە ئاستی سەریدا دەرکەیەکی بۆ کرابوو کە دەکرایەوەو دادەخرا، ئەکتەرەکان بەدەم گۆرانییەوە هەموو پێکەوە چووبوونە نێو جبەیەکی دەڵبەوەو هەر یەکەیان سەری لە یەخەیەکی رەحەتی ئاساوە هێنابووە دەرێ، بەڵام ئەو دوو ئەکتەرەی لەم سەرو لەو سەری جبەکە وەستابوون قۆڵیشیان هەبوو. جا هەر بۆ دروستکردنی دژکاری، ئەکتەرانی شانۆی دووەم هەر جلی ئاسایی مەدەنیان لەبەر کردبوو.

ئەم جۆرە دیمەنسازیانە چەمك و ئامانجێکی قووڵتر لە نمایشی دیمەنێن سەیرو سەمەرەو عەجیب و غەریبی هەیە: مەبەستی رێنوێنی کردنی تەمەشاڤانە بەرەو "حەقیقەتی موتڵەق".

بەباوەڕی ئانتون ئارتو، شانۆ گەرەکیەتی ژیان بە هەموو لایەن و تەجەلیاتەکانییەوە نیشان بدات و کۆمەڵێك دیمەن و وێنەی ئەوتۆی لێ هەڵێنجێ کە بمانخاتە سەر هەوەسی دیتن و کەشف کردنیان. شانۆ پێویستە رەنگدانەوەی واقیع بێ، هەڵبەتە نەك ئەم واقیعە رۆژانەو راشکاوەی کە

بە تێپەڕبوونی ڕۆژو ڕۆژگار شانۆی کردووە بەلاسایی کەرەوەیەکی بێ گیانی خۆی، بەڵکو ئەو واقیعە زیندووە سەیرەی کە پرەنسیپی ژیان تیایدا وەکو ژنانی حەرەمسەرا هەر کە بە گۆشەیەکی چاو تەمەشا کرا خێرا خۆی وەژێر پەچەکەیدا بکاتەوە. بەڵام ئەم واقیعە وابەستەی ژیانی سنووورداری بەشەر نییەو مرۆڤ بە خوو خدەو نەریتو ئەخلاقیاتی تەقلیدی خۆیەوە ناتوانێ کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەسەریەوە هەبێ.

شانۆ دەبێ بینەر بۆ دنیای خەونو غەریزە "خوێنخۆریو ئەنتی مرۆڤانییەکان" بگەڕێنێتەوە. دەبێ هەستەکانی تەمەشاڤان بەرقامچیان بدات، چونکە "هەست" لە "فام" جیا نییە. دەبێ وەکو سیحربازانی کۆن، کە فرۆید بە شێوەیەکی تازە لە بواری دەرونیشکاریدا لاسایی کردونەتەوە، نەخۆشانی دەروونی ناچاری جۆرە ڕەفتارێکی تایبەتی دەرەکی بکات تا چاك ببنەوە. شەرحو شرۆڤەی هێزە سەرکوتکراوە دەروونییەکان دەبێتە باعیسی ئازادی نەخۆشو ڕزگار بوونی. دیمەنسازیش لە ڕێگەی ئەوزاری بیناییەوە "بصری" روحی تەمەشاڤان بەگیردێنێو بەرەو دنیای میتافیزیك بکێشی دەکات.

ئانتونن ئارتو هونەرێکی تازە لە دیمەن سازیدا دێنێتە ئاراوە: یانی ئەمەشاڤانان لە ناوەندی شانۆدا دادەنیشنو شانۆنامەکە لە دەورواندەوریان نمایش دەکرێ، تا بەو شێوەیە بتوانن باشتر ئاوێتەی هاماجی کارە هونەرییەکە ببن. دەنگو دەنگدانەوەو هاوارەکان بەڕێژەی ڕادەی کاریگەریان لەسەر ئەعساب بەکاردەبرێن. سوود لە هەموو جۆرە روناکییەك بەمەبەستی دروستکردنی حاڵەتێن جۆراوجۆری ڕەنگ لەسەر بەدەن وەردەگیرێ. شتەکان لەشێوەی بوکەڵەو قەرەقۆزانی وردو درشتدا نیشان دەدرێنو لە ڕێگەی دەمامکانی گەورەو مەزنەوە بەرجەستە کردنی دەرەکی بە وێنە زەینییەکان دەدەن. لە نمایشدا دەبێ "توندی کار" هەبێ، چونکە تەنیا "دڕندەییو بێڕەحمی بەکارە". شانۆ دەبێ ژیان وەکو لافاوێکی سامناك نیشان بدا کە هەرچییەکی بێتە ڕێ هەڵیکەنێو رایبماڵێ.

توندی کارو خوێن کە بخرێتەخزمەتی توندی هزرەوە، ئارەزوو و مەیلی خوێنخۆریو تاڵانکاری بینەران "دەپاڵێوێو مشتوماڵی دەدات. ئەوساکە لە دەرێی شانۆشدا توانای جەنگو تاڵانو بڕۆو کوشتو بڕ لەلای تەمەشاڤان نامێنێ. شانۆ "هێزێکی کەچڕەوی وەرچەرخانی" بێ وێنەی ئەوتۆی هەیە کە بە باوەڕی ئانتونن ئارتو، بۆ دنیای ئاسیودیتگو پەرێشانو پەشێوی ئێمە زەروریو پێویستە.

هەڵبەتە ئەم جۆرە نمایشکردنو شانۆنامەیە لە سنووری شیکردنەوەی دەروونی غەریزەو سۆزی مرۆڤانی باڵاترە چونکە شان لە شانی ئەو ژیانە ئازادە دەدات کە "فەردیەت"ی لە نێو بردووەو هاوتای دەکاتەوە.

## ئاسۆی شکست

لە ساڵی ١٩٢٩دا کە دووەمین بەیاننامەی سوریالیزم بڵاوبووەوە ئاندریە بریتون وەزعی سیاسی "حیزب"ی دیاریکردو چەند کەسێکی تری لە هاوکارانو موریدانی خۆی تڕۆ کرد. لەوانە

ئانتونن ئارتو، لەبەر ئەوەی کە لە پێناوی خۆپەرستی و خۆ هەڵکێشاندا شانۆنامەی "خەون"ی "ستریند بیرگ"ی لە حوزوری گەورە سەفیری سوئێد نیشان داوە بەر "پاکسازی و تڕۆکردن" کەوت. تەنانەت چەند کەسێك لە دامەزرێنەرانی سوریالیزم—یش وەکو فیلیپ سوپو بە گوناحی پەیرەوی کردنی "شێوە ئەدەبییەکان"و روبرد سنوس بەتۆمەتی بایەخدانی لە رادەبەدەر بە نووسینی خۆبەخۆو... بەر غەزەب کەوتن و دەرکران. لەم قۆناغەدا تەنیا ئاراگون و پول ئیلوارو پیر ئونیك لە بنی بێژنگەکەدا مانەوە.
پێشترش چەند کەسێك لە لایەنگرانی لاو کە گۆڤارێکیان بە ناوی "Huand Jeu" دەردەکردو سوریالیزمیان بە پرۆگرامی عیرفانی رامبوو ئەنجامدەری "زانستێن پەنهانی" دەزانی، ماف ئەندامییەتیان لێ سەندرابووەوە، چونکە بە باوەڕی ئاندریە بریتون، سوریالیزم پەیوەندی بە جیهانی باڵاوە نییەو کاری خۆی لەم جیهانە دونیەدا ئەنجام دەدات.
ئەندامە تڕۆ کراوەکانیش لە هەجونامەیەکدا بە ناونیشانی "لاشە" وەڵامێکی دەمشکێنی ئاندریە بریتون-یان دایەوە. بەڵام گروپێکی تازە نەفەسی شاعیرانی لاوی وەکو رینیە شار، جورج هوینەو نیگارکێشانی مەزنی مینا سلڤادۆر دالی و یوتانگی لە دەوری رێبەری قوتابخانەکە گرد بوونەوەو ئاندریە بریتون بەوپەڕی متمانەوە درێژەی بە کاری شۆڕشگێڕانەی خۆیدا ناوی گۆڤاری "شۆڕشی سوریالیست"ی گۆڕی و کردی بە (سوریالیزم لە خزمەتی شۆڕش)دا.
بەڵام ریاو نیفاقێکی تازە لە ئاسۆی سوریالیزمەوە دەرکەوت ئاراگون لە ساڵی ١٩٣١دا پاش گەڕانەوەی لە کۆنگرەی نووسەرانی سۆڤیەت، کە لە خارکوف گیرابوو، بە تەواوەتی چووە ریزی کۆمونیزمەوەو بە هەراو هەنگامەیەکی زۆرەوە دەستبەرداری قوتابخانەی سوریالیزم بوو. دوا بەدوای ئەو پیر ئونیك و جورج سادول-یش ئیستقالەیاندا. ئاندریە بریتون-ش وەك بڵێی بیەوێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لە ساڵی ١٩٣٨دا پول ئیلوارو جورج هوینەی بە تۆمەتی لایەنگری لە ئاڕمانجێن سوسیالیستی دەرکرد.
تریستان تزارا لە کتێبی " سوریالیزم و دوای جەنگ"دا هۆیەکانی هەڵوەشانەوەی ئەم قوتابخانەیە بەمجۆرە شرۆڤە دەکات: "بێ سەروبەری و پەشێویی زادەی بێ توانایی سوریالیستەکان لە پەیرەوکردنی رێبازی شۆڕشگێڕی و بێ بەرنامەییان و بایەخ دانیان بە راکێشانی هەستی زەرەرمەندی خەڵکی، بارودۆخی سوریالیزمی لە باری داهێنان و دەست پێشکەری و لە رووی باوەڕو تەرزی تێفکرین و هزرینەوە، دووچاری لاوازی کرد.
ئاراگون لە ساڵی ١٩٣٣دا "خانەی رۆشنبیری" دامەزراندو من و کرول لە ساڵی ١٩٣٤دا بووین بە ئەندامی خانەی نێوبراو. ئەم قۆناغە رێکەوتی رۆژانی سەرهەڵدانی رێبازی نازی و سووتانی "رایشتاك" بوو. هەست بەوە دەکرا کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی خەتەرو مەترسی دەبێ بەپەلەو تا زووە کارێك بکرێ. لە ساڵی ١٩٣٤دا (کۆمیتەی پارێزگاری رۆشنبیران) بە رابەرایەتی پرۆفیسۆر لانژۆن وەکو کاردانەوەیەك دژ بە جموجۆڵی فاشیستی دامەزراو لە ساڵی ١٩٣٥ کۆنگرەی نێو نەتەوەیی نووسەران بۆ بەرەڤانی لە شارستانییەت و رۆشنبیری" هاتە ئاراوە...".

لــەم ســەروبەندەدا جــەنگی نــاوخۆی ئەســپانیا دەســتی پێکــرد: خــەباتی ئــازادیخوازان‌و سـەرکوتکردنی کۆمـاریخوازان بـە دەسـتی فاشیسـتەکان، گـەلێك لـە سوریالیسـتانی وەکـو پـول ئیلوار–ی لە خەوی سوریالیستی بێدار کردەوەو خستنییە سەر ڕێگەی خەبات دژی زۆرداران‌و تێکۆشـان لـە رای رزگـاری مـرۆڤ لـە کـۆت‌و بەنـدی فاشـیزم. تریسـتان تـزارا لەهـەمان کتێبـدا دەنووسـێت: "لـە سـاڵی ١٩٣٧دا چـالاکی بـۆ کۆمـەك‌و یارمەتیـدانی کۆمـاریخوازانی ئەسـپانیا دەسـتی پێکـرد. کـۆنگرەی نێونەتـەوەیی نووسـەران لـە شـاری والـنس‌و مەدریـدی ئابلۆقـە دراودا گیرا. مەبەسـتی ئـەم کەسـانەی کـە لـە دەوری یـەکتر خڕدەبووەنـەوە ئەمـە بـوو کـە مـرۆڤ بگەیەننـە پایەیـەك کـە شایسـتەو لایـەقی ئـەو بـێ‌و چەوسـاندنەوەی مـرۆڤ لەلایـەن مرۆڤـەوە نـەهێڵن. لـە دنیایەکی ئاڵۆزکاوی پەشێواودا کە سەروەت‌و سامان تەنیا لە دەستی کەمینەیەکی دیاریکراودا بـوو شـاعیر یـان نووسـەر دەیتـوانی چ وەزع‌و هەڵوێسـتێکی هـەبێ؟... ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە شارستانیەت‌و ڕۆشـنبیری مرۆڤایـەتی لەبـەر هەڕەشـەو گوڕەشـەدا بـوو. دیـارە لـە وەزع‌و حـاڵێکی وەهـادا شـاعیر نـاتوانێ خـۆی لـە ژیـانی ڕۆژانـە دابـڕێ. شـاعیر هەمیشـە بـە تـەمای دنیایـەکی هاوئاهەنگ‌و هاوسەنگ‌و هاوکێشدایە کە مرۆڤ نەکەونـە گیـانی یەکدی‌و هێـزە مرۆڤانییـەکان پـێ بەپێی پێشکەوتن‌و دادی کۆمەڵایەتی نەش‌و نما بکەن. ئەمە بوو وەزع‌و هەڵوێستی ژمارەیـەك لـە نووســـــەرانی ریالیســـــت بەرانبـــــەر بـــــە واقیعـــــی تـــــاڵی ژیـــــان...."

بیست دانە ساڵی تەواو سوریالیستەکان‌و کۆمەنیستەکان یان شەڕیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد یان موجامەلەی یەکتریان دەکرد. هەنـدێ جار لـە هەنبـەری دژمنی هاوبەشـدا پـەیمانی دۆسـتایەتیان دەبەست‌و، دیسانەوە لەگەڵ هەڵکشان‌و داکشانی هەستێن نەتەوەیی یان نێو نەتەوەییدا لێکدی دادەبڕانـەوە. دەرکـردن‌و گەڕانـەوەو تـۆران‌و ئاشـتی‌و وێـران کـردن‌و نوێژەنکردنـەوەو بەیاننامـەو شەڕو تەفرەقەو پەیمانان‌و هەجوو جنێوان لە رادەبەدەرە.

ئاندریە بریتون هەر چەندی کردو کۆشا کە پـەیڕەوان‌و موریـدانی خـۆی لـە ڕەوتـە سیاسییەکان دوور بخاتەوە هیچی بە هیچ نەکرد. لە هـەموو شـتێ خراتـر ئـەوە بـوو دەسـتەیەك دەسـتیان دایـە خۆ کوژی‌و ژمارەیەکی زۆری دیکەش لە جەنگی جیهانی دووەمدا کوژران.

کەوتنی پاریس‌و زاڵبوونی ئاڵمانیا بەسەر فەڕەنسادا بە کردەوە ئەوەی بەم نووسـەرانە نیشـاندا کـە چیتر نـاتوانن خۆیـان بـە خـەون‌و شـێتایەتییەوە سـەر گـەرم بکـەن‌و ناچـارن کـە بـە هۆشـیاری ویستی ئاسنینەوە بچنە شەڕی دژمن. تریستان تزارا دەڵێت: "جەنگ‌و زەرورەتی خەباتی نهێنی هەموومانی لە ژێر یەك سابیتەدا کۆکردەوە. کۆنـە داداییـەکان‌و سوریالیسـتەکان‌و زۆر نووسـەری دی لە دەوری یەکتری کۆبوونەوە. لەم ساڵە ڕەشانەدا ئێمە درێژەمان بە هـزرین و نووسـیندا. ئایـا دەمـانتوانی بـە تـەرزێ بهـزرێن‌و بـە شـێوەیەکی دیکـە بنووسـین؟ ئایـا دەمـانتوانی دەسـتبەرداری داداو سوریالیزم نەبین؟ ئایا دەمانتوانی کە بوونی خۆمان بکەین بە دوو بەشەوە، واتە لەلایەکەوە لە رای وڵاتی خۆماندا بخەبتین‌و لە لایەکی ترەوە دووی موتڵەقێکی نا مەکشوف بکەوین؟".

لەوە بەدواوە پێشقەرەوڵانی سوریالیزم بوون بە سێ دەستەوە:

١- ئەوانــەی کــە ســەنگەریان لــە خەتــەرو مەترســی فاشــیزم گــرتو لــە کــاتی داگیرکردنــی فەرەنســادا دەســتیان دایــە خــەباتی نهــێنی و بــە "نووســەرانی خــەباتکار" ناوبانگیــان دەرکرد. پول ئیلوار و ئاراگۆن لە جوملەی ئەو نووسەرانە بوون.
٢- ئەوانــەی کــە خیانــەتیان لــە ئارمــانجی شۆڕشــگێڕی کــردو هونــەری خۆیــان یــا خســتە خزمەتی سەرمایەداران یان روویان کردە فاشیزم، وەکو سلڤادۆر دالی.
٣- ئەوانەی کە دەیانگوت بەرەڤانیو پاسەوانی لە سوریالیزمی رەسەن دەکەن، و لە باری سیاسییەوە پـەیڕەوی بیروبـاوەڕی تروتسـکی یـا ئاژاوەخوازیـان دەکـرد. وەکـو ئاندریـە بریتون. بە هەر حاڵ دەشێت بگوترێ کە هـەر یـەکێك لـە نووسـەرانو هونەرمەنـدانی سـەر بەم قوتابخانەیە بیروباوەڕو بۆچوونێکی تایبەتی هەبوو.

بە هەر حاڵ سوریالیزم بەرەبەرە یەکێتیی شێوازو هاوبەشی نێوەڕۆکی خۆی لە دەست دەدا.

## سوریالیزم پاش جەنگی جیهانی دووەم

هـەر کـە جـەنگی جیهـانی دووەم دەسـتی پێکـرد، سلڤادۆر دالـیو یوتـانگی بـۆ ئـەمریکا هـەڵاتن. بنجـامین پـڕە کـە تـا سـاڵی ١٩٤١ لـە پـاریس مـابووەوە، دوای ئـەوە بـۆ مەکسـیك رۆیـی. ئاندریـە بریتون-یش جلی پزیشکی لەبەر کردەوەو لەگەڵ ئاندریە ماسون رێگەی ئەمریکای گرتەبەر تا بە کەماڵی ئیسراحەتو ئازادیو سەربەستی تەواوەوە درێژە بە لێکۆڵینەوە سوریالیستەکانی خۆی بدات، و لە ساڵی ١٩٤٢دا دیباجەی سێیەمین بەیاننامەی سوریالیزمی لە نیویورك بڵاوکردەوە. لـە سـاڵی ١٩٤٦دا پـاش کۆتـایی جـەنگو بەرقـەراری ئاسـایشو تـەناهی بـۆ پـاریس گەڕایـەوەو لـە دیمانــە رۆژنامەوانییەکانیــدا نــەگۆڕی بیروباوەڕەکــانی خــۆی راگەیانــدو گــوتی: لــە قۆنــاغو سەردەمێکدا کە چەرخی کۆمەڵگە لـە ئـەنجامی هەڵکشـانی تـەماحو ئـارەزووی مادیـدا لـە تـەوەری خۆی دەرچووە، پتر لە جاران هەست بە زەرورەتی گەڕان بە دووی ئارمانجو مەراماندا دەکرێ، لـە سـەردەمی تەقینـەوەی ئەتۆمـدا پێویسـتە لەسـەر مـرۆڤ دژی چـەمکێن دروسـتکراوو قـاڵبگرتوو راپەڕێو هەموو توانای خۆی بۆ بەرقەراری "سەردەمێکی تازە"ی دیکە بخاتە گەڕ.

هێشـتا ماوەیـەك بەسـەر کۆتـایی جەنگدا تێنەپـەڕی بـوو کـە بڵاوبوونـەوەی رۆمانـەکانی "ژولـین گراك"و شیعرەکانی "ژاك پریڤێر" دیسان نـاوی ئـەم قوتابخانەیـەی خسـتەوە سـەر زارانو ئـەوەی نیشاندا کە هێشتا سوریالیزم لە دڵاندا گەشەو دەگرێو بە پێچەوانەی تەسەوری گشتییەوە، بە تایبەتی مێژوونووسانی ئـەدەبیو رۆشـنبیری، جـەنگی جیهـانی نەیکوشـتووە. لە سـاڵی ١٩٤٧دا پیشانگایەکی تازە بۆ بەرهەمێن سوریالیستەکان لە فەرەنساو ئەمریکادا کرایەوەو سەلماندی کە هێـزێن تـازەو بـەهرەێن نەپشـکوتوو لـە هـەناوی سـوریالیزمدا هەیـە. ئەگـەر چـی ئاندریـە بریتـون هەموو کۆنـە پـەیڕەوکارەکانی خـۆی لـە دەسـت دابـوو، بـەڵام کۆمـەڵێك موریـدی لاو وەکـو پەروانـە دەوری مۆمی بوونیانداو سەر لە نوێ کوانگی سوریالیزمیان گەرم کرد.

ئاندریـە بریتـون، لـە سـەفەرێکیدا کـە لـە کـاتی جەنگدا بـۆ ئـەمریکاو دورگـەکانی ئانتیـل کـرد، بـە زەبـری قەلەمـە بـە بڕشـتەکەیو بـە کۆمـەکی بنجـامین پـڕە لەوبـەری گـۆی زەویـدا گـەلێك کـوانگی

هەڵایساوی بۆ قوتابخانەکەی خۆی دامەزراند بوو. دەستەیەك لەم تازە کورانە لەگەڵ پێشەوای مەزەبەکەی خۆیاندا بۆ ئەوروپا هاتن و بوونە مایەی خڕبوونەوەی شاعیرانی لاو.

ئاندریە بریتون دووبارە شان و شەوکەتی پەیداکرەوەو بە بەردەوامی کۆڕی سوریالیستی لە چایخانەی ((Cafedes Deux Magots))دا بە بەشداری هونەرمەندانی تازەخواز، کە دەتگوت بەشێوەیەکی بنجبڕش لێبڕابوون ملکەچی فەرمانی دەسەڵاتی مەعنەوی و شۆڕەتی "پاپ ئاسایی" مامۆستاکەیان بن، دەگێڕا. چەند گۆڤارێکیان دەرکرد کە بەناوبانگترینیان نێوی "چواربا" بوو. ئەم گۆڤارە لە ژمارە چوارەوە تا ژمارە حەوت کۆمەڵێك نموونەی لە بەرهەمی ئەم تاقمە تازە نەفەسە بڵاوکردەوەو مژدەی سەرهەڵدانی قوتابخانەی " سوریالیزمی نوێ"ی راگەیاند!.

بە هەر حاڵ ئەم قوتابخانە تازەیەش چەند لق و باڵێکی جیاوازی لێ بووەوە (لەوانە: باڵی چەپ کە " سوریالیزمی شۆڕشگێڕی" پێ دەگوترا) بەڵام دەسەڵات و کاریگەری گەیشتە وڵاتانی رۆمانیاو میسریش.

بەم شێوەیە، ئەم راپەڕینە هزری و مەعنەوییە، کە بەڕای هەندێ لە شارەزایان و رۆشنبیران لە توێی لاپەڕەکانی مێژووی رابردوودا نێژرابوو، سەر لە نوێ کەوتەوە جم و جۆڵ و چەلەنگی و لە هەنبەر فەلسەفەی ئەگزیستانسیالیزم و مارکسیسزمدا هەڵوێستی بەرەڤانی تازەی بەدەست هێنا.

## چۆن دەربارەی دادایزم و سوریالیزم داوەری بکەین

خەڵکانێکی زۆرو تەنانەت جماعەتێك لە ئەدیبان و شارەزایانی سوریالیزم، بە زادەی پەرۆشی نوێئاوەری یا کەچڕەوی هزرو زەوق و سەلیقە یا شۆخی و سوعبەتی هونەرمەندانێك دەزانن کەدەیانەوێ بە هەر هۆیەکەوە بووە ببنە مایەی سەرنج و سەرسامی عەوامی خەڵکی. هەڵبەتە بە ئاسانی دەتوانرێ بەرپەرچی ئەو تازە خوازانە بدرێتەوە کە لە بازنەی خورافات و خەیاڵاتی کۆن دەرچوون، چونکە دەرك کردنی هونەری نوێ و مەرام خوازی "بەپێچەوانەی داب و نەریتی باوەوە" پێویستی بە هەوڵ و کۆششی فراوانە، پابەندی بە داب و نەریت و عادەتەوە لەلایەك و دەستدانە خەبات بە شێوەێن نوێ لەلایەکی ترەوە رەسمێکی دێرینە کە لە تەبیعەتی ئاسانخوازو ئیسراحەتخوازو تەمەڵی مرۆڤەوە هەڵدەقووڵێ.

ماهیەت و کرۆکی دادایزم لەگەڵ هیچ جۆرە یاسایەکی ریزبەندی و خانەبەندی هونەرو جوانیناسیدا نایەتەوە. چونکە ئەم یاخی و سەرکێشانە لە رادەبەدەر باوەڕیان بە پووچی کاروبارەکانی جیهانە. بۆ هەڵاتن و رزگاری لەم پووچییە لە هەوەڵەوە تا کۆتایی هەموو سونەت و دابە کۆنەکان دەکەنە قوربانی هەوەسبازییەکانی خۆیان و پێشێلی دەکەن، بەڵام هیچ باوەڕێکی تازەی مکومی لە جێگە دانانەن. جا عەوامی ئەو خەڵکەی کە دەیانویست رەفتارو ئەتواری ئەمانە بەپێوەری هونەری هەڵسەنگێنن، هەر کە لە کۆڕێکی دادایید‌ا تریستان تزارا لە جیاتی بەیاننامەی دادایزم دەستی بە خوێندنەوەی وتارێکی ناو رۆژنامەیەك کردو لە هەمان کاتدا پول ئیلوار کەوتە زەنگوڵە لێدان، خەڵکەکە سەبریان سواو کار گەییە شەڕە جنێوو پێکاکێشان. بەلای

داداییەکانەوە هەر جۆرە پێوەرێکی بەها بێ مانایە، هەر جۆرە جیاوازیکردنێك لە بەینی ئەوەی پێویستە بکرێو ئەوەی نابێ بکرێ، لە بەینی ئەوەی پێویستە بگوترێو ئەوەی نابێ بگوترێ نایەتە پەسندکردن. تەنیا ئەوەندە بەسە کە هەرچییەك بە هزرا بێت پراکتیزە بکرێ. بە ئانقەست دەیانویستکارێك بکەن کە سەرمایەداران رقیان لێ هەڵبگرن و دژمنایەتیان بکەن. بەڵام ئەم کارەی کە دەیانکرد نەك هەر سەرمایەداران، بەڵکو خودی ئەم هونەرمەندە لاوانەشی لە هونەرو ئەدەبیات دەبێزاراندو دەتاراند.

بەڵام ئارمانج و مەرامی سوریالیزم لە سنووری ئەدەبیات و هونەر هێوەترە، چونکە دەیەوێ مرۆڤ لە کۆت و بەندی شارستانیەتی بەرژەوەند پەروەری ئێستا رزگار بکات. جا بۆ جوڵاندن و بێدارکردنەوەی مرۆڤ، دەبوایە لە دەرگای وێرانکردنەوە وەژوور بکەوێو رەوتی کاروانی هزرین لە گرتنەبەری رێگە کۆنەکان لابدات، ئەوە بوو کە ئاگایانە هۆش و ئاوەزی وەلاوەناو رووی کردە سەرچاوەی لێوان لێوی هێزە پەنهان و سەرمۆرەکانی بوونی مرۆڤ تا شەپۆلانی سێلاو ئاسای دەروونی بەرەو ئاسۆ روون و کراوەکان بیبات و ئاراستەی بکات.

یەکەم کاری سوریالیزم بەدەست هێنانی ئەم هێزە نەدیارو نەزانراوانە بوو. بەمجۆرە، بەپێی گوتەی ئاندریە بریتون. سوریالیزم لە روانگەی فەلسەفییەوە پشت بە باوەڕ بە واقیعی بالاتر دەبەستێت کە لە ئەنجامی تەداعی ماناکانی زەینەوە دێتە دیو هەروەها پشت بە باوەڕ بە توانای بێ کۆتایی خەونان دەبەستێت کە لە ئەنجامی گەمەی (بێ سوود)ی هزرینەوە دێتە دی. پشت بەستن بە "ئوتۆماتیکیەتی مێشك" توانای ئەوەمان دەداتێ کە تا سنووری قەڵەمڕەوی غەریزەو مەیل و ئارەزووە سەرکوتکراوەکان –کە دەکاتە هەمان قەڵەمڕەوی واقیعی بالاتر– بە قووڵایی زەیندا رۆبچین. بەڵام چونکە باشترین ئەوزاری دەربڕینی حاڵەتە سایکۆلۆجیەکان، هونەرە بۆیە هەموو کەس ناچارە بەرهەمێن سوریالیستی تەنیا لەلایەنی هونەری و جوانییەوە تاوتوێ بکات و هەڵبسەنگێنێ. لە حاڵێکدا ئەم بەرهەمانە تەنیا دیمەنێکی کەسایەتی سایکۆلۆژی هونەرمەندەو هیچی دیکە. رێبەری سوریالیزم بەردەوام شاعیران و هونەرمەندان دڵنیا دەکات کە دەبێ پاش چوونە ناو قووڵایی دەریای خەیاڵ دووبار بێنەوە سەر ئاوەکە، تا بتوانن لە ژیانی رۆژانەدا سوود لەو دوڕو گەوهەرانە ببینن کە وەدەستیان هێناون. هەڵبەتە سوریالیستەکان سوودێکی زۆریان لە دۆزینەوە سایکۆلۆژییەکانی فرۆید وەرگرتووەو بەرهەمەکانی ئاندریە بریتون ئەوە نیشان دەدەن کە گەلێك لەو رووداوانەی کە پەیوەندییان بە بەخت و رێکەوت و شوومی و نەحسییەوە هەیە، تەنیاو تەنیا زادەی غەریزە سەرکوتکراوەکانی خۆمان و ئەنجامی کۆت و بەندی تەنگەتاوکردنی کۆمەڵایەتییە. جا لێرەدا "واقیعی بالاتر" لە "واقیعی ژیان" نزیك دەبێتەوەو دنیای خەیاڵ ئاوێتە بە دنیای عەیان دەبێ.

ئەگەرچی دەرونیشکاری فرۆید بووە بەسەرچاوەی ئاراستەکردن و دەوڵەمەندکردنی ئەزموونێن سوریالیستەکان بەڵام ئەمانیش واتە گروپی سوریالیستەکان یارمەتیەکی شایستەی پەرەسەندن و خەمڵینی فرۆیدیەتیان داوە: هەر سەلماندن و قەرساندنی زەخیرە

سایكۆلۆژییەكانی مرۆڤ بەس نییە، بەڵكو دەبێ لە كاروباری ژیانیشدا سوودی لێ وەربگیرێو پراكتیزە بكرێ.
بەم پێیە، سوریالیستەكان نەك هەر پەنایان بۆ "بورجی عاج" نەبردووە، بەڵكو كار بۆ ئەوە دەكەن كە بەگۆڕینی ژیانی بەشەر، بورجە عاجییەكان-یش ویران بكەن تا قوربانیانی ژیان لە واقیع هەڵنەیەنو بیكەن بە مەیدانی هاتنەدی ئارەزووە زۆرو زەبەندەكانیان.
ڕێبازی سوریالیزم وەكو چون چالاكییەكانی خۆی بە دژایەتیكردنی "هونەر بۆ هونەر" دەست پێكرد، بە هەمان شێوەش هەر ڕێبازێك لەسەر بنەمای (شۆڕش بۆ شۆڕش) ڕۆنرابێ ڕەفز دەكاتەوە. كەواتە ئەو كەسانەی كە ئەم ڕێبازە بە لایەنگری ئەو دوو پرەنسیپە بژمێرن بە هەڵەدا دەچنو لە ئاڕمانجی سەرەكی سوریالیزم غافڵو بێ ئاگان.
لەگەڵ هەموو ئەمەشدا لەو كاتانەدا كە "لاشعور" ئامادەی بەخشینی "ئیلهام" نەبووبێ، شاعیرانی سوریالیست دەستبەرداری كار نەبوونەو لە ئەنجامدا بەروبومی نووسینی خۆبەخۆ هەموو كاتێك هەر باش دەرنەچووە. بەڕای ئەوان شاعیر كەسێكە كە باشتر لە خەڵكانی دیكە بتوانێ سوود لە "نهێنییەكانی كانگەی دڵو مێشكی" وەربگرێو بە جۆرێ هەڵیانجێنێ كە كار لە ناخی خوێنەر بكاتو خوێنەر بە توندی بجوڵێنێ تا ئەم جوڵانە توندە ببێتە مایەی كەشفی دنیای ناخو كرانەوەی رازی گەورەی داهێنانەكەی.
بەم پێیە دەكرێت ئاڕمانجی سوریالیزم لەیەك رستەدا كورت بكرێتەوە: هەوڵی بێوچان بۆ بەزاندنی جیهانی پەراگەندەو پارچە پارچەی ئاوەزو، گەیشتن بە واقیعی موتڵەق، بریتون دەیگوت: "دڵنیام كە لە ئایندەدا، ئەم دوو حاڵەتە بەڕواڵەت دژە، واتە خەونو واقیع، لە تەرزە واقیعێكدا كە هەمان واقیعی باڵایە تێكەڵو ئاوێتە دەبن."
بۆ گەیشتن بەم واقیعە باڵایە، دەبێ زەین لە ژەنگی هەر جۆرە ڕێساو یاساو قەراردادو مەبەستێك پاك بكرێتەوەو بگەڕێنرێتەوە سەر حاڵەتی "ژیانی راستەوخۆ"و "فەیەزانی خۆبەخۆ". جا بەم پێیەو لەبەر ئەمە سوریالیزم "چارەسەرێكی تایبەتییە بۆ مەسەلەی ژیان"و لەم ڕووەوە دەتوانرێ بە جۆرە زانستێكی ئەخلاقی بژمێردرێ، بەڵام زانستێك كە ڕێگەی ژیانی ئاڵۆزی واقیعی نیشان دەدات نەك ڕێگەی ژیانی ساختەو وەهمی. هەروەها دانەری كۆمەڵە پرنسیپێكی تایبەتییە لە بواری زانستی جوانیناسیدا، كە كۆڵەكەكانی هونەرو ئەدەبیاتو زمانی باوی لەقاندووە.
بەلای سوریالیزمەوە تەنیا یەك ((جوانی)) هەیە ئەویش ((جوانی لەرزانە)): ئەم جوانیە زادەی ئۆتۆماتیكیەتكاری و لافاوێكی زەینییە كە بۆ حاڵەتە پەراگەندە و پەرێشانە سەرەتاییەكەی گەڕابێتەوە، بەو مەرجەی كە لە هەوەڵەوە هەر جۆرە "هزرێكی پێشوەختە"و "سنعەتی نەزمو قافیە"و "هزرینی هونەریو ئەخلاقی" لە لاپەڕەی زەین بسڕدرێتەوە. بەمجۆرە سوریالیزم ئارەزوو حەزە بەرزەكانی ڕۆمانتیزمو مالارمیەو رامبۆ دەگەیەنێتە باڵاترین پلەی تەجەلی: یانی بە مەدەدی شیعر، ڕێگەیەكی پڕ پێچو پەنا بۆ ناسینی میتافیزیكاو زانستی ئەخلاق دێنێتە ئاراوەو بە ئەوزاری فاكتەری "گۆڕینی ژیانی" دەزانێت.

بەم حاڵەشەوە پێویستە ئەوە بگوترێ کە سوریالیزم ژیانی نەگۆڕیوە: ئەمە جگە لەوەی کە ناتوانرێ ئەو جۆرە ئومێدە لە شیعر بکرێ. بەلای زۆر کەس لە پەیڕەوکارانی ئەم قوتابخانەیەوە، شیعر هەنگاونانێکی ساحیرانەی بێ بەرە کە بەکاری جەستە دێ نەك گیانو، تایبەتە بە بوونی فەردی شاعیرەوە. تەنانەت تەنزیش کە بە باوەڕی سوریالیزمو رۆمانتیزم، رەخنەیەکە کە مرۆڤ لە دەستی ژیانی واقیع رزگار دەکات، بەرەبەرە قاڵبی رەخنە لە شیعری وەرگرتووەو کەوتۆتە گاڵتەپێکردنی.

لەوەیە سوریالیزم تەنیا سەرنجی ژمارەیەکی زۆر کەمی خوێنەرانی بەلای خۆیدا راکێشابێ. عەوامی خەڵکی، بەشێوەیەکی گشتی موریدانی ئەم قوتابخانەیە بە کەسانی دەغەڵبازو فشەکەرو جنێوفرۆش دەزانن، کە گاڵتەبازیو تیرو توانجیان کردگە بە پیشەو فێری چاوەشی بوون تا تۆڵەی خۆیان لە وردو درشت، لە گەورەو بچووك بسێنن. لەگەڵ ئەمەشدا هەمان گروپی دژ-ش، تەنانەت لە کاروباری ئاسایی ژیاندا، بەشێوەیەکی نائاگا کەوتوونەتە ژێر کاریگەریو دەسەڵاتی راوبۆچوونی ئەم قوتابخانەیەوە. ئێستا ناتوانێ شیعرو رۆمانی زۆر ئاقڵانە یا فیلمی عەوام پەسندو عامیانە یان ئاگاداری سواوی قەد دیواران یان دروشمێن پڕجۆشو خرۆشی حیزبی بێنێتە بەرچاو بێ ئەوەی بەشێك لە رەگەزانی نا مەنتیقی، کە مایەی رەزامەندی نا راستەوخۆی ئێمەیە، تێ نەکەوتبێ.

ئەوەندە هەیە کە ئەگەر سوریالیزم لە جیهانی هونەردا سەری هەڵنەدا بووایە، ئەوا سەدەی بیستەم لە رازو نهێنییەکی شاعیرانە بێ ئاگاو غافڵ دەبوو.

## سوریالیزم لە وڵاتانی دیکەدا

سوریالیزم بزووتنەوەیەکە کە لە شیعرو هونەری فەرەنسادا سەری هەڵداو پایەو بناغەکەی بە تەواوەتی بەندە بەزەوقی فەرەنسییەوە. ئەگەرچی دەشێت فوتوریزمی ئیتاڵیایی لە باری پشکنینی قوڵایی زەین و هەوڵدان بۆ نوێئاوەری یەوە لەگەڵ سوریالیزمدا بەراورد بکرێ، بەڵام لایەنی جیاوازی نێوانیان لەوە زیاترە کە بچووکترین هاوبەشی شێوازو یەکێتیی نێوەڕۆك لە نێوان ئەم دوو رێبازەدا چێ ببێ. لە ئەڵمانیا و روسیاو ئەسپانیادا، بەر لە فەرەنسا بە هیچ جۆرێ هەواڵێ سوریالیزم نەبووە. تەنیا قوتابخانەی (( پوئیتزم )) کە زووتر لە (بەیاننامەی سوریالیزمی) بریتون لە چیکۆسلوڤاکیا هاتە ئاراوە، تاڕادەیەك لە سوریالیزمی فەرەنسا لە پێشترە. ئەم قوتابخانەیە شیعر بە (( شۆخی هەست یان چەمکان یا بە ئەڵقەیەکی فیلمی مەستان یان چرای جادوو)) دەزانێ کە ((لە جیهانی شێتایەتی موقەدەسی خواستنان"دا سەرگەرمە، لەبەر ئەمە لە بری ئەوەی کە ئەم رێبازە بە پێشەنگو پێشڕەوی سوریالیزمی فەرەنسا بژمێرین، دەبێ بە مریدی ئیماژیزمی ئینگلیزو ئەمریکاو درێژەدەری شێوازی ئاپولینر-ی حەساو بکەین.

بە هەر حاڵ راوبۆچوونانی سوریالیزم بەلەز لە چوار دیواری فەڕەنسا وەدەرکەوتو لە هەر چوارنکالی جیهاندا جێپێیەکی بۆ خۆی کردەوە. لە ساڵی ١٩٣٦دا پیشانگای بەرهەمێن سوریالیستەکان لە لەندەن کرایەوە. ئاندریە بریتون سەفەری بۆ وڵاتانی ئەوروپای ناوەندیو

تەنانەت بۆ دورگەكانی قەناری لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا كرد تا لە ڕێگەی بانگەشەو وتاردانەوە ڕەواج بەبیرو باوەڕەكانی خۆی بدات، لە ساڵی ١٩٣٨دا لە پاریس پیشانگایەكی نێونەتەوەیی سوریالیزم كرایەوەو چواردە ولاتی جیهان بەشدارییان تێدا كرد لە وانە: ئینگلیستان و بەلچیكاو ئەسپانیاو سویسراو چیكوسلوفاكیاو یۆگسلافیاو ئاڵمان و ئەفریقاو ژاپۆن و مەكزیك و بەرازیل و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا. لە ساڵە خوێناوییەكانی ١٩٣٩- ١٩٤٥دا مەڵبەندی سوریالیزم لەگەڵ خودی ئاندریە بریتون گواستییەوە بۆ دوڕگەكانی ئانتیل و هایتی و نیمچە دوڕگەی فلۆریداو پاش جەنگ دووبارە بۆ پاریس گەڕایەوە.

## لە ئینگلیستاندا

لە ئینگلیستاندا شاعیرێكی گەورە بەناوی دەیڤید گاسكوین لە ساڵی ١٩٣٥دا سوریالیزمی فەرەنسا كەشف دەكات و كتێبێك بەناونیشانی "دنیای هێمایان" كە لە راستیدا یەكەمین بەرهەمی سوریالیستی ئینگلیزە بڵاودەكاتەوە. سوریالیزمی ئینگلیستان پەرچەكردارێكە بەرانبەر بە شیعری ریالیستی و كۆمەڵایەتی "ئودون"و "مەك نیس"و "سپندەر". یەكێك لە ناودارترین شاعیرانی ئینگلیزی نیوەی یەكەمی سەدەی بیستەم بەناوی "دیلان توماس ١٩١٤- ١٩٥٣" لە سەرەتادا بە پەیڕەوی لە سوریالیزم هونەرمەندانی هاندەدا كە خۆ بە سەرچاوە دەروونییەكانی مرۆڤدا بكەن، باوەڕی وایە كە "شیعر بزووتنەوەیەكی كێشدارو بە ناچاری حیكائییە كە مرۆڤ لە كوێری پەردەپۆشەوە بەرەو بینایی رووت رێنوێنی دەكات". دەڵێت: "من لە دەرێی پێكادانی ناچاری وێنەێن زەینی هەوڵدەدەم ئەم ئاشتی و ئارامییە كاتییە كە شیعرە بێنمە ئاراوە". ئالێرەدایە كە ئەم شاعیرە لە سوریالیزم جیا دەبێتەوە. دوا شیعری ئەم شاعیرە كە باسی رەنج و ئازاری مرۆڤ دەكات و لە شیعرەكانی سەرەتای، كەمتر پابەندی مەستی وشەو خواستنانە "استعارات" دەربارەی "شكۆداری مرۆڤدۆستی و ستایشی پەروەردگار" هۆنراوەتەوە.

## لە ئەسپانیاندا

لە هەوەڵەوە ئاوێتەیەك لە فوتوریزم و دادایزم و سوریالیزم لەگەڵ دوو ناوی تازەدا دێتە مەیدان: یەكەم قوتابخانەی "ئولترائیزم" لە ساڵی ١٩١٩، و دووەم قوتابخانەی "كریاسیونیزم" لە ساڵی ١٩٢٥. ئولترائیزم، كە ناودارترین شاعیری "گیرمودو تور"ی ناوە رایدەگەیەنێ كە شیعر پەیوەندی بە رابردووەوە نییە. كریاسیونیزم بە رابەرایەتی شاعیرێكی خەڵكی شیلی بە ناوی ڤینستە هویدوبرو، كە لە قوتابخانە توندڕەوەكانی پاریس پەروەردە بوو بوو، و هەندێ شیعریشی بە زمانی فەرەنسی گوتووە، دەیەوێ "بە جۆرێ شیعر بئافەرێنێ وەكو چۆن سروشت درەخت دەئافەرێنێ".

جیرالدو دیگو كە لایەنگری قوتابخانەی كریاسیونیزمە شیعری تەژی هەستێن لیریكی و وێنەێن سوریالیستی دەڵێت و جارجاریش دەگەڕێتەوە سەر شێوازی كۆنی شیعری ئەسپانیایی.

شاعیرێکی دیکەی ئەسپانیایی کە پەروەردەی ئەم قوتابخانەیەیە ناوی "پیدرۆسالیناس"ـە، لەهەوەڵەوە بە پەیڕەوی لە پول ڤالیری کۆمەڵێك شیعری مکومو بتەوو ئاڵۆز دەڵێت، پاشان بەرەو کەشفی لایەنە پەنهانەکانی زەین دەڕواتو دنیا بە کۆمەڵە فۆرمو چەمکێکی پەراگەندە دەزانێ. بەڵام گەورەترین شاعیری سوریالیستی ئەم وڵاتە فیدریگوگارسیا لۆرکا ١٨٩٩- ١٩٣٦ی شەهیدی ڕێگەی ئازادیو جەنگی ناوخۆی ئەسپانیایە.

ئەم شاعیرە هەوەڵجار بە شێوەی ئولترائیزم چەند پارچە شیعرێکی کۆکو جوان دەنووسێتو پاشان بە کتێبی "شاعیر لەنیویورك" بە تەواوەتی ڕوو دەکاتە سوریالیزم... هەڵبەتە شاعیر هاتووە پەنای وەبەر گۆرانی و چیرۆكو هەڵبەستێن فۆلکلۆری بردووەو لە قاڵبێکی هونەریو شاعیرانەی خەیاڵ ئامێزی پڕ داهێناندا دای ڕشتووە.

لۆرکا هەم شاعیرو هەم مۆسیقازانو هەم نیگارکێشو هەم شانۆنامەنووسو هەمو وتاربێژێکی بە تواناو بەدەسەڵات بووە، بەڵام هاو عەسرەکانی بە دوا شاعیری حەماسەی ئەسپانیای دەزانن. ڕۆوفائیل ئالبیرتی-ش شاعیرێکی سوریالیستی دیکەی ئەم وڵاتەیە کە ئەویش وەکو لۆرکا چیرۆکی فۆلکلۆری لە شیعردا تەوزیف دەکرد. ناودارترین بەرهەمی ئەم شاعیرە بەیتی "شاعیر لە کۆڵان"دایە کە باوەڕێن سوریالیستی و کۆمۆنیستی و ڕۆمانتیکی ئەو نیشاندەدات. دوا کۆمەڵە شیعری ئەم شاعیرە کۆ شیعری " لە نێوان دەریا"دا دڵە خورپێی مرۆڤی هاوچەرخ، کەبەردەوام لەگەڵ بیرەوەریو خەونو کاروباری ڕۆژانەی ژیاندا لە زۆراندایە، نیشان دەدات. ڤیسنتە ئەلکساندەرو لویس سیرنودا-ش لە شاعیرە سوریالیستە ناودارەکانی ئەسپانیان.

## لە یۆناندا

ئیمبیریکوس یەکەم شاعیر بوو کە لە ساڵی ١٩٣٥دا سوریالیزمی بردە ناو ئەو وڵاتە. پاش جەنگی جیهانی دووەم، سوریالیزم بە تەرزێکی سەیرو عەجیب دێتە ناو شیعری یۆنانییەوە. شاعیرانی گەورەی مینا ئیلیتیس و گاتسوس پەروەردەی دەستی ئەم قوتابخانەیەن.

## لە سوئێدا

یەکەمجار ئارتور لوند کوڤیست، بەرهەمی شاعیرانی سوریالیستی فەرەنساوی وەردەگێڕێتە سەر زمانی سوێدیو بەم شێوەیە ئەم قوتابخانە تازەیە بە هاووڵاتیانی خۆی دەناسێنێ. گەورەترین شاعیری سوریالیستی سوێدی گوناراکلوف"ـە، کە وێڕای ناڕەزایی خۆی، بە پەیڕەوکاری ئەم قوتابخانەیەی دەژمێرن.

## لە چیکۆسلۆڤاکیادا

ڤیتسلاڤ نیزڤال-ی گەورەترین شاعیری چیکۆسلۆڤاکی لە ریزی پێشەوەی ئەو کەسانەیە کە لە ئەنجامی کاریگەری سوریالیزمی فەرەنساوە کەوتە گەڕان بە دووی فۆرمو قاڵبی تازەی شیعراو

جڵەوی شیعری بە دەستی وەهەم و خەیاڵاتی زەین دەسپارد. ڕەوت و کاروانی گۆڕانی شاعیرانەی نیزڤال لە هەندێ ڕووەوە لە ئاراگۆن و ئیلوارو تزارا دەچێت: یانی شاعیر پاش پەیڕەو کردنی شێوازی ئاپولینر دەکەوێتە سەر ڕێگەی شۆڕش و لە شۆڕشەوە دەگاتە ریالیزمی کۆمەڵایەتی. ئەم شاعیرە لە دوا بەیتی خۆیدا کە بە ناونیشانی "ئاوازی گوندەکەی من"ـە، وێنەی جیهانی کۆن و ئاسۆی دنیای ئایندە وێنە دەگرێت و پاشان ڕوو لە "وەچەی پیری دڵ بە تاڵ" واتا وەچەیەك کە "عاشقی بریق و باق و ڕواڵەتبازی" بوو و "باری گرانی دوو جەنگی خوێناوی بەسەر شانەوە" بوو، دەڵێت: "ئێستا دەتوانی بۆ خۆت بگری کە یادگاری سەدەکانی تۆ هەرەسی هێناوە و دنیایەکی تازە گەرەکیەتێ لە نێو دارو پەردووەکانییەوە سەر دەربێنێ".

هێشتا زۆر زووە کە بتوانرێ کاریگەری سوریالیزم لە ئەدەبیاتی هەموو وڵاتاندا بە شێوەیەکی بنجبڕو دڵنیا نیشان بدرێ. چونکە بێدەنگی پاسەوانانی ئەدەبیاتی کۆن توانای ئەم کارەمان پێ نادات. بەڵام نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە هیچ وڵاتێك نییە لە کاریگەریو دەسەڵاتی سوریالیزم دوور بووبێ. شاعیران و هونەرمەندانی گەورەی وەك ئەلبێرتوساڤینۆ-ی ئیتاڵی و گۆستاف مونچی دانیمارکی، و لون باربو-ی ڕۆمانی و تیبوردیریی ڕۆماننووسی مەجەڕی بە پەیڕەوکارانی ئەم قوتابخانەیە دەژمێردرێن. تەنانەت لە میسریشدا، پاش جەنگی جیهانی دووەم، گۆڤارێك بە ناوی (La part dusale) کە تایبەت بوو بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمێن سوریالیستەکان، بە زمانی فەرەنسی لە قاهیرە بڵاودەبووەوە.

**پەراوێز:**

١- جەنگی مەراکیش:

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، هێزەکانی فەرەنساو ئەسپانیا، بە هەنجەتی دامرکاندنەوەی شۆڕشی ناوخۆ، پەلاماری مەراکشیان داو لە ساڵی ١٩١٢ ئەم وڵاتەیان کرد بە دوو هەرێمی سایەنشینی فەرەنساو ئەسپانیا. لێ لە ساڵی ١٩٢٤دا یەکێك لەسەر خێڵەکانی مەراکش بە نێوی عەبدولکەریم لە هەنبەر لەشکریانی بێگانەدا هەستاو تا ساڵی ١٩٢٦ دلێرانە جەنگی و ئاقیبەت بە هۆی نەبوونی هێزی تەواوەوە، تەسلیمی فەرەنسییەکان بوو و ئیدی مەراکش دووچاری توندترین سەرکوت و نەگبەتی بوو.

# چاوخشانێك بە ئەدەبیاتی هاوچەرخدا

هەر توێژەرێك بیەوێ ڕەوت و كاروانی ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئەوروپا، بە تایبەتی ئەدەبیاتی پاش جەنگی جیهانی دووەم بخاتە بەر باس و لێكۆڵینەوەوە، بێگومان ڕووبەڕووی گیروگرفتانی گەورە دەبێتەوە. چونكە یەكەم هێشتا "چاك"و "خراپ" لێكدی جیا نەبوونەتەوە، و عەیاری ڕاستەقینەی دوا بەرهەمەكان لە مەحەكی تەجروبەی زەمان نەدراون. مێژوونووسانی ئەدەبی هێشتا لە نێوان دوو دڵی بڵاوبوونەوەی پێڕستی نووسینی نووسەرانی زیندوو ڕاگەیاندنی زەوق و هەڵبژاردنی شەخسی خۆیاندا تیا ماون و ئەمەش مایەی سەرسامی نییە: چونكە لە هەر قۆناغێكی مێژووی ئەدەبدا شەیدا بوونی زەوقی زەمان یان بە پێچەوانەوە ڕوو وەرگێڕان لە هەر جۆرە تازەخوازی و نوێئاوەرییەك سێبەری گومڕایی خستووەتە سەر بایەخی ڕاستەقینەی بەرهەمی هونەری ئەو قۆناغە.

زەمان ئێمە كە بەدەست مینگەمینگ و دوو دڵییەوە هەراسانە، بەوپەڕی خێراییەوە سەر لە ئاستانەی بەرهەمانێك دەسوێ كە لەواری دەربڕینی مانادا، قاڵب و فۆرمی نوێ و بیدعەتی سەیریان هێناوەتە ئاراوەو بانگەوازی "بلیمەتی" دەكات. جا هەر بەمەوە نەوەستاوە بەڵكو پێی وایە كە ئەدەبیات بە چەمك و مانا كۆنەكەی قسەی بەلاش و دراوی قەڵبە. لەبەر ئەوە بانگەشە بۆ بەرهەمێك دەكات كە لە ڕووی بونیادەوە فشەڵە. لە ڕووی ناوەڕۆكەوە ناپوختەیەو لە ڕووی قاڵبەوە نەك هەر نەمەییوە بەڵكو شێوەو فۆرمە سەرتاتییەكەی خۆی نەبەزاندووە، بەناوی "ڕاستگۆیی"و "ئەزموونی ژیان"ەوە چاو لە نا هونەرییەتی ئەو جۆرە بەرهەمانە دەپۆشێت.

وێڕای ئەمەش سەدەی ئێمە هیچی لە سەدەكانی ڕابردوو كەم نییە. "ئەم سەدەیەی كە ئێمە تیایدا دەژین گۆڕانی گەورەو قووڵی لە هەموو بوارە هونەرییەكاندا، بە خۆوە دیتووە. شیعری نوێ و مۆسیقای نوێ و نیگاركێشی نوێ هاتۆتە ئاراوەو ئاسۆی تازە لەبەردەم هونەردۆستاندا ڤەبووە.

ئەو كەسانەی كە ڕووبەڕووی هونەری نوێ دەبنەوە، بە زۆری پێی نا قاییل دەبن و هەندێكی دیكەش بێ بیركردنەوەو لێكدانەوە داوەری و قەزاوەت دەكەن و هونەری نوێ بەشتێكی كرێت و ناپەسند لە قەڵەم دەدەن و دەگەڕێنەوە سەر نەریتە كۆنەكانی خۆیان و زیاتر پابەندی دەبن. گرووپێكی دیكە توێژەری بێ لایەنن، بەڵام هیچ چاكییەك لە هونەری نوێدا نابینن و تیا دەمێنن كە چۆن دەكرێ دڵ بە هونەری نوێ خۆش بكرێ و فۆرمی سەنگەلا و هێڵێن پەریشانی هونەری نوێ بە مایەی ئارامی ڕوح و تەسەلای بیر بژمێردرێ و یان پێی ببێتە جۆش و خرۆش.

بەڵام توێژەری ڕاستەقینە دەبێ بەر لە هەر شتێك سەرنجی ئەوە بدات كە ئەگەر لە جیهانی شارستانیانەدا ڕاپەڕینێكی هونەری بەرپابێ و پتر لە نیو سەدە بەردەوام بێ و ڕەخنەگران و

هونەرناسانی گەورە بەلای خۆیدا رابکێشێت و کەم و زۆر لەلایەن خەڵکییەوە قبوول بکرێ، بێگومان شایستەی ئەوەیە کە هونەردۆستان ئاوڕی لێ بدەنەوە".
هەڵبەتە نابێ ئەوە لەبیر بکەین کە هەر سەردەمێکی مێژوویی و هەر وەچەیەکی بەشەری هونەری تایبەتی و شایستەی خۆی هەیە و بە شێوەی تایبەتی خۆی دەڕوانێتە جوانی و بەڵگەی پێویستی ئەو جۆرە هونەرە بوونی هەمان هونەرە. واتە بوونی هونەرەکە بەڵگەیە بۆ پێویستی خودی هونەرەکە. جا ئەم هونەرە تازەیە ئەگەر گەشە بکات و رەگ و ریشە دابکوتێ و بەردەوام بێ دیارە کە هەقی مانی هەیە و بە قۆناغێکی زەروری پێشکەوتنی هونەری دەژمێردرێ. تەنانەت ئەگەر کاری ئەو هونەرە تەنیا رووخاندن بێ و هیچ بینایەکی تازە لە جێی روخانەکە دانەمەزرێنێ، دیسان دەتوانین دڵنیابین کە ئەم روخاندنە راپەڕینێکی بەدوادا دێت.

## زمانی تازەی شیعر

لە سیمبولیزمەوە تا ریالیزم، لە ریالیزمەوە تا سوریالیزم، لە سوریالیزمەوە تاکو ئەمڕۆ پێ دەچێ گۆڕانی شیعر زادەو بەرەنجامی پێکدانی بیروباوەڕە دژو ناکۆکەکان بووبێ. لێ ئەو جیاوازی و ناکۆکیانە چەند بەرین و بەربڵاوبن، چەند زۆر بن، هێشتا هەر لە "بۆدلێر"ەوە تا سورریالیزم و لە سوریالیزمەوە تا "میتا سوریالیزم" دێن و زمانێکی هاوبەش لە شیعردا بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە دەتوانرێ ئەوە دیاری بکرێ کە فڵانە پارچە شیعر پاش ئەو گۆڕانەی کە لەسەرانسەری ئەورووپادا بە هۆی کاریگەری و دەسەڵاتی بۆدلێرو مالارمیەوە روویدا، هاتۆتە ئاراوە، گەلێك لە رۆشنبیران دەڵێن شیعری نوێ لە رووی شێوازو یەکێتیی نێوەڕۆکەوە هیچ هاوبەشییەکی نییە. بە هەر حاڵ ئەگەر لە دوورەوەو بە شێوەیەکی گشتی بڕوانینە شیعری ئەم ساڵانەی دواییە دەبینین وێڕای ناکۆکی و پەراگەندەیی و جیاوازیان هەر هەموویان لە سەرچاوەی یەکنەوایی شێوازێیکی دیاریکراوەوە ئاو دەخۆنەوە.
لە سەرانسەری شیعری تازەدا، جۆرە هەوڵێك دژی "دەرونگەری" رۆمانتیکەکان و "بێرونگەری" ریالیستەکان بەدی دەکرێ. لە جیاتی ئەو شیعرەی کە سروشتی خەیاڵی و خەون و وەهم و سەفەری رەمزی روحی دژ بە واقیع هاندەدا، شیعرێك دێت کە هەر هەمووی بۆ ناسینی واقیع تەرخان کراوە. لێ چەمکی "واقیع" لێرەدا زۆر جیاوازە لە چەمکی "واقیع" لە قوتابخانەی پارناس و ناتورالیزمدا. شیعری نوێ کە بە هیچ جۆرێ لە جیهانێکی دەرێی ئەم جیهانەدا بۆ خۆی ناگەڕێ، بە وەسفی واقیع-ش وەکو چون هەیە رازی نییەو تەنانەت سروشتی واقیع بە جیاواز لە سروشتی شیعر دەزانێت، بەڵام ئەوە نیشان دەدات کە دەتوانرێ دنیای واقیع بە تەواوەتی بە شیعر بەرجەستە بکرێ.
بەم پێیە لە بۆچوونی نوێدا، شیعر دەربڕی رێوڕەسمی شێوەی ژیانە بە هەموو واقیعیەتێکییەوە. چونکە شیعری نوێ خوڵقاندنەوەیەکی شاعیرانەی واقیعە، لە قوتابخانەی رۆمانتیزمدا شیعر راکردنە بەرەو پیری واقیعی دابڕاو موجەڕەد، بەڵام ئەم واقیعە پێشوەختەو بە شێوەیەکی ئامادەو حازر هەبووەو هەر هەمان ماهیەت و تەجروبەی هەستەکانە. لە قوتابخانەی ریالیزمدا شیعر

ئەوزارێکی گوزارشتە کە لە هەموو بوارەکاندا بەکاردێت. بەڵام لە ئەدەبیاتی تازەدا، شیعر هەقی بەسەر دیاردەو رووداوو شتە باوو ئاشناکانەوە نییە، ئیدی دیاردەو "شەرح وشرۆڤەی ئەزموونی ژیان بێ یان وەسفی دیمەن یان گێڕانەوەی چیرۆکان یان دەربڕینی هزرو بیران بێ": شیعر، ئەفراندنی شاعیرانەیە.

بەلای مالارمیەو ڤالیرییەوە شیعر لە (وشە) پێك دێت و روو لە تەجریدە. بەلای کەسانی دییەوە شیعر لە وێنەی زەینی و هەست پێك دێت و روو لە واقیعی بابەتییە. یانی بایەخ بە واقیعی بابەتی دەدات. بەڵام لە هەردوو بارەکەدا شیعر کاری داهێنان و ئەفراندنە. "سپاردنی دەستپێشکەری کار بە دەستی وشە" یان ئاراگۆن گوتەنی "بەکار هێنانی بێ حیسابی سەرخۆشکەرانەی وێنەی شاعیرانە" چ فەرقێکی هەیە: شاعیر چاوەنۆڕی کورسی دنیایەکی بێگەردو بێ کەموکوڕی کە هاوتاو هاوسەنگی تەواوی خۆیەتی دەکات. شیعری نوێ بە زۆری لە دووی یەکدا هاتنی سادەی وێنەێن زەینی پێك دێت، بەڵام بێ ئەوەی واقیعی باوو ئاشنای دەرەکیمان بۆ دووبارە بکاتەوە، پەیوەندی ئولفەتگرتنی ئێمەش بە واقیعی ئاساییەوە دەپچڕێ، رێك وەکو ئەو وشانەی کە نەتوانین لە ماناکانیان حاڵی بین. چونکە "پیرروردی" گوتەنی وێنەی زەینی "ئەفراندنی خالیسەی روحە" و تا جوڵەی فیکری داهێنەرەکەی نەناسین لە ماناکانی حاڵی نابین. شاعیر نەك هەر بە رێگا هەمووارو ناسراوەکانی واقیعدا ناڕوات بەڵکو بە پێچەوانەوەی رەوت و شەپۆلی ئاوەوە مەلە دەکات. شیعری نوێ، هەست و زمان و ئاوەزو واقیع و حیکایەتبێژی وەدەردەنێ، چونکە دژی "دنیای سەپێنراوە" و هەموو جۆرە سەپاندنێك رەتدەکاتەوە. بۆیە نەك هەر گوتنی "شیعر" بۆ شاعیر بەڵکو حاڵی بوونی بۆ خوێنەریش دژوار بووە، چونکە خوێنەر چ شتێك لەوەی کە تا ئێستا دیتوویەتی و بیستوویەتی لە شیعری نوێدا نابینێتەوە. تایبەتمەندی هەرە دیاری شیعری هاوچەرخ، ئەوەیە کە بە ئاسانی و راستەوخۆو خۆی بە دەستەوە نادات و خوێنەر راستەوخۆ لێی حاڵی نابێ.

شیعری نوێ. لە هەموو شێوە جۆراو جۆرەکانی خۆیەوە، رەوتی سروشتی و ئاسایی دەرك و هزرین و زمانی ئێمە دەگۆڕێت. و بەمەش دەیەوێ هاوسەنگی تەواو لە نێوان خودو واقیعدا چێبکات. لە شیعری نوێدا ئێمە دنیا دیاری ناکەین، بەڵام لە بری ئەوە خۆمان دەدۆزینەوە.

شیعری نوێ، کە ناومان نا ئەفراندنی شاعیرانەی واقیع، دەشێت بە ئەفراندنی شاعیرانەی زمانیش پێناسە بکرێ یان ناو ببرێ. شیعر بە زەبری خوڵقاندنی زمانێکی تایبەت بە خۆی، واقیعی تایبەتی خۆی دەخوڵقێنێ. ماوەیەکە تێورییەکی گرنگ بە شێوەی جۆراوجۆر لە شیعردا هاتۆتە ئاراوە کە یاساکانی کێش و قافیەو دەستووری زمان و هەر هەوڵێك بۆ "شیعرسازی" رەتدەکاتەوەو ئارمانجی شاعیر بەوە دەزانێ کە لە رێگەی نا راستەوخۆی وشەوە بگاتە جەوهەرو ماهیەتی شتەکان. شێوەی شیعری ئازادو رێبازی ڤارلین کە دژی هەر جۆرە یاسایەکی رەوانبێژی و زمان سواری بوو و دنیایەك وشەی پچڕپچڕو گفتوگۆی وەکو نەرمە گۆرانی هێنایە ناو شیعرەوە، و هەوڵی کلودڤیل و ئیلیوت بۆ دۆزینەوەی بەکارهێنانی گشتی و هێنانی زمانی پەخشان بۆ ناو شیعر، و لابردنی خاڵبەندی لەلایەن ئاپۆلینرەوە، تێکدانی یاسایێن رستەبەندی و

شێوەی دژە غەزەل لەلایەن مایاکۆفسکییەوە کە گۆرانی بەزمی لە نێودەبردو زمانی کوچەو بازاڕی بەکاردێنا، سادەیی و عەوامییەتی شیعری لۆرکا، و هەوڵدان بۆ دوورخستنەوەی شیعر لە مۆسیقای زمان، و ئەنجام هەوڵ و کۆششی سوریالیستان بۆ روخانی شێوە هونەرییەکان و زمانی باو، هەر هەمووی دەلالەت لەوە دەکات کە زامێکی ترسناک کەوتۆتە دڵی شیعرو دەیەوێ لە ناوەوە بنکەنی بکات و لە ناوی بەرێ. بەڵام ئەمە تەنیا رواڵەتی مەسەلەکەیە: سەرانسەری شیعری نوێ ئەوە نیشان دەدات کە شیعر لە (وشە) پێك هاتووە. هەڵوەشاندنەوەی زمانیش دەکاتە هەڵوەشاندنەوەی زمانی دەستکردو باو. زمانی سەپێنراو رەتدەکرێتەوە تا زمانێکی تازە لە دایك ببیّ و جێی ئەو بگرێتەوە. جا کە ئاندریە بریتون دەڵێت: "دەبیّ وشە لەگەڵ یەکدیدا ئاشقێنی و ماچ و موچ بکەن"، نەك هەر مەبەستی وەدەرنانی زمان نییە، بەڵکو بە تەمایە کە زمان توانای تازە پەیدا بکات. بریتون لە مەسەلەی وەدەرنانی زمانی "سەپێنراو"دا هاوبۆچوونی ڤالیرییە، تەنیا لەوەدا نەبیّ کە بریتون لایەنگری "بەدیهەگۆیی"یەو ڤالیری لایەنگری "سنعەتگەری"یە. بەهێزکردنی سنعەتی ئەدەبی بە کۆمەکی وشەی مکوم و مجەڕەد، و رزگاری لە هەر جۆرە سنعەتێکی ئەدەبی بە کۆمەکی بەدیهەگۆیی زمانی ئیلهام یان زمانی قسەکردن، دوو ئەوزاری جیاوازن کە شیعر پەنایان بۆ دەبات تا (زمانی داهێنان) بخاتە جێی "زمانی دەربڕین".

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین، خراپ نییە ئاماژەیەك بۆ شاعیرانی وەچەی پاش جەنگی جیهانی دووەمیش بکەین کە ئەمڕۆکە هەر چەند کەسێکیان لە دەوری گۆڤارێکی ئەدەبی جددی کەم تیراژ خڕبوونەتەوەو زۆربەیان لە ژێر کاریگەری هەلومەرجی ئەو سەردەمە تایبەتییەدان کە تیایدا دەژین.

جەنگی جیهانی دووەم و رووداوەکانی پاش جەنگی نێوبراوو رەوتی نائاسایی ئێستای مێژووی بەشەر، زۆربەی ئەم شاعیرانەی بە توندی هەژاندو بووە هۆی ئەوەی کە لە بری جەنگی نەزۆکی فۆرم و نێوەڕۆك زیاتر بیر لە وەزع و حاڵی بەشەری بکەنەوە. هەر چەند ئەم دەستە شاعیرە، بە تایبەتی لاوەکانیان، لێکدی جیاواز بوون و شێوازی جۆراوجۆریان هەبوو، بەڵام هەندێ تایبەتمەندی هاوبەشیانیش هەبوو. ئەوەتا "ئالن لانس" کە شاعیرێکی لاوی فەرەنساوی بوو و بە خۆی لەگەڵ ئەو تاقمە شاعیرەدا بوو، و یەکێك بوو لە هاوکارانی گۆڤاری " Action poetique" لە وتارێکیدا ئەم تایبەتمەندیانەی بەم شێوەیە کورت کردووەتەوە:

- ئەوانە بە شێوەیەکی پڕئازار تەکانەکانی مێژوو تەحەمول دەکەن یان بە شێوەیەکی رونتر بڵێین جەنگی بەرژەوەندخوازی زامێکی قووڵ و بەردەوامی کردۆتە روحی وەچەی ئەوان.
- زۆربەی ئومێدو ئارەزووەکانیان لە دەست داوە: لەگەڵ ئەمەشدا دنیا بەم شێوەیەی کە هەیە بەلای ئەوانەوە پەسند نییە. لە بەرانبەر بیّ سەروبەری و ئاژاوەی دنیای سێیەمدا، بە توندی هەست بە شێواوی و پەریشانی کۆمەڵگەی رۆژئاوا دەکەن.
- ئیعترازو ناڕەزایی پڕ ئازاری ئەوا زۆر جار لە زمانێکی دەوڵەمەندی رۆژانەدا بەرجەستە دەبێت و رەنگدەداتەوە.

- ئـەم جیاوازییـەیان لەگـەڵ وەچـەکانی پێشـوودا هەیـە کـە زمـانی ئـەمان رازاوە نییـەو ئەوەندەش پابەنـدی گوزارشـتو ریتمـی لیریکـی نینو ئـەوەتا "جـان مـالریو" کـە یەکێکـە لەوان دەڵێت: "هەموو ئەوەی من دەیڵێم زبرو دوو رەگەیە".
- جا لەگەڵ ئەمەشدا وەکو پێشـتر گـوتم ئـەم تایبەتمەندییانـە بـۆ هـەموو شـاعیرەکان چـوون یـەك نـین، چـونکە شـاعیرانی دیکـەش هـەن کـە زیـاتر پابەنـدی قـاڵبنو پـەیڕەوی تیـۆری "شیعر بۆ شیعر" دەکەن.

بە هەر حاڵ، هاتنە ناو دنیای شیعری نوێ لە هەر دەرگایەکەوە بێ هەمیشە دەکاتە گەڕانـەوە لـە "بـاو"ەوە بـۆ "نابـاو" چـونکە تایبەتمەنـدی سـەرەکی شـیعری نـوێ بریتییـە لـە پچڕانـدنی داوی پەیوەنـدی بـە واقیعـی دەرەکـیو زمـانی بـاوەوە. ئـەوەی کـە لـە شـیعری نوێـدا گرینگـە جەوهەرو ماهیەتی داهێنەرانەیەتی.

## گۆڕانی رۆمان

لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا جـۆرە رۆمانێـك کـە دەتـوانرێ نـاوی "رۆمـانی شـاعیرانە"ی لـێ بنرێ، لە بەرانبەر رۆمانی کۆنو تەقلیدیداسەری هەڵداو واقیعی لە ژێر توێـژاڵی مـادیو زنجیرەی جەبری دیاردە فیزیکیو کۆمەڵایەتییـەکان هێنایـە دەرێو خوێنـەری کێشـایە نـاو تاریکسـتانێکی جادوو ئاساییەوە.

رۆمـانی سیمبولیسـتی کـە جـۆرێکی تایبەتییـە لـە "رۆمـانی شـاعیرانە"، دوا بـەدوای شـیعری سیمبولیستی هاتە مەیدان، بەڵام لە مەیدانی نەبەردا زۆر خۆی نەگرت.

ئەگەرچی شیعر لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا خۆی بە نێو قەڵەمڕەوی رۆمانـدا کـرد، بـەڵام هۆشوئاوەزیش بەرە بەرە لەکیشوەری رۆمانـدا جێـی خـۆی کـردەوە. ریـالیزم ئـەوەی دەبینـی کـە جیهان بەسـەر مرۆڤیـدا سـەپاندبوو، لـێ رۆمـانی سـەدەی بیسـتەم دەیویسـت دەوری مـرۆڤ بەسـەر دنیـاو شـتانەوە بـدینێو شـرۆڤە بکـات. هەڵبەتـە دەوری مـرۆڤ هـەوەڵجار لەشـێوەی "پرسـیاردا" خرایە روو.

نزیکـی رۆمـان لـە شـێوەی کـاری ئـەهلی تۆژینـەوەو بـەدوادا چـوون،و خسـتنەڕووی پـرسو گرفتەکانی ژیان لە نیشانەکانی گۆڕانی رۆمان بوو،و ئیدی حیکایـەتو گێڕانـەوە بـوو بـە ئـەوزارو هۆکـاری ناسـینی تەبیعـەتو لێکۆڵینـەوە. هەنـدێ گریمانـان لـە رۆمانـدا هاتـە ئـاراوە کـە پێشـان ئەقڵی ساغلەمی رۆماننووس رێی بە خۆی نەدەدا کە تەسەوری بکات.

نووسـەر لـە رێگـەی رۆمانـەوە هـەوڵی دەدا مەسـەلە فـەردیو گرفتـە شەخسـییەکانی خـۆی بـە شێوەیەکی رەمزی نیشان بداتو چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە. رۆمانو شانۆنامە لەسەر دەسـتی (ئانـاتول فـرانس)و (مـوریس بـارس)و (سـامووئیل باتلـەر)و (ئۆسـکار وایلـد)و (هزبـرت جـورج ویلـز)و (برناردشـۆ) شێوەی خواستنو کینایـەو درکـەو رەمـزو وەعـزو وتـاری گرتـەخۆو، شـەرحو شرۆڤەی چیرۆك تەنیا بیانوویەك بوو بۆ دەربڕینو نیشـاندانی بـاوەڕ یـان کەڵکەڵـە رووحییـەکانی نووسەر. گفتوگۆی قارەمانـان بـۆ سـەلماندنی بـاوەڕی شەخسـی –هـەر چەنـدە رۆمـانی ریالیسـتی

پێی قاییل نەبوو، بەڵام دۆستۆفیسکی باشترین نموونە لێ دروست کردبوو- بەشێکی گرینگی کۆمەڵە بەرپەرێکی هەندێ رۆمانی گەورەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی پڕکردبووەوە.
"ماری پەردار"ی لورانسو "کێوی جادوو"ی توماس مانو "سکەسازان"ی ئاندریە جیدو "چارەنووسی بەشەر"ی ئاندریە مالرۆ لە دەرێی چوارچێوەی چیرۆکدا، مۆڵەتی بە گفتوگۆو هەندێ جار چەنەبازی قارەمانەکان کە هەر یەکێکیان لە دووی "حەقیقەت"ی شەخسی خۆی بوو. گەلێك لە چیرۆکنووسان لە تۆ وایە فەیلەسوفێکیان لە ناخی خۆدا حەشارداوەو ئەوەی بەرەو دنیای داهێنانی رۆمانی راکێشاون هەمان جازیبەو هاندەری کاری پیاوی توێژەرو زانا بووە.
رۆمانی ریالیستی قارەمانانی بە گوێرەی کارو رەفتاریان نیشان داوەو هەقی بەسەر هاندەری باتینییانەوە نەبووە. رۆمانی ریالیستی نەدەچووە بنجو بناوانی مەسەلە روحیو ئەخلاقییەکانی قارەمانانەوە، بۆیە لەم رووەوە لە بواری سایکۆلۆژیدا هیچ کەشفێکی گرینگی ئەنجام نەداوە. بەڵام رۆمانی سایکۆلۆژی ئەوەندەی بایەخ بەناخو هاندەرە دەرونییەکانی قارەمانان دەدات، ئەوەندە بایەخ بە شەرحو شرۆڤەی هەڵسوکەوتو رەفتاری دەرەکی قارەمانان نادات. نووسەرانی وەکو جورج میردیتو هنری جیمس و مارسیل پرۆست بار دەروونییەکانی بەشەریان وەکو بە تواناترین دەروونناسان شی کردۆتەوەو چوونەتە بنجو بناوانی. و جیمس جۆیسو ڤیرجینیا وولف پەنهان ترین گۆشەو کەناری روحیان پشکنیوە، واتە نەك هەر بارە دیارەکانی شعوری بێداری مرۆڤ، بەڵکو تەمومژی شعوری پەنهانی ئەویشیان، کە بارە دەروونییەکان لەوێندەرەوە سەر هەڵدەدەن، داوەتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەو شی کردنەوە. لەم رووەوە رۆمان ئاسۆی دەروونناسی بەرین کردو دنیایەکی تێکچرژاوو بێ وێنەو نەوەستاوو جۆراو جۆری لە قەڵەمڕەوی زانست دەرهێنا.
هەروەها ریالیزمێکی تازە هاتە ئاراوە کە بە رواڵەت پاشکۆو درێژەی هەمان ریالیزمی پێشوو بوو. لە نێو رۆماننووسانی هاوچەرخی ئەمریکادا، دۆس پاسۆسو هەمینگوایو کالدوقیل دنیای هەستی خاوو سەرەتاییان شەرح کردو مکوڕانە دژی یاساو رێسای شێوازەکانی پێشوو وەستانەوە، رۆمانەکانی ئەوان لە دیمەنەکانی ژیانی رۆژانە کە زۆر بە ئاسانی لە دوای یەك ریزکرابوون، لە پێکەوە گرێدانی رووداوەکانی رۆژەوە دەهاتنە ئاراوە: "زوومی کامیرای وێنەگری" جێی زوومی چاوی نووسەری دەگرتەوە. رۆمان لە سۆڤیەتدا، پاش سالآنێك لە پیاهەڵدانی ڤیان ئامێزو شاعیرانەی شۆڕش، رووی کردە ریالیزمی کۆمەڵایەتی رێسای "ئەزموونی ژیان" بنەماو بناغەی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمە: جەزبەی ئەم ئەدەبیاتە لە شەرحو شرۆڤەی رۆژانە رووداوانەوە سەرچاوە دەگرێ، و زۆربەی خوێنەران لە نێو رۆمانەکەدا بۆ بیرەوەری شەخسی نووسەرەکە دەگەڕێن، جا ئیدی ئەم رۆمانە چ نووسینی ئاندریە جید بێ و چ هی ماکسیم گۆرکی بێ.
بەڵام نابێ ئەم خاڵەش فەرامۆش بکەین کە: مەبەست لە ریالیزم، لە روانگەی نووسەرانی سەدەی بیستەمەوە شەرحی ئەزموونی شەخسی نووسەرە لە ژیاندا، نەك وەسفی دیتنو سەرنجەکانی

نووسەر. ئەگەرچی نووسەر رەگەزو توخمەکانی کارەکەی لە واقیعی دەرەکییەوە وەردەگرێ، بەڵام لەبەر ئەوە نییە کە خۆی شتێکی پێ نییە بۆ گوتن. نووسەر جڵەوی بابەتەکان بە واقیع دەسپێرێ، چونکە زمانی واقیع لە زمانی واقیعی خۆی روونترو رەوانترە.
وەسفی بێ لایەنانەی واقیع، راستییەکی بنەڕەتیو گرینگ ئاشکرا دەکات: راستییەك کە نووسەر کەشفی کردووەو تیایدا ژیاوە. "زوومی کامیرای وێنەگری" لە عەینی حاڵدا، هەمان دیتنی دەوورنی نووسەرێکی وەکو دوس پاسوس-ە، "ساتی هەستکردن" لە بەرهەمی هەمینگوای دا، هەمان حەقیقەتو راستی ژیانە لە روانگەی ئەم نووسەرەوە، ئەگەر قارەمانانی فلان کارەسات وەکو تەمەشاڤانانی خەمساردو بێ رەگو ریشە دەنوێنن، لەبەر ئەمەیە کە بەزەییو بەلا تا لە ئێمە دوورتربێ کاریگەرییەکەی زۆرتر دەبێ.
بێلایەنی نووسەرو خەمساردی قارەمانان، بەڵگەی نەبوونی جیهانبینی شەخسیو داماڵینی مەحەبەت لە مرۆڤو وەدەرنانی شێوازو رەتکردنەوەی رێساکانی جوانیناسی نییە، بە پێچەوانەوە هۆیەکە کە هێزی دڵنیاییو دەرەکی واقیعێکی بالاتر بە روانینو جیهانبینی رۆماننووس دەبەخشێت. کافکا لە میانەی چیرۆکەکانییەوە دەیەوێ جیهانبینی شەخسی خۆی لە مەڕ چارەنووسی بەشەرو جیهانی میتافیزیکاو سوپەر سروشت بگوازێتەوە بۆ کەسانی دی. جا بۆ وەدی هاتنی ئەم مەبەستە، وەکو هەمینگوای خەمساردو بێ لایەن دەنوێنێو تەنیا تەمەشاڤانێکی رووداوەکانەو هیچی دی.
رۆمانی ئەم سەدەیە، باوەڕی بە دیدی ریالیستی بۆ واقیع نییە، بەڵام رۆماننووس ئەگەر خۆی لە جیاتی یەکێك لە قارەمانانی چیرۆك دابنێ، ئەوا پێی وایە کە "خۆبینی" نووسەر نابێ واری رۆمان تەنگ بکات: رۆمان دەبێ دەربڕی "جیهانبینی" بەرینی نووسەر بێ. لە زەمانی فلۆبیرەوە تاکو ئێستا، رۆماننووس، بە پێچەوانەی رێبازی رۆمانتیزمەوە، دیدی شەخسی خۆی بەسەر قارەمانانی کتێبەکەیدا نەسەپاندووە. دەڵێی هەموو شتێك لە دەرێی بوونی نووسەردا دەگوزەرێ. تەدەخولی راستەوخۆی نووسەر بە هەر شێوەیەك بێ، بڕشت لەبەر رۆمانەکە دەربڕیو جازیبەی کەم دەکاتەوە.
هەر جارێ رۆماننووس بە ناوی شەخسی خۆیەوە قسە بکات، دەگاتە ئەنجامگیری ئەخلاقیو قارەمانەکان دادگایی دەکاتو بە جۆرێ جڵەوی رەوتی چیرۆکەکە کۆنترۆڵ دەکات لە تۆ وایە ئامادەگیو حوزوری ویژدانی هۆشیارو داوەری بێ ئاکامی نووسەر لە هەر بەرپەڕێکی کتێبەکەدا قورساییەکی گەورە دەخاتە سەر شانی خوێنەر. هەر جارێ رۆماننووس دەستی خوێنەر بگرێو هۆی رووداوەکانی بۆ شەرحو شرۆڤە بکاتو بەرەو ئەنجامێکی دیاریکراو رێنوێنی بکات، هەر جارێ لە بری شەرحی راستەوخۆو سادەی چیرۆکەکە، زەرورەتی بونیادی رۆمانەکەو رێنوێنی قارەمانەکان بداتە بەرچاوی تەماحی خۆی، ئەوا توانای کاریگەریی بەرهەمەکە کەم دەبێتەوە.
هەڵبەتە مەبەست ئەمە نییە کە خوێنەر بخرێتە داوی واقیعێکی وەهمییەوە، بەڵام وەکو کۆپی کاری بێ هاوتای واقیعی دەرەکی نییە، دەبێ لەسەر نموونەی هەمان واقیع دەست بداتە داهێنانی واقیعێکی تر کە هەمان مکومیو بتەوی هەبێ. رۆمان دەبێ لە یەکەم ساتەوە

بمانهەژێنیٚ و له یەکەم رستەکانییەوە دنیایەکی بەرینو له هەمان کاتدا ئاڵۆز بخاته بەرچاومانو کوتو پڕ خوێنەر بخاته ناو رووداوەکانەوەو بەمجۆرە رەوتو رێچکەی ئیبهامو ئاڵۆزی جێگەی پێشەکییە درێژە بالزاکییەکان دەگرێتەوە. رۆمانی (سەفیرانی گەورە)ی هنری جیمس، (زەبرو زەنا)ی ویلیام فۆکنەرو (ئولیس)ی جیمس جۆیس هەر لە یەکەم دێرەوەو بیٚ هیچ پێشەکییەك خوێنەر دەخاتە ناو جەرگەی چیرۆکەکەوە. توانای ئەم رۆمانە لە توانای مقاوەمەتی رۆمانەکەیدا لە بەرانبەر خوێنەردا. واتە خوێنەر دەبیٚ بۆ حاڵی بوونی بابەتەکە هەنگاو بە هەنگاو تێکەڵی ببیٚ و، بە گوتەیەکی دی خوێنەر دەبیٚ وەکو خودی رۆماننووسەکە، رۆمانەکە لە نویٚ چێبکاتەوە. ئاندریە جید لە کتێبی (سکەسازان)دا ئاماژە بۆ هەمان ماناو چەمك دەکات: "حەزم لێیە کە نووسەر بە راشکاوی رووداوەکان نەقڵ نەکات. بەڵکو هەر رووداوێك چەندین جار لە چاوی ئەو کەسانەوە کە بەشدارن تیایدا یان لە چاوی ئەوانەوە کە لە ژێر کاریگەری رووداوەکەدان تەمەشا بکات، ئەوجا نیشانی بدات. حەز دەکەم کە رووداوەکان لە چاوی هەر یەکێك لە شایەدە لاوەکییەکانەوە گۆڕانێکیان بەسەردا بیٚ. ئارەزووی خوێنەر لەو هەوڵەوە هەڵدەقوولیٚ کە بۆ تێگەیشتنی حەقیقەت دەیدات. رۆمان بۆ تەواوکردنو نیشاندانی خۆی پێویستی بە هاوکاری خوێنەر هەیە".

لیٚ هەموو ئەم رۆمانانەو ئەنجامی ئەم تازە خوازیانە لە فاسیلەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا هاتنە ئاراوە، جەنگی جیهانی دووەم بۆ ماوەی چەندین ساڵ هەر جۆرە تازەخوازییەکی راگرت، لە دوای جەنگ جۆرە بیٚ موبالاتییەك هاتە ئاراوە، رەنگە هەر بۆ رەواندنەوەی ئەم بیٚ موبالاتییە بووبیٚ کە کۆمەڵێك هەوڵی تازە لە جیهاندا دەستی پێکرد کە گرنگترینیان رێبازو رەوتی "رۆمانی نویٚ" بوو.

بەڵام بەر لەوەی بێینە سەر باسی (رۆمانی نویٚ) وا چاکترە ئاماژەیەك بۆ کاریگەری ئەگزیستانسیالیزم-ش لەسەر ئەدەبیات بکەین.

## کاریگەری ئەگزیستانسیالیزم

قوتابخانەی ئەگزیستانسیالیزم کە کەمێك بەر لە جەنگی دووەمی جیهان لە فەڕەنسادا هاتە ئاراوەو پاش جەنگ گەییە هەڕەتی تواناو شۆرەتی خۆیو بووە مایەی ئەوەی کە راپەڕینێکی فراوان بەرپا ببیٚ و سنووری فەڕەنسای بەزاندو بۆ چەندین ساڵ فەرمانڕەوایی رەوتی فیکرو هونەری ئەوروپای کرد. ئەگەر تەماشای مێژووی ئەم قوتابخانەیە بکەین دەبینین هەم لایەنی جدی و هەم لایەنی گاڵتەجاڕی هەم کاری لاوازی ئەوتۆی تێدایە کە رەنگە دەگەڵ پرەنسیپەکانی قوتابخانەی ناوبراودا ناسازبیٚ. بەر لە هەر شتێك پێویستە ئەم دوو لایەنە لە یەکدی جیابکەینەوەو پرەنسیپ و بنەماکانی ئەم قوتابخانەیە شرۆڤە بکەین.

زاراوەی (ئەگزیستانسیالیزم) وشەیەکی تازە نییە، ئەو فەلسەفەیەش کە ئەم زاراوەیەی لێوە هەڵقوڵیوە، بە داهێنانی زەمانی ئێمە ناژمێردریٚ. بە هەر حاڵ ئەم زاراوەو ئەم حیکمەتە تا پێش ساڵی ١٩٣٩ بەشێك بووە لە زمانی هونەریی فەلسەفەی میتافیزیکی. لە راستیدا

ئەگزیستانسیالیزم بە مانا زاراوەییەکەی، فەلسەفەو جیهانبینییەکی تەواوە کە لەسەر بناغەی دیارو ئاشکرای میتافیزیك رۆنراوە. جا ئێمە نامانەوێ لەم کورتە باسەدا شەرح و شرۆڤەی ئەم رێبازە بکەین. بەڵکو دەمانەوێ ئەو رێورەسمەی کە نووسەرانی سەر بەم قوتابخانەیە لە شێوەی ژیان و ئەدەبدا بەکاریان هێناوە بە کورتی نیشان بدەین.

بەرای هەندێ لە زانایان، مرۆڤ لە کارو کردەوەو رەفتاری خۆیدا ئازادنییەو بە تەواوی لە ژێر حوکمی کاریگەری ویراسەت و ژینگەدایە، و ئازادی تەنیا خەیاڵەو بەس. بەرای هەندێ زانایانی دیکە "ئیدی سەر بە هەر رێچکەو رێبازێك بن" کە کەم دابێژێك بە ئازادیی رێژەیی قایلن، ئەسڵی ژیان لە (ماهیەت)دایە، واتە زاتی هاوبەش لە نێو بنیادەمان یان گروپێك لە بنیادەمان، بۆ نموونە جیاوازە لە زاتی سەگان و درەختان. حەزی ئاسایی و سروشتی و لۆژیکی هەر تاکێك لەمەدایە کە بە گوێری ماهیەتی خۆی بژی و ئارمانجێك بۆ ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. هەموو زانستە ئەخلاقییەکان بە شێوەیەکی بنجبڕ ئەوە بە مرۆڤ دەڵێن کە بە گوێرەی ماهیەتی خۆی بژی و لە بری ئەوە وەعدو بەڵێنی شادمانی دنیایی یان ئەو دنیایی دەدەنێ.

پەیرەوانی قوتابخانەی ئەگزیستانسیالیزم کە "وجود"یان پێ لە (ماهیەت) لە پێشترە باوەڕیان وایە کە مرۆڤ توڕدراوەتە دنیایەکی پوچ و بێهودەوە کە نە قەرارو قانونێکی هەیەو نە دەگاتە هـ یچ مەخسەدو هەدەفێك. جا بەم پێیە هیچ شتێك رێنوێنی داهێنان نییە وجود یان بوون بە ئازادی تەواوەوە، بەدەر لە چەمکی چاکی یان خراپی بەدەر لە ئومێدی پاداشت و ئەو شتانە، هەر رێیەکی بویێ دیاری دەکات و هەر مانایەکی بوێ پێی دەبەخشێت. مرۆڤ لە ئەسڵ و ماهیەتدا هیچ خەسڵەتێکی فیتری و خۆڕسکی نییە، بەڵکو پێکهاتەی ئەو شتانەیە کە لە (دنیای بون)دا بە دەستی هێناوە. واتە بەشەر زادەو پێکهاتووی کارو رەفتارو ژینگەی خۆیەتی.

مرۆڤ بەو کارانەی کە لە دنیای وجودا ئەنجامی دەدا دەتوانێ ماهیەتێك بۆ خۆی دروست بکات و بەبێ هیچ کۆت و بەندێك و بێ باوەڕ بوون بە هیچ شتێك دەتوانێ شەخسیەتێك بۆ خۆی پێك بێنێ.

بەڵام ئەم ئازادییە بۆ نەتوانایان بارێکی قورسەو بەرەو نائومێدیان دەبات، حاڵبوکی بۆ توانایان هۆی جۆش و خرۆش و کارو کۆششە. دوا ئەوزاری دەستی نەتوانایان بەدخوازی و بەدنییەتییە کە لە سایەیدا لە دیاریکردنی وەزع و پایەی خۆو ژینگەی خۆ دەدزنەوە، و بەوە خۆ دەخەڵەتێنن کە هەدەفی دەستکرد بۆ ژیان دەدۆزنەوە —هەدەفانێ کە بە زۆری بۆ (خەڵکانی دی) شوومو خراپە_ هەڵبەتە باسی ئەگزیستانسیالیزم و دیاریکردنی خاڵە پۆزەتیف و نێگەتیڤەکانی لە توانای ئەم کتێبە بەدەرە. ئەوەی پێویستە بگوترێ تەنیا ئەمەیە کە بەرهەمی ئەگزیستانسیالیستەکان کارێکی قووڵی کردووەتە سەر ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئەوروپا.

ئەو دەستە فەیلەسوف و نووسەرانەی کە بە پێشڕەوایەتی سارتەر، ئەگزیستانسیالیزمیان هێنایە سەر تەخت رێگەی زۆریان هەبوو بۆ راکێشانی پەیرەوان و موریدیان. گرنگترین رێگە بەهرەی ئەدەبی بێ چەندو چوونیان بوو، و پاشان دژایەتی کردنی هەلپەرستیەت و رەنگ گۆڕکێی کۆمەڵ و ئەوجا پێشوازی کردن لە چینی لاوان. گەلێك لەوانە پێداویستییە ماددی و بژێوی و

تەناهیەکانیان بە هەند وەرنەدەگرتو بە شایستەی ئەوەیان نەدەزانی فەیلەسوف پێوەیان خەریك بێ. کۆڕی ئەدەبی خۆیان لە قاوەخانەکاندا دەگێڕاو باوەڕیان وابوو کە فیلمێن بازاڕیو مۆسیقای جاز زمانحاڵو دیارترین ئەوزاری دەربڕینی دنیای هاوچەرخە. لە نێو ئەمانەدا ژمارەیەکیش تەنانەت بە جلو بەرگو رواڵەت ئەگزیستانسیالیستی خۆیان نیشاندەدا، پیاوان ردێنیان بەردەدایەوەو گوێیان بە پاكو خاوێنی جلو بەرگ نەدەدا، و ژنان لە بێ موبالاتیو مەستیو رابواردنو بەرەللایی، لە رارەوو کۆڕو کۆبوونەواندا، نەدەپرینگانەوە. چونکە ئەگزیستانسیالیزم بەشەر بە بەرپرسی کارەکانی خۆی دەزانێو بێ شەخسیەت بوونی بەشەر، بە ئەنجامی راستەوخۆی هەڵەکانی ئەو لە ژیاندا، دەژمێرێت.

دەکرێت بیروباوەڕو تێورییەکانی سارتەر دەربارەی هونەرو نووسەرایەتی "کە لە ژمارەکانی گۆڤاری (زەمانێن مۆدێرن)دا بلاوبوونەتەوە" بەمجۆرە کورت بکرێنەوە:

نووسەر، بە حوکمی ئەوەی زمانی خەڵکی بە بەها ئیعتیبارییەکەی بەکار دێنێو کتێبەکانی خۆی لە نێو خەڵکیدا بلاودەکاتەوە (پابەند)و بەرپرسیارە، چونکە ناتوانێ لە حوکمی پرسو دۆزەکانی سەردەمی خۆی دەربچێتو لە هەموو حاڵێکدا دەبێ مەسئولیەتی نووسینەکەی خۆی لە ئەستۆ بگرێ، تەنانەت ئەگەر شاگردەکانی، ئەنجامی بیرەکانی، بە پێچەوانەی مەیلی ئەوەوە لێك بدەنەوە. ئەرکی نووسەر بە درێژایی رۆژگاران لە گۆڕاندا بووەو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. نووسەر یەکەمجار ئەنجامدەری فەرمانی خواو رێبەری ئاینی خەڵك بوو.

پاشان لە سەردەمی کلاسیکدا (سەدەی هەڤدە) بوو بە بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵگە ئەرستۆکراتی بەهرەو ئەدەب پەروەری ئەوتۆ کە ئەویان بە هاوشانی خۆ دەژمارد، لەم سەردەمەدا، ئەگەرچی نووسەر بە واقیع ملی بۆ فەرمانی ئەرستۆکرات دابوو، بەلام خۆیبوونی تەبعو عیزەتی نەفسو راشکاوی خۆی بە چاکی دەپاراست. دوای ئەوە لە سەدەی هەژدەمدا نووسەر وەکو کەسێکی خەباتگێڕی بۆرژوا ریشەی رۆشنبینر بە رۆشنبینییەکی تەواوە لە رای پاراستنی مافێن چینی دووەمدا دەخەبتی. ئەو سەردەمە قۆناغی زێڕینی نووسەران بوو. بەلام لەو زەمانەوە تا ئێستا هاوسەنگییەکان شێواوە نووسەر بووە بە مێملو سەرباری دەسەلاتداران،و بەمە بێ تاقەتو نارەحەتە. جا بۆ ئەوەی قەدرو حورمەتی یەکەمجاری خۆی بەدەست بێنێتەوە، فشە هەڵوێست دەنوێنێ، کاری قەڵبو ساختەو سەرڤە سەرڤە ئەنجام دەداتو، ئەوانەی کە لەسەر بەرماوەی خوانی ئەوان دەژین بەبێ زەوقیو نەفامیو کەچ تەبعی تاوانبار دەکات. تەنانەت بۆ تەبرێکردنی خۆی پەنای وەبەر (هونەر بۆ هونەر) بردووە، بەلام نەیتوانیوە خۆی فریو بدات. تاقە رێگای ئەو ئەمەیە کە بێتە مەیدانی خەبات، یانی لە رای پاراستنی بەرژەوەندیو مافی خەڵکیدا، خۆی بە ئاوو ئاگردا بدات بێ ئەوەی خۆی لە رەنگی وابەستەگی حیزبان هەڵکێشێت. بەلام لێرەدا ریزپەڕێك هەیە، ئەویش کاری شاعیرە: شاعیر زمان، تەنیا لەبەر بایەخەوێنەییەکانی بەکار دێنێ. سارتەر لە کتێبێکیدا دەربارەی "بۆدلێر" ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەم شاعیرە بوونەوەرێکی بەدبەخت نەبوو کە مەحکوم بە شکستو ناکامی بێ،و شکستە یەك لە دوای یەکەکانی لە ژیاندا، ئەوەیە کە بە خۆی بە ویستو ئارەزووی

خـۆی بـە دووی هـۆی شکسـتو ناکامیـدا دەگـەڕا، چـونکە سەرچـاوەی ئیلـهامو ئـەوزاری تۆڵەسەندنەوەی لە خۆی، لـەم ڕەنجو حورمانـەدا دەبینییـەوە. ئـەم بۆچوونە دەربـارەی گـەلێك لـە شاعیرانی دیکەش ڕاستو دروستە.

لەگەڵ ئەمەشدا نابێ کاریگەری چەمکی بەرپرسیاریەتیو (پابەنـدی) دەربـارەی هـەموو چالاکییە ئەدەبییەکانی سارتەر تەعمیم بکرێ. ئەوەشمان لە بیر نەچێت کـە فەلسـەفەی ئەگزیستانسیالیزم بایەخێکی زۆر بە مەسەلەی ئازادی نووسـەر دەدات،و تەنانـەت سـارتەر فەلسـەفەو هونـەری خـۆی بە قەرزارباری هزرڤانو نووسەرانێك دەزانێ کە پابەنـدو وابەسـتە نـەبوون یـان ئەگـەر وابەسـتەش بووبن بە جۆرێکی دیکە وابەستە بوون: وەکو هزرڤانانی ئاڵمانی یان ڕۆماننووسانی ئـەمریکایی.

بۆیـە دەبـێ لـە یەکـەم هـەنگاودا کتێبـەکانی ئـەو وەکـو بەرهـەمێن ئـەدەبی (نـەك بەرهـەمێن بانگەشەیی) تەمەشا بکرێنو هەڵبسەنگرێن. هەر لەبەر ئەمەشە کە یەکەم کتـێبی ئـەو (ڕشـانەوە) بە خراپی شرۆڤە کراوەو لێکدراوەتەوە. قارەمانی سـەرەکی ئـەم ڕۆمانـە، چ ڕەنگدانـەوەی نووسـەر بێ لە قۆناغێکی گۆڕانی ژیانیدا یـان نـا، بـە نموونـەی تـەواوی مرۆڤـی پـەیڕەوکاری فەلسـەفەی ئەگزیستانسیالیزم نایەتە ژماردن، بەڵکو نموونەی کەسانێکە کە زۆر هوشیارنو لـە ژیانـدا جگـە لـە پووچـیو بێهـودەیی چ شـتێکی دیکـە نـابیننو ماندوویـەتی خۆیـان بـە ڕشـانەوە دەردەکـەنو چونکە ئاگاداری ئەم بێهودەییەن هەوڵ بۆ چارەسەری نادەنو...

هەڵبەتـە ئـالبێر کـامۆ کـە خـەڵاتی نـۆبڵی سـاڵی ١٩٥٧ی وەرگـرت بـە نووسـەرێکی ئەگزیستانسیالیست نایەتە ژماردن. ئەو بە خۆیشی نکۆڵی لەم وابەستگەییە دەکرد، بە هەر حـاڵ بۆچـوونی فەلسـەفی ئـەو دەربـارەی پووچـی و بێهـودەیی جیهـان تاقـە شـتێکە کـە بـە ئەگزیستانسـیالیزمییەوە دەیبەسـتێ، ئـەم پووچـیو بێهودەییـەی جیهـان کـە بنـەمای کتـێبی "ئەفسانەی سیزیف"ی پێك هێناوە، کامۆ بەرەو ڕەشبینیو نائومێدی نابـاتو تەنانـەت کۆمـەڵێك ئـەنجامی ئـەخلاقی تەسـەلا بەخشـیش لـە فەلسـەفەی ئـەوەوە وەردەگـیردرێ. ئەگـەر قارەمـانی سەرەکی ڕۆمانی (نامۆ) –نامۆ لە خۆیو لە کەسانی دی– بە دڵی نووسـەرە، لەبـەر ئەمـە نییـە کـە پاش کوشتنی کەسێك بەڕای قازیو دادوەرەکان بابایـەکی گـەوجو بـێ ئـەقڵو کـەچ فـام حـوکمی مـەرگ دەدرێ، بـەڵکو لەبـەر ئەمەیـە کـە ڕەوتـی کوشـتنو دادگـاییو زیندانەکـە بەوپـەڕی خەمساردیو بێ موبالاتییەوە دەگوزەرێنێ، وەکو ئـەوەی ئـەم ڕووداوانـە بەسـەر کەسـێکی تـردا هـاتبێ، ئـەوجا لـە کـونجی زینـدانـدا، وەکـو حـەکیمانی زوو، دەگاتـە جـۆرە خۆشـبەختییەك، لـە بیروهزری کامۆدا، ئێمە هەموومان ئەم بێگانەو نامۆیەین. مەبەستی کـامۆ ئەمـە نییـە کـە بانگەشـە بۆ خەمساردیو بێ موبالاتیو بێ لایـەنی بکـات، چونکە ئەگەرچـی بـەلای ئـەوەوە چـاكو خراپـی موتڵەق وجودی نییە، بەڵام بەوە قاییلە کە جیاوازی لە نێوان نیـازی بـاشو نیـازی خراپـدا هەیـە.

بابەتی سەرەکی ڕۆمانەکەی دیکەی کامۆ (تاعوون) ئەمەیە: لە شارێکی چکۆلەدا کە پەیوەندی بـە دەرەوە بـڕاوەو نەخۆشـییەکی درمـی سـامناك بـە نێـو خەڵکەکەیـدا بڵاوبووەتـەوە، ئیـدی گومـانو دوودڵی جایز نییە، دەبێ هەمووان ئەرکی سەرەکی خۆ بە ڕزگاری لەم بارودۆخە سامناکە بزاننو هەموو هێزی خۆ بۆ ئەم کارە تەرخان بکەن.

ئێستا کە سالانێك بەسەر قۆناغی فەرمانڕەوایی و هەژموونی دەسەلاتی ئەگزیستانسیالیزمدا دەقەتێ، دەتوانرێ داوەرییەکی ڕێژەیی سەبارەت بە کاریگەری ئەگزیستانسیالیزم لەسەر ئەدەبیات ئەنجام بدرێ.
هەڵبەتە لە سەرەتاوە چاوەنۆڕی ئەوە دەکرا کە ئەگزیستانسیالیزم کارێکی لە رادەبەدەر بکاتە بکاتە سەر ئەدەبیات، بەلام وا دەرنەچوو. ئەلبێر کامۆ کە نووسەرێکی بە تواناتر بوو مرد، و سارتەرو سیمون دی بوڤواری هاوکاری کە لە نووسەرانی ناوداری سەردەمن لە دنیای ئەدەبدا موریدو پەیڕەوانێکی ئەوتۆیان پەیدا نەکرد. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمەکانیان وەکو زنجیرە کارێکی ئەدەبیی بە نێوەڕۆك فەلسەفی هێشتا لە جیهانی ئەدەبدا قەدرو ئیحتوباری خۆیان هەس.

## ڕۆمانی نوێ

زاراوەی "ڕۆمانی نوێ" هەر چەندە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا تەواو جێی خۆی کردۆتەوەو شۆرەتی پەیدا کردووەو خەڵکانێك تەنزیراتی بۆ دەکەن، لە راستیدا ناوێکە کە ڕۆژنامەنووسان لە کۆمەڵە چالاکییەکی پەراگەندەیان ناوە. مەبەستی هاوبەشی ئەم نووسەرانە ڕەفزکردنی کۆمەڵە قالبێکی ڕۆمان بوو لە دنیادا.
ئەم قاڵبانە بریتین لە: ڕۆمانی سایکۆلۆژی یان شیکاری کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بایەخێکی زۆری پەیدا کردبوو، و هەروەها ڕۆمانی پڕ ڕووداو. مەبەستی هەموو ئەم نووسەرو تەنزیرکارە نوێیانە ئەمە بوو کە ڕۆمانێك بێتە ئاراوە لە قاڵب و شێوەی تەقلیدی ڕۆماننووسیدا نەبێ و لە واقیعێکی تایبەتییەوە ئیلهام وەربگرێ. بەلام ئایا ئەم واقیعە چییە؟ ئا لێرەوە، لەم خاڵەوە ڕێگاکان جیادەبنەوە. چونکە ئەو نووسەرانەی کە لە کاری ڕەفزکردنی رابردوودا هاو بیروبۆچوون بوون، لە هەڵبژاردنی ڕێگەیەکدا کە جێی ڕێگاکانی رابردوو بگرێتەوە یەك ئاراستەو سەمتیان نەگرتە بەر.
هەر چەندە دوو کەس لە پێشەنگانی ڕۆمانی نوێ، واتە ناتالی ساروت و ئالن روب گریە هەوڵیاندا شەقڵی تیۆری و ڕێسایی بە بیروبۆچوونەکانی خۆ بدەن، بەلام ئەنجامگیرییەکانیان چوونیەك نەبوو، جیاواز بوو. هەڵبەتە هەمان جیاوازی لە نێوان باوەڕو بەرهەمێن نووسەرانی دیکەی ڕۆمانی نوێدا هەیە. لە ئەنجامدا دەبێ ئەوە بگوترێ کە ڕۆمانی نوێ نە یەك قوتابخانەیەو نەیەك راپەڕین. ناتالی ساروت لە کۆمەڵە وتارێکی خۆیدا کە بەناونیشانی "سەردەمی بەدگومانی" بلاوبووەتەوە، بە متمانەوە کەوتنی بەرەبەرەی رەگەزە تەقلیدییەکانی ڕۆمان، بە هەمان شێوەی کە نووسەرانی سەدەی نۆزدەیەم تەسەوریان دەکرد، نیشان دەدات. نووسەرانی سەدەی پێشوو هەموو هەوڵێکیان بۆ ئەوە بوو رەگەزی هاڕوژاندن لە ڕۆماندا بخوڵقێنن و بەکار بێنن. هەوڵیاندەدا قارەمانانی زیتەڵ و زیندوو بێننە مەیدانەوەو لەم قارەمانانە (نموونە)ی بەشەرییان دروست دەکردو سوور بوون لەسەر ئەوەی کە گەشەکردن و نەشونمای قارەمانەکانیان لە زەمان و شوێنێکی وەکو تاوێر مکوم و نەگۆر بخوێننەوە، یان کارێك بکەن کە

ئەم قارەمانانە لە هەندێ ساتی بەرجەستەی وەکو قەیرانی هەستەوەری، غایلەی شەیتانی یان لە هەلومەرجی حەتمی و کوتوپڕدا بدرەوشێنەوە.
نووسەر بە کۆمەکی چیرۆك و لە ڕێگەی قارەمانان و بەسەرهاتی ئەو قارەمانانەوە، لە ڕاستیدا کۆمەڵە زانیارییەکی پەیوەست بەخۆییەوە بۆ ئیمە دەنارد، ئیدی بەرە بەرە کار گەییە شوێنێ کە تەنیا خودی ئەم زانیارایانە بۆ خوێنەر گرینگ بێ. یانی هەم نووسەران و هەم خوێنەران ئیدی هەقیان بەسەر تەکنیکە تایبەتییەکانی ڕۆمان و چوار چێوەی چیرۆکەوە نەبێ، و بەڵکو تەنیا بە دووی ئەو شتەدا بگەڕێن کە ڕۆمان لە خۆیدا حەشاری داوە و بۆ خوێنەری ئاشکرا دەکات و ئەوە تەرزی تایبەتی بوون و ژیانی مرۆڤێك بوو لە دنیادا. لە ئەنجامی گۆڕانێکی سروشتی و ئاساییدا، ڕۆمان لەحاڵەتی شیکردنەوەی ئانسکلوپیدیایی دنیا یان هەستەوە گۆڕا بۆ کورت کردنەوەی ئەم دنیایە لە باری مەعنەوی و شاعیری و فەلسەفی و میتافیزیکەوە لەلایەن نووسەرەوە. هەڵبەتە دیدی نووسەر لە نووسین و داهێنانەکانیدا بۆ خوێنەر بایەخێکی زۆری پەیدا کرد، ڕۆمان بوو بە شیکردنەوەیەکی بێ پێشینەی دنیا لە لایەن نووسەرەوە. دیارە ئەم شیکردنەوەیە پەیوەندی بە پەیوەستەگی خودی ئەو بە دنیاوە هەبوو. ئەو لەم بەرهەمەدا زۆر بەوردی خۆی نیشان دەدا. جۆیس، بەر لەوەی لە ڕێگەی نامەکانییەوە بناسرێ دەتوانین لە ڕێگەی ئولیس-ەوە بیناسین. کافکا کاتێ کە لە یادداشتەکانیدا باسی خۆی دەکات بە شەرمەوە ئەمە دەکات، بەڵام لە ڕۆمانی (دادگا)و (کۆشك)دا بە شەرمێکی کەمترەوە خۆی دەناسێنێ. بەمجۆرە چەند دەروونگەرایی زیاتر برەو دەسەنێ، ڕۆمان پتر کاڵ دەبێتەوە.
ئالن روب گریە لەم بارەیەوە لەگەڵ بۆچوونی ناتالی ساروتە کە نابێ ڕۆمان لەسەر بنەمای "هاڕوژاندن" یان قارەمانانە ڕۆبنرێ، و دەبێ (مەرگی قارەمان)و هەروەها (مەرگی چین بەندییە سایکۆلۆژی و فەلسەفییەکان) لە ڕۆماندا ڕابگەیەنرێ و جگە لەمەش دەیەوێ دەروونگەرایی زەق کە لە کاری ڕۆماننووسەکاندا دیارە بە تەواوی لە بەین بچێ و نەمێنێ. ئەو دەیەوێ نووسەر خۆی فەرامۆش بکات یان بە تەواوەتی خۆی لە ڕۆمانەکە بسڕێتەوە، لە جیاتی ئەوە (شتەکان)وەکو چۆن خۆیان دەنوێنن، نیشان بدات.
چونکە نووسەر پێشتر لە پشت خۆیەوە یان لە پشت قارەمانانی چیرۆکەکەیەوە دەیڕوانییە شتەکان، ئەم شتانەی لە سایەی هەلومەرجی یەك ژینگەدا، لەناو چیرۆکێکی دیاریکراو یان شارستانیەتێکی تایبەتدا شیدەکردەوە. بەمجۆرە نەیدەتوانی کە دنیای دەوروبەری خۆی بە چاوانی کراوەو ئازادەوە بدینێ، بەگوتەیەکی دی گیانی بە شتەکان دەبەخشی، ڕوحێکی بۆ کەشف دەکردن و دەی بەشەراندن، لە کاتێکدا دنیا بە حوکمی وجودی بێ غەل و غەشی خۆی مکوم و پایەدارەو ناتوانی بە ئارەزووی خۆت بیگۆڕی. بە بۆچوونی روب گریە ڕۆمان دەبێ لیستێکی زۆر وردی ئەم دنیایە بێ کە لە دەرێی ئێمەدا هەیە: دنیای تایبەتی "شتانی ڕووت". ئەو دنیایە یە کە جیهانی ڕۆمان پێکیدێنێ. و دەیەوێ ئەم دنیایە لە کەماڵی ڕوونی و مکومیدا بێ.

دەبێ ئەوەش بگوترێ کە پراکتیزە کردنی ئەم بۆچوونەی رووب گریە لە رۆماندا کارێکی نائاساییە. چونکە رۆماننووس دەبێ ببێ بە ئاوێنەیەك کە بۆ خۆی و لە خۆیدا نە جولەی هەبێ و نە باوەڕ. چۆن جیهانی شتان لە جیهانی بەشەری کە شەریکە تیایدا جیا دەکرێتەوە؟ چۆن دەتوانرێ ئەم شتانە لە زەمان و لە شوێن جیا بکرێتەوەو لە هەر جۆرە گۆڕان و گۆڕینێك بەدەر بێ.

رولان پارتی رەخنەگری ناوداری هاوچەرخ دەڵێت کە: "ئەم ئەدەبیاتی دیتنە، ئەدەبیاتی دنیایەکی بێ جووڵەیە".

ئالن روب گریە هەوڵی داوە لە رێگەی رۆمانەکانی خۆیەوە یەکەمین نموونەی ئەم ئەدەبیاتە بە دەستەوە بدات. لە کتێبی (Les Gommes)دا شار، کۆڵانەکان، ماڵەکان، زێراب و کەناڵانی ئاو، هەر هەموو بەوپەڕی روونییەوە نیشان دەدرێ، کەچی کاراکتەرانی رۆمانەکە تەنیا لە شێوەی کۆمەڵە پەیکەرێکدا هەن، یان لە شێوەی کۆمەڵە شتێکدا کە نازانین چ هێزێك دەیان جووڵێنێ. ئەوەی زیاتر سەرنج رادەکێشێت وردی ئەو میکانیزمەیە کە وەکو میکانیزمی سەعات وردو ناسکە، بۆ وێنە لە کاتی مەشقێکی شانۆییدا هەر هەموو جموجۆڵی کاراکتەرەکان یەك بەیەك و بە وردی نیشان دەدا، لەمەش گرینگتر ئەمەیە کەئەم رووداوە زەمانی نییەو خودی رووداوەکان وەك رۆمانی پۆلیسی بەدەر لە هەر جۆرە شیکردنەوەیەك روو دەدەن، هەڵبەتە ئاشکرایە کەخودی ئەم رۆمانە جۆرە رۆمانێکی پۆلیسییە.

روب گریە لە کتێبی "حەسوودی"دا کە لە ساڵی ١٩٥٧دا بڵاو بووەتەوە بەردەوامی چیرۆکیش وەلاوە دەنێ. کۆمەڵە رووداوێکی خەیاڵی یان حەقیقی دەخاتە بەرچاوی ئێمە کە بێ رەچاوکردنی زەمانێکی دیاریکراو تێك رژاون.. کاراکتەرەکانی چیرۆکەکە تەنیا لە رێگەی ئەو پەیوەندییەوە کە لەگەڵ یەکتردا هەیانە دەناسرێن: یەك مێرد، ژنێك و دۆستەکەی! ئەو ژینگەیەی کە تێیدا دەژین وڵاتێکی نا دیارەو بۆ ئەوەی ئەم بۆشاییانە بگەنە رادەی باڵا، نووسەر مەتر بەدەست دەکەوێتە شەرحی ئەندازەیی شوێنەکان و شتەکان و شوێنی شتەکان وەکو شوێنی روناکی هەتاوو سێبەر لە سەعاتە جیاوازەکانی رۆژدا، لەگەڵ گەڕانەوەی پەیتا پەیتا بۆ هەمان رووداوو هەمان جوڵەو هەمان قسان. ئەو ئەنجامەی هەڵدەهێنجرێ زۆر سەیرە. خوێنەر هەست دەکات لە شانۆییەکی شەبەنگ و تاپۆیاندایەو تەنیا بوونی شانۆ کە گرینگەو رووداوەکان کە لە هەر جۆرە قووڵییەك بەدەرە، لە هەر تەرزە سیفەت و تایبەتمەندییەکیش مەحرومە. جا لەوە سەیرتر ئەمەیە کە بەرە بەرە ئەم بێرونگەراییە توندەی کە نووسەر مەبەستیەتی لەنکاودا لەبەر چاوی خوێنەر بۆ قووڵترین دەروونگەرایی دەگۆڕێت، چونکە هەموو ئەم شتانە لە روانگەی مێردێکی حەسوودی دڵپیسەوە دەبینرێ و لەنکاودا ئەم هەستە بەرۆکی خوێنەر دەگرێ کە لەوەیە هەموو ئەوانە دەستکردو زادەی زەینی هەمان قارەمان بێ.

دەشێت ئەنجامی ئەم قسانە بەوە لێك بدرێتەوە کە روب گریە خۆیشی نازانێ چ دەکات یان نەیتوانیوە دنیای دڵخوازی خۆی دروست بکات. چونکە زاڵبوونی شتان لە دەرێی زەین بەو تەرتیبەی کە روب گریە دەیڵێ وجودی نییە. چەنکە بۆ بەرجەستەکردن و دەربڕینی ئەو شتانە

دەبێ زمانێك بەكار بێنێ و ئەم زمانە زمانی بەشەرێكە كە جگە لە زمانی رۆماننووس زمانی چ كەسێكی دیكە نییە. بەڵام بەهەر حاڵ روب گریە وەكو رۆماننووس بە زۆری بە ئەنجامێك دەگات كە رێك پێچەوانەی تیورییەكانی خۆیەتی. بەڵام ئەم شكستە تیۆرییەی روب گریە دەبێتە مایەی سەركەوتنی رۆماننووسێك بەناوی ئالن روب گریەو خوێنەر سەیر دەكات كە دەروونگەرایی و بێرونگەرایی لە راستیدا دوو رووی یەك دراوی هەڵواسراوەو گوشار لەسەر روویەكی، رووی دووەمیمان بەلادا هەڵدەگێڕێتەوە.
بەپێچەوانەی روب گریەوە كە هەمیشە دەیەوێ نەچێتە قوڵایی شتەكانەوە، ناتالی ساروت لە هەمان كاتدا كەسڵ لە نموونەسازی دەكاتەوە، لە بەرهەكانی خۆیدا ژیانی پڕجۆش و خرۆشی مرۆڤان بە تایبەتمەندییە بازاڕییەكانیانەوە دەردەبڕێ و نیشان دەدات. واتە ژیانی واقیعی و پەیوەندییە مرۆڤانییەكان نیشان دەدات. بەڕای ئەو ئادەمیزاد جگە لەوەی كە بەپێی ئەقڵ و لۆژیك و پرانسیپیان بەسەر دەوروبەری خۆدا زاڵ نین، دەسەڵاتیان بەسەر شەخسی خۆیشیاندا ناشكێ و نییە. ئەوەی بۆ نووسەر گرینگە تانوپۆی گشتی ژیان و پەیوەندییە سەرەتاییەكانی ژیانە، وەكو رێكەوتن، توندو تیژی و بەرەڤانی و هەموو ئەو پەیوەندییانەی دیكەی كە لە بەینی مرۆڤ و دنیای دەوروبەریدا هەیە.
لە "ناوچەی بورجان"دا كە بە رەونەقترین بەرهەمی ناتالی ساروتە لە ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوبووەتەوە دەتوانرێ بە باشترین شێوە ئەو دنیایە بدینرێ كە پێویستە ناوبنرێ "دنیای لاوەكی"، كاراكتەرەكان هەموو هەن و بە هیچ جۆرێ وەكو كاراكتەرو قارەمانەكانی روب گریە شەبەنگ و تاپۆیانی بزۆزنین، هیچ كامیان نوێنەری نموونەی تایبەتی و خودان خەسڵەتێن جێگیر نین، لەم كتێبەدا لاوێكی سادەو ساكار دەبینرێ كە دەخوازێ زەوقی هونەریی هەبێ، پورێكی ماخۆلان گرتوو، و خانەوادەیەكی پەراگەندەو ژنێكی نووسەری بە ناوبانگ كە هەندێ جار لە گەرمەی شۆڕەت و سەركەوتندا دەیبینین و هەندێ جار لە دەلاقەی پێكەنیناوی ژیانییەوە دەیبینین. ئەو تانوپۆو شیرازەیەی كەچیرۆكەكە پێكەوە دەبەستێ ئاڵۆزو نامەفهومەو هیچ بایەخێكی نییە. ئەوەی نووسەر دەیەوێ لەم كتێبەدا بیڵێ، وەكو لە ناوی كتێبەكەشەوە دیارە، ئەمەیە كە ئەم كاراكتەر یان كەسایەتی یان قارەمانانە هەر یەكێكیان دەڵێی بە جۆرێكی سەربەخۆ لە مەنزومەیەكی جیادا دەسوڕێتەوەو لەم سوڕانەوەیەدا هەندێ جار یەكدی رادەكێشن و هەندێ جار یەكدی دوور دەخەنەوەو هەروەها هەندێ جار پێكدا دەدەن. ئەم پێكدادانەش بە زۆری توندو قایم دەبێ. بەڕای ناتالی ساروت ئێمە تەنیا بۆ خۆمان دەژین و ئەو داوەرییانەی ئێمەش كە بەڕای خۆمان زۆر وردەو هەزارو یەك حیسابی بۆ كراوە دەشێت بە زەبری رەوتی ئاڵۆزی ژیان هەر جۆرە گۆڕانێكی بەسەردا بێت.
ماوەیەكی زۆر ناوی میشیل بوتور لەگەڵ ناوی روب گریەدا دەهات، كەچی لەگەڵ ئەمەشدا ئەم دوو رۆماننووسە لاوە بەیەك رێگەدا نەڕۆییشتن. هەر چەندە كە میشیل بوتور-ش گرینگییەكی فرە بە دنیای دەرەكی نادات و هیچ باوەڕێكی بە دەرونزانی نییە، بەڵام گرنگی بە قارەمانانی بەرهەمەكانی و ئەو پەیوەندییانەی كە بە دنیاوە هەیانە، دەدات.

بەپێچەوانەی هەموو پێشەنگانی رۆمانی تازەوە، میشێل بوتور هەرگیز پێی وا نییە کە بتوانێت لە کۆتی زەمان ئازاد ببێ. بەڵام ئەم زەمانە بە پێچەوانەی زەمانی بەرهەمێن کلاسیکەوە زەمانێکی جێگر نییە کە پێشتر پێمان درابێ، بەڵکو زەمانێکە جگە لەوەی کە نەخشی قاڵب بۆ رووداوەکانی رۆمان دەگێڕێ، لە هەمان کاتدا بەشێکە لە تانوپۆی ئێمە.

ئەوەی دەشێت دەربارەی رۆمانی تازە بگوترێت ئەمەیە کە ئەم رێبازە تازەیەش یەکێکە لەو رەچەتە زۆرو زەبەندانەی کە بە نەخۆشێك دەدرێ چونکە دەبێ ئەوە بگوترێ کە رۆمان پتر لە بیست ساڵە نەخۆشە. بە ڕای ژمارەیەك لە ئەدیبانو رۆشنبیرانو شارەزایانی دنیای سینەماو تەلەفزیونو رۆژنامان ئەم نەخۆشە هیچ چارەیەکی نییەو بگرە بەڕای ژمارەیەکی دی رۆمان لە مێژە مردگە.

لێ دامەزرێنەرانی (رۆمانی نوێ) لە ریزی ئەو کەسانەن کە رەچەتە بۆ رزگارکردنو چارەسەری ئەم نەخۆشە دەنووسن. بەڵام ئەم رەچەتانە تا چ رادەیەك یارمەتی چاك بوونەوەی ئەو نەخۆشە دەدەن؟ ئەمە مەسەلەیەکە جارێ ناتوانرێ حوکمی لەسەر بدرێ.

## ( شانۆی نوێ )

ئایا شانۆی نوێ پێوەرەکانی گۆڕیوە؟ ئایا دنیای ئەم لەگەڵ دنیای شانۆی سەدەکانی پێشووداو تەنانەت لەگەڵ شانۆی باوی چل ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا فەرقی هەیە؟ گومان لەمەدا نییە. ئەوڕۆکە ئێمە سەروکارمان لەگەڵ شانۆیەکدایە کە هەموو پرەنسیپەکانی شانۆی بەر لە خۆی شڵەقاندووە. نموونەشی لەسەر تەختەی شانۆکان دەبینین یان لە کتێباندا دەیخوێنینەوە بەڵام بە زۆری ئاڵۆزو نا مەفهوومن. جا ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین بە پێی توانا ئاشنای ئەم شانۆیە، کە "شانۆی پووچ"شی پێ دەڵێن، ئاشنای ببین، بۆ ئەم مەبەستەش پشت بە (مێژووی شانۆی نوێ)ی ژنویوسرو دەبەستین.

"دروستە کە جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵێك مەسەلەی تازەی هێنایە گۆڕێو دنیای روو بەڕووی گۆڕانی تازە کردەوەو، ئەو دنیایەی لە پاش ئەم جەنگە هاتە ئاراوە جیاوازییەکی زۆری لە دنیای پێش جەنگەکە هەبوو، بەڵام دەتوانرێ بگوترێ کە پێوەرەکانی دنیای پاش جەنگ فەرقێکی ئەوتۆی لەگەڵ پێوەرەکانی پێش جەنگدا نەکردبوو. لێ سەبارەت بە جەنگی جیهانی دووەم پێویستە بگوترێ کە کۆتایی دنیایەكو سەرەتای دنیایەکی تر بوو بە دنیایەك پێوەری تازەوە. هێرۆشیما خۆری رەشی ئەم دنیایە بوو، و لە ژێر تیشکی ئەم خۆرەدا هەموو بەهاکانی رابردوو دامرکانەوە، ئەگەر هەندێ لەو بەهایانە تروسکاییەکیان دەدایەوە، ئەمە وەکو تروسکەی ئەو ئەستێرە دوورە دەستانە بوو کە بۆ ماوەیەك پاش نەمانو ئاوابوونی خۆیان هێشتا تروسکەیەکی کزیان هەبوو. تاوەکو سەرەتای جەنگی جیهانی دووەم، وێڕای ئەوەی جەنگێکی گەورە قەومابوو، بەڵام کۆمەڵگە بەشەرییەکان لە گۆڕانو پێشکەوتنی بەرە بەرەدا بوون. ئاسۆی ئەو ئومێدو هیوایە لە ئارادا بوو کە رۆژێ لە رۆژان رەگو ریشەی هەر جۆرە زوڵمو ناهەقییەك لەسەر رووی زەوی هەڵکەندرێو کۆمەڵێك کۆمەڵگەی ئایدیالی بێتە ئاراوە. بەڵام ئەو چەند

ساڵەی جەنگو ساڵانی پاش جەنگ-ش لە پڕ هەموو ئومێدێکی بە باداداو مرۆڤی دڵنیاو دڵخۆشو سەرگەرمی ریفۆرمی لاوەکی کە دەیویست مەسەلە کۆمەڵایەتییە ناسكو هەستیارەکان چارەسەر بکات لەپڕ خۆی لە بەردەم کوشتارێن بە کۆمەڵو هەڕەشەی نابودکردنی دنیادا بینییەوەو هەستی کرد هەموو هەوڵو تەقەلاکان بە فیڕۆ چووەو بۆ سەردەمی هۆڤیگەری گەڕاوەتەوە، جا لەمەش خراتر ئەوە بوو کە کاتێ چاوی کردەوە بینی ئەو کۆمەڵگە ئایدیالیانەش بنکەیەك بوونە بۆ فەرمانڕەوای فەردی. هەموو ئومێدەکان لە پڕ هەرەسیان هێناو مرۆڤ لە دوای جەنگەوە خۆی لە بۆشاییەکی روحیدا بینییەوە. ئەم بۆشاییە لە سەرەتادا زمانی تایبەتی خۆی نەدۆزی بووەوە. ساڵانی جەنگ ساڵانی هەژاری و قاتو قڕی ئەدەبیو رۆشنبیری بوو ئەم قاتو قڕیو هەژارییە درێژخایەنە هەموو خەڵکی جیهانی تینووی ژنەوتنی دەنگێکی تازە کردبوو.

نووسەرانێك هەندێ شتیان نووسیو چەند شیعرێك گوتران. بەڵام شانۆ لەم بارەیەوە هیچ کارێکی نەدەکردو دەتگوت لە خۆی رانابینێ کە هەڤڕکی دەگەڵ مێژوودا بکات. ئەوەی کە یەکەمجار مێژوو ئەنجامی دابوو، ئەوەبوو لەگەڵ سینەمادا فیلمی دیکومێنتی هێنایە سەر پەردە، بەڵام پێویستی بە زمانێك بوو کە کاری سینەما نەبوو. دەشێت بگوترێ کە هەر چەندە سینەما نەیدەتوانی بە خۆی ئەو زمانە بێنێتە ئاراوە، لێ زەمینەیەکی لە باری بۆ قبووڵ کردنی ئەو زمانە رەخساندو خۆشکرد. جا لەم کەینو بەینەدا هەر شانۆ بوو کە دەبووایە، ئەگەر بە مەرگی خۆیشی بووە، ببێ بە زمانی زیندووی ئەم قۆناغەی مێژووی بەشەر، قۆناغێك کە چیتر پێشڤەچوونی بەرەبەرەی زەمانی تێدا مەترەح نەبوو و هیچیش مایەی سەرسامی نەبوو کە زەمانەکان بڕژێتە ناو یەكو لە چاو تروکانێکدا هەموو شتێك ئاوەژوو ببێتەوە یان رابردوو تێکەڵی ئایندە ببێ.

رەنگە بشێت بگوترێ کە پێشهاتەکە بە نمایشی "دادگا"کەی فرانتز کافکا لە پاریس دەستی پێکرد، جان لویس بارو لە ساڵی ١٩٤٧دا، دادگای خستە سەر شانۆ، دیارە ئاندریە جید ئامادەی کردبوو بۆ شانۆ، وەرگێڕانی کتێبەکە کە لە ساڵی ١٩٣٣ لە پاریس بڵاوبووبووەوە هیچ دەنگێکی نەدابووەوە. (جوزیف ك)ی قارەمانی دادگاکەی کافکا کە لەبەر هۆیەکی نادیار دادگایی دەکرا بە هیچ جۆرێ بۆ ئەو رۆژگارە بە نوێنەری وەزع و حاڵی بەشەری نە دەژمێردرا، بەڵام ئەم نامۆیە کە لە دنیای پچڕانی پەیوەندییاندا یەخسیر بوو بوو، کاتێ هاتە سەر شانۆ بە هەق یان بە ناهەق بوو بە سیمبولێکی تایبەتی، سیمبول بۆ ئەو کەسانەی لە تەوقیفخانەکاندا مەحکوم بوو بوون، نموونەی کاراکتەرانی "دۆزەخ"ی سارتەر یان نموونەی ئەو "پووچی"یە کە کامۆ بەرجەستەی دەکردو وێنەی دەگرت. هەمان قارەمان بوو کە لە دوورەوە دەستی ئاشنایی بۆ (فلادیمیر)و (ئەستراگون)ی قارەمانانی (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)و (کلوڤ)و (هام)ی قارەمانانی "کۆتایی گەمەکە"ی سامۆئیل پیکیت درێژ دەکات.

یەکەمین بەرهەمی ئەم دەستە نووسەرانە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٠ لە پاریس لە شانۆکانی کەناری چەپی روباری سین هاتە ئاراوە. بەڵام ئەم بەرهەمانە بە هیچ جۆرێ زادەی کاری دەستە نووسەرێکی دیاریکراوو بەرهەمی هاوکاریو هاوفیکرییەکی تایبەت نەبوونە بۆ دامەزراندنی

قوتابخانەیەکی کۆك و جێگیر. یوجین یونسکۆ، ساموئیل پیکیت، ئارتور ئادامۆف و جان جینیەو چەند نەفەرێکی دیکە هەر یەکەیان بە تەنێ بۆ خۆی کاری دەکردو تاقە خاڵی هاوبەشی نێوانیان ئەمە بوو کە دژی شانۆی باوو تەقلیدی ئەو قۆناغ و رۆژە هەستا بوون. ئەوەی سەیرە ئەمەیە کە زۆربەی ئەم نووسەرانە فەرەنسی نەبوون. "پیکیت" ئینگلیز بوو، "یونسکو" رۆمانی و فەرەنسی بوو، و "ئادامۆف" رووسی و ئەرمەنی بوو و هەر هەموویان فەرەنسایان وەکو مەڵبەندێك بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تازەی خۆیان هەڵبژاردبوو و بەرهەمەکانیان بە زمانی فەرەنسی دەنووسی و لەمەشدا بە هەڵە نەچوو بوون چونکە تەنیا لە فەرەنسادا دەیانتوانی دەرهێنەرانێك بدۆزنەوە کە بەرهەمی نائاسایی ئەوان پەسند بکەن و لەسەر شانۆ نمایشی بکەن. ئەم شانۆنامانە بۆ ماوەیەکی زۆر نمایش کران و رووبەڕووی ئێرادگیری و ناڕەزایی بوونەوە . ژمارەیەك حاڵی بوون و ژمارەیەکیش هیچیان هەڵنەکڕاندو بە خۆڕایی هۆڵەکانیان بەجێ هێشت. جا لەگەڵ ئەمەشدا ئەم نووسەرانە بە جیاو بەشێوەی سەربەخۆ، بە هەموویان قۆناغێکی تازەیان لە شانۆدا هێنایە ئاراوە کە هەندێ کەس پێیان دەگوت قۆناغی "شانۆی پێشڕەو" و ژمارەیەکیش پێیان دەگوت قۆناغی "شانۆی پووچ". و لە راستیدا قوتابخانەیەکی خەیاڵی هاتە ئاراوە. ئەوانەی کە بەم قوتابخانە خەیاڵییەیان دەگوت (پێشڕەو) مەبەستیان ئاماژە کردنە بۆ ئەو جورئەتەی کە ئەم نووسەرانە سەبارەت بە جیابوونەوە لە نەریتی باوی شانۆگەری وەخت دەریانبڕی بوو، و ئەوانەیش کە ناویان دەنا "شانۆی پووچ" لەبەر ئەو ئاڵۆزی و تەمومژە بوو کە لەم شانۆنامانەدا هەبوو. بەڵام خودی شانۆنامە نووسەکان بە هیچ یەکێك لەو ناونیشانانەی سەرێ (شانۆی پێشڕەو، و شانۆی پووچ) قاییل نەبوون. بە تایبەتی یونسکۆ دەربارەی ناونیشانی پووچ، دەیگوت: "بەڕای من لە دنیای بووندا هەموو شتێك لۆژیکییەو (پووچ) بوونی نییە، بۆیە پووچ مایەی سەرسامی نییە، بەڵکو خودی بوون و بوونایەتی مایەی سەرسامییە".

هەروەها دەیگوت:

"خەڵکی ئەوە بە پووچ ناو دەبەن کە لایەنی پێکەنیناوی زمان، کە لە ئەسڵی خۆی بە تاڵ بووەتەوە، لە قاو دەدات..."

یەکەمینی بەرهەمی شانۆی نوێ لە ساڵی ١٩٥٠دا بڵاوبووەوە. ئەم بەرهەمە ناوی "دەنگبێژی کەچەلە"و لە نووسینی یونسکۆ بوو، هەروەها دوو شانۆنامەی ئادامۆف بەناوی (مانۆری گەورەو بچووك"و "هێرش".

"دەنگبێژی کەچەلە" شانۆنامەیەك بوو کە نە دەنگبێژی تێدا بوو نە کەسێکی "کەچەڵە"و زۆربەی تەمەشاڤانان ئەم کارەیان بە جنێو بۆ خۆیان دەزانی...

جنێوێکی تریش ئەمە بوو کە لەگەڵ دەستپێکردنی شانۆنامەکەدا سەعاتە دیوارییەکە "١٧" کەڕەتی لێدەداو "مەدام ئیسمیت" کە لەسەر شانۆ بوو دەیگوت: "سەیرە! سەعات نۆیە!"و دوا بە دوای ئەوە زنجیرە گفتوگۆیەکی نا ئاسایی دەستی پێدەکرد کە لە راستیدا لە ئاسایی ترین و بازاڕیترین قسەی رۆژانە وەرگیرابوو و رواڵەتی خۆی گۆڕی بوو. پاشان خودی یۆنسکۆ لە (یاداشتان و دژە یاداشتان)دا ئەوەی نووسیووە کە ئەم شانۆنامەیە لەبەر گفتوگۆکانی کتێبی

یەکەمی فێر بوونی زمانی ئینگلیزی نووسراوەتەوەو هەندێ گۆڕانکاری تێدا کراوە، بەڵام ئەم رستانە لە راستیدا شێوەی زنجیرە وشەبازییەکیان لە خۆ گرتبوو و زنجیرە پیتێکی دەنگدارو بێ دەنگ بوو کە دەتگوت لە زاری چەند کەسێکی رۆبۆتەوە دەردێن. بەمجۆرە شانۆنامەکانی یونسکۆ قاڵبێکی تەنزئامێزی ئەوتۆیان وەرگرت کە تەماشاڤانیان بە شتگەلێك دێنایە پێکەنین لە بنەڕەتدا خەندەدار نەبوون.

نوێنەرێکی بەرجەستەی دیکەی ئەم شانۆییە ساموئیل پیکیتە کە لە هەمان کاتدا لە نێو ئەو دەستە نووسەرانەدا لە هەموویان فەیلەسوف تر بوو. (لە چاوەڕوانی گۆدۆدا)کەی بیکیت کە سێ ساڵ پاش "دەنگبێژی کەچەلە" لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣دا لەسەر شانۆی (بابیلۆن)ی پاریس پێشکەش و نمایش کرا، ئەم شانۆنامەیە بریتییە لە دوو رۆژی ژیانی "فلادیمیر"و "ئیستراگون" کە لە کەناری رێگەیەکداو لە نزیکی درەختێکدا چاوەڕوانی "گۆدۆ" ناوێك دەکەن کە وەعدیان لەگەڵیدا هەبووە. گۆدۆ هەرگیز نایەت. کە پەردە دادەرێتەوە دیسان ئەم حاڵەتی چاوەڕوانییە بەردەوام دەبێ کە رۆژێکی دیکە بێت و لە نوێ بکەونەوە چاوەڕوانی هاتنی گۆدۆ.

لە "کۆتایی گەمەکە"شدا کە پاش شانۆنامەی "لە چاوەڕوانی گۆدۆ"دا نمایش کرا، جۆرە چاوەڕوانییەك هەیە، چاوەڕوانی کۆتایی هاتن و تازەکردنەوەی بیرەوەری رابردوو لە دنیایەکی بۆش و ڤالادا. شانۆنامەکانی دواتریشی وەکو (دوا شریت)و (خۆڵەکەوە) هەر باسی دنیای کۆتایی هاتگ و قارەمانی تەنیایان دەکرد. لە هەر یەکێك لەم شانۆنامانەی (ساموئیل بیکت)دا قارەمانی بەرهەمەکە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە گەڵ بیرەوەری رابردوودا دەژی: لە "کۆتایی گەمەکە"دا، (هام) باسی رۆمانێك دەکات کە دەیەوێ بینووسێت و یادێکی رۆژانی رابردووە.

لە (دوا شریت)دا پیرەمێردێك کە گەیووەتە کۆتایی ژیان، لە هەر ساڵێکی تەمەندا دەنگی خۆی لەسەر شریتێك تۆمار کردووەو هەڵیگرتووەو بە دانانی شریتەکە لەسەر رێکۆردەر ساڵانی رابردووی تەمەنی خۆی دەژێنێتەوە.

لە (خۆڵەکەوە)دا، "هنری" تەنیا لە رەخی دەریاداو لە نێو دەنگی شەپۆلانی دەریادا چیرۆك بۆ خۆی دەڵێت: کۆمەڵێك وێنە لە خەیاڵدانییەوە دادەچۆڕێ و یەك یەك لەبەر چاوی بەرجەستە دەبن: باوکی، دوو پیرەمێرد بەناوانی (بولتون)و (هالوڤی) کە لە شەوێکی بەفردا یەکدی دەبینن: "ئاگرێکی خەفە، سەرمای بەترەف، تەنیایی، دنیای سپی پۆش.. نە دەنگێك هەیە، نەئاگرێ، هیچ شولەیەك نییە، هیچ تروسکەیەك نییە، تەنا خۆڵەکەوەو بەس". (ئاوا)، ژنەکەی ئەو چەند ساتێك وەڵامی دەداتەوەو یادی (ئادی) کیژە چکۆلەکەیان و دەرسی پیانۆو سواری ئەوی وەبیر دێنێتەوەو ئازارو مەینەتی کۆنی ژیانی ئەو بە تێکەڵ و پێکەڵی و روونییەکی سەیرەوە لە نوێ دەژێتەوەو شانۆنامەکە بەم رستانە کۆتایی دێت: "هیچ، سەرانسەری رۆژ هیچ، (بێدەنگی) سەرانسەری رۆژو سەرانسەری شەو هیچ (بێدەنگی) هیچ دەنگێك نییە.".

ئەم تەنیاییەی مرۆڤ لە بەرهەمەکانی ئارتور ئادامۆف-شدا دیارە. لە (مانۆری گەورەو بچووك)دا لە زنجیرە تابلۆیەکدا کە لە شێوەی لەقتەی فیلمدا دراونەتە دەم یەکەوە، پیاوێك دەبینین کە یەك

لـه دوای یـەك ئەندامـەكانی خـۆی لـە دەسـت دەدات‌و قوربـانی كۆمەڵـە دەسـتوورو فرمانێكـە كـە دەنگێكی نەناسراو پێی دەدات.

شانۆنامەیەكی كورتی دیكەی ئادامۆف (پرۆفیسور تاران)ە ئەمە كۆپییەكی سادەی خەونێكەو هیچ رەگەزو توخمێكی بە مەبەستی كینایەو ئیستیعارە نەنووسراوە. (تاران) كێیە؟ ئەم مامۆستا بێـزراوە ئایـا پیـاوێكی شـەڕانییە یـان قوربانییـەكی بـێ تـاوان‌و بـێ گوناحـەو گـیرۆدەی داوی بەدحاڵی بوون بووە؟.

ئایا وەكو تاوانباری دەكەن، منداڵان بە رووتی لە پشت كابینەیەكی گەرماوەوە دیتویانە؟ ئایا هەموو بیروبۆچوونەكانی خۆی لە پرۆفیسۆر (منار)ەوە دزیوە؟ لە كۆتایی ئەم شانۆنامەیەشدا هیچ جۆرە پەیامێك بەدی ناكرێت. وەكو چۆن لە (كورسییەكان)ی یونسكۆدا چاوەڕوانی ئەوە دەكرێ وتاربێـژێك بێت‌و ناوبراو لە كۆتایی شانۆنامەكەدا دێت، بەڵام كەڕو لاڵەو جگە لە بێدەنگی چ پەیامێكی تری پێ نییە، یان لە شانۆنامەیەكی دیكەی یونسكۆدا بەناوی "مامۆستا" جاڕچـی هـەواڵی هـاتنی مامۆسـتا دەدات‌و ستایشـكاران بـەبێ قەراریی‌ەوە چـاوەڕوانی هاتنـە ژوورەوەی ئەون، بەڵام كاتێ (مامۆستا) وەژوور دەكەوێ دەبینن كە سەری نییە.

شانۆی نوێ، ئەوەمان لا ناهێڵێ كە چاوەڕوانی یاساو رێساو ئارامی لەو دنیایە بكەین كە تیایدا دەژین‌و تەماشاڤانانی خۆی بە واقیعی دژوارو زبری زەمان ئاشنا دەكات. بەڵام (مارتین ئەسلین) گوتەنی "شانۆی پووچ لە راستیدا هەوڵ‌و تێكۆشانێكە لە پێناوی قەبوڵكردنی وەزعی بەشەر وەكو چۆن هەیە بە هەموو عەجیبی‌و بێهودەییەكیەوە، مەشقكردنە بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو وەزعە بەشەرییە بەوپەڕی ویقارو ئابڕومەندی‌و بەرپرسیاریەتییەوە.

جا لەبەر ئەوەی هیچ چارەسەرێك بۆ موجیزاتی بوون نییە بۆیە مرۆڤ لە دوا ئەنجامدا بوونەوەرێكی تەنیایە لە جیهانێكی خاڵی لە مانا. راستە كە توڕدانی چارەسەران‌و خەیاڵاتی سوكنایی بەخش لەوەیە بە ئازارو سوێ بێ بەڵام هەستی ئازادی و تەنایی بەدوودا دێت. ئیدی بەم جۆرە لە دوا شیكردنەوەدا "شانۆی پووچ" ئەشكی نا ئومێدی لە چاوان نابارێنێ، بەڵكو بزەی ئازادی دەخاتە سەر لێوان.

# دوا پەیڤ

هونــەرو ئــەدەبیاتی ئــەمڕۆی جیهــان، بــە پێچــەوانەی راوبۆچــوونی هەنــدێ لــە روشــنبیرانو رەخنــەگرانو پاســدارانی شــێوازێن کــۆن بــە جــادەی داڕۆخــانو نەمانــدا نــاڕوات. ئەمــە دابو نەریتێکی کۆنی هاوچەرخانی هەر قۆناغێکی مێژووی ئەدەب بووە کە بەچاوی سووک بڕواننە هونەری ئەو زەمانەی کە تیایدا دەژین.

"ئەو خەڵکەی کە پێیان وایە لە رۆژگاری ئێمەدا شیعرو هونەر کەوتۆتە هەڵدێری داڕوخانەوە یەجگار زۆرن. کاتێ بەرهەمێن لیژەو پیکاسۆو شاگال و دکر نموونەێن نیگارکێشی هاوچەرخ دەبینن‌و یا شیعرێن ئاپۆلینرو ئیلیوت و پاوەند وەکو نموونەی شیعری هاوچەرخ دەخوێننەوە، هەر لە سیمای گرژو نیگای گلەیی بارياندا دیارە کە چەند خەفەت بۆ داڕوخانو هەرەسی زەوقی جیهانی نوێ دەخۆن.

"بــەلاّم ئەگــەر زەحمــەتی تۆژینــەوە بدەنــە بــەرخۆیان لەوەیــە رۆژێ بۆیــان دەربکــەوێ کــە ئــەم سەدەیەی ئێمە یەکێك لـە گـەورەترین‌و پڕ بەرهـەمترین بزاڤی هونـەری بـەخۆوە دیتـووەو بایـەخو ئیحتوباری ئەو بزاڤە ئەگەر لە راپەڕینی رینیسانس زیاتر نەبێ بێگومان کەمترنییە.

هونەرمەنـدی بێلایـەن نایـەت خـۆی لـە بازنەیـەکی تـەنگی جیهـانی هونـەردا گـیرۆدە بکـات. لـە رۆژگــاری ئێمــەدا هونــەر بەربلاّوییــەکی زۆری بــەخۆوە دیتــووە. لــە چــاو پرەنســیپی هونــەری ســەردەمانی کــۆنو بەرهــەمێن میللەتــە جۆراوجۆرەکانــدا، هونــەری ئەمڕۆکــە هەمــە جــۆرترو دەوڵەمەندتر بووە... ئەگەر خۆمان نەخەینە ناو بازنـەی تەسکی گریمانـانی تەنگـەوەو پڕاو پڕی هەتـەری چـاو بـڕوانین‌و دیقـەتی ئـەزموونانی بەشـەر بـدەین‌و مودەتێـك مومارەسـەو تەماشـای هونـەری نـوێ بکـەین‌و دەرگـای زەیـن بـۆ پێشـوازی پرەنسیپە تازەکـان بکەینـەوە، بێگومـان پـاش ماوەیـك خـوو بـەمجۆرە بەرهەمانـەوە دەگـرین‌و هەنـدێ جـاریش خۆمـانو ئـەزموونانی ژیـانی خۆمانی تێدا دەبینینەوە، بەلاّم ئەگەر وا خەیاڵ بکەین کە تـەنیا بـە (روونکردنـەوە)ی ئـەمو ئـەو و بـەبێ مومارەسـە دەتـوانین لـەزەت لەهونـەری نـوێ وەربگـرین ئەمـەیان خـەیاڵی خـاوەو، دەسـت لـە گونان شۆڕتر دەگەڕێینەوە.

***

لێ وەچەی ئەمڕۆی جیهان، کە هەست بەقورسی باری دوو جەنگی جیهان سووتێن بەسـەر شـانی خۆیەوە دەکات، چیتر باوەڕ بە قسەکانی ئینریکو توڤزی رەخنەگرو شاعیری ئیتاڵیایی ناکات کە لە ساڵی ١٩١٠دا دەیگوت:

"هەر وەچەیەکی بەشەری بەڕادەیەك لـە وەچەکانی پـێش خـۆی جیـاوازە کـە بتـوانێ بـە تـەرزێکی تازە دەست بە ژیان بکات. هەر شاعێرێك کـە دێتـە دنیـاوە خوایـە کـە بێدار دەبێتـەوەو نـەك تـەنیا ئەوزاری کـاری خـۆی، واتـە زمـان‌و دەرکـی شـاعیرانەو شێوازی نووسـین‌و گـوتنی شـیعر دادێنـێ،

بەڵکو بەشەکانی بەرهەمی ئایندەی خۆیشی لە رووحی خۆیەوە دەردێنێ، نە ماﻣۆستایەکی هەیەو نە پێشەوایەك، سەر بە هیچ نەژادو هیچ زمانو هیچ ولاتێك نییە. نابێ هیچ نەزمو رێسایەك ببێتە کۆسپی سەر رێگەی ئەو و نابێ هیچ تەعلیماتو دەستوورێك کۆمەکی پێ بکات".

گۆتە، شاعیری گەورەی ئەڵمانی سەدەو نیویێك لەوەپێش چەند جوان وەلامی پێشوەختەی ئەوی داوەتەوە:

یەکێك دەیگوت: (لە ناو پێشینانو هاوچەرخاندا، هونەری خۆم بە قەرزارباری کەس نازانم. من جگە لە هەزرو زەوقی خۆم هیچ ماﻣۆستایەکم نەبووە) جامەبەست لەم قسەیە ئەگەر سەرتیغ نەچووبم، ئەمەیە کە "هەر هەڵەیەکم کردبێ گوناحەکەی لە ئەستۆی خۆمە".

**کۆتایی**

<u>**سەرچاوە:**</u>

رضا سيد حسيني

**مکتب های ادبی**

**چاپ نهم ١٣٦٦.**

## حەمە کەریم عارف

- کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٧٣ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢٠٠، گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی، پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٣- بەیداخ، چیرۆك، ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك، چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، ڕۆمان، سابت ڕەحمان، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٢
٨- نامۆ، ڕۆمان، ئەلبیر کامۆ، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٣ دەزگای ئاراس
٩- ڕێبەر، ڕۆمان، مەهدی حسین، یەك چاپ (شاخ)
١٠- شکست، ڕۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (ڕاە کارگر)

**١١ – هاومالّەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٠ گولاّن**

**١٢– بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، ٣ چاپ شاخ، شار ٢٠٠٣**

**١٣– قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق**

**١٤– دووره ولاّت، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گولاّن**

**١٥– ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران**

**١٦– چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر**

**١٧– ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥**

**١٨– دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەف دەهقانی، چاپی شاخ**

**١٩– مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عزیز شەریف**

**٢٠– مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ**

**٢١– خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە، چاپی شاخ**

**٢٢– کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی شێیەم ٢٠٠٤ دەزگای ئاراس**

**٢٣– لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان**

**٢٤– گوزارشتی مۆسیقا، د. فۆاد زەکەریا.**

**٢٥– دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.**

**٢٦– ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر**

**٢٧– بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)**

**٢٨– جولەکەکەی مالّتا، شانۆنامە، مالرۆ.**

**٢٩– دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.**

**٣٠–بەد حالّی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.**

**٣١– چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولاّم حسەینی ساعیدی)**

**٣٢– ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.**

**٣٣– گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلاّئەلبوسێری.**

**٣٤– کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، چاپی یەکەم ١٩٩٨ وەزارەتی رۆشنبیری.**

**٣٥– هونەر و ژیانی کۆمەلاّیەتی، پلیخانۆڤ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ دەزگای موکریانی**

**٣٦– پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، ئیڤلین ریید.**

**٣٧– لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ، لویس ریی.**

**٣٨– مندالّە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالاّن.**

**٣٩– فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ مندالاّن، یەلماز گونای**

**٤٠– شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ مندالاّن**

**٤١– زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالاّن)**

**٤٢– لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.**

**٤٣– کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (٢٣ ئەفسانە)**

**٤٤– زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف، چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای موکریانی**

**٤٥– ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر**

٤٦- جیٚ پیٚ، کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت، جەلال ئال ئەحمەد، بوزرگی عەلەوی، سادقی چوبەك، مەنسوری یاقوتی)
٤٧- چیرۆکستان، کۆمەڵێك دەق و رەخنە، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ نووسەرانی کەرکووك
٤٨- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی، چاپی یەکەم (٢٠٠٠) حەمە کەریم عارف
٤٩- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف
٥٠- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) وەزارەتی رۆشنبیری
٥١- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە
٥٢- چزیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٣- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٦- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٧- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٨- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٥٩- خافرو غ لە شیعر دەدویٚ، ژیان و بەرهەمی
٦٠- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٦١- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) دەزگای سپیرێز
٦٢- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٣- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف
٦٤- دیدار و دەق و رەخنە.
٦٥- دیداری چیرۆکڤانی.
٦٦- قوتابخانە ئەدەبییەکان، رەزا سەید حسەینی.
٦٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف
٦٨- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی، حەمە کەریم عارف.
٦٩- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا، کریس کۆچرا، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١
٧٥- دەربارەی رۆمان و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()

**٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤**

**٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف**

**٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی**

**٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی**

**٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی**

**٨٤-وقفات فی رحاب الپقافە الکوردیە، حەمە کەریم عارف**

**٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی**

**٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز**

**٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس**

**٨٨-ڤل الصوت و قصص اخری، تقدیم و ترجمە جلال زنگابادی**

**٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین**

**٩٠-توحفەنمای ئەدەبیاتی جیهانی**

**٩١-سفرەی فەقیران حەمە کەریم عارف**

**٩٢-باڵندەکەی من رۆمان، فریبا وفی**

**٩٣- نامەکانی تولستۆی**

**٩٤- جەمیلە، رۆمان جەنگیز ئایتماتۆف**

**٩٥- حەفتا چیرۆکی چینی بۆ منالآنی کورد**

*** لە راپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بلاّو دەکاتەوە..**

***ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بلاّو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...**

عارف
حمە کەریم